## ناسنامەی کتێب

ناوی پـــــەرتوک :لە ئادەبەکانی ئیسلام

بـــابـــەت : ئایینی

نـــوسیـــنی : صابر صالح گەردی

کـــۆمپیوتـــەر: هیوا

چـــاپـــی : دووەم

شوێنی بلاوکردنەوە: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی( ٢٤٩ )ی ساڵی(١٩٩٨)ی پێدراوە.

بلاوکراوەی کتێبخانەی

حاجی قادری کۆیی

...سو فروشتن و چاپکردن و بلاوکردنەوە

...هەولێر کوردستان عراق

٠٦٦ ٢٢ ٢٣ ٨٦٨ ☎ ٠٧٥٠ ٤٦٧ ١٣ ٩٤ ٠٧٥٠ ١١٨ ١٩ ١٩

# بەناوی خودای هەمیشە زیندوو

حەمدو سەنا بۆ زاتی خودا، هەر خۆیتی ژیان دێنێت و دەبا. داوای لێ دەکەین درودو ڕەحمەت ببارێنی بەسەر گیانی پێشەوای میللەت هەروەها بەسەر گشت باوەڕدارانی دڵسۆزو بەوەفا کەهیچ ڕەشەباو ئافاتێ ئیمانەکەیان لەکەدار ناکاو ماندو نەناسانەو لێبڕاوانە لە خزمەتی ئایینی خودان بۆ بەرەو پێشەوەبردنی عیبادو بیلاد..

خوێنەری بەڕێز ئەمڕۆی عەولەمە دیارە عەسرو زەمانی سورعەو گۆڕان و پێش کەوتنە، بیرخستنەوەو یاد خستنەوەی ووتار و نووسینی باش و قسەی خێر زۆر پێویستە، ئەوە پاش نزیکەی دەساڵ بەسەر چاپی یەکەمی ئەم کتێبە بڕیارمان دا بۆ بەچاپ گەیاندن بۆجاری دووەم، کە زۆر خاڵی ئیجابی تیا دەبینین.

دووبارە بەم دەساڵەی ڕابردوو زۆرێك لەجیلی نوێ هاتونەتە کایەوە ئەم نوسراوەیان نەدیوە یابەردەستیان نەکەوتووە.

- بە پێی سورعەی عەولەمەو گۆڕانکاریەکان و بیرفراوان بوون کرانەوەی هەرچی زیاتری دونیاو لەیەك نزیك بوونەوە، وا دەخوازێ جارێکی تریش لەچاپی بدەینەوە، دیارە تاکە کتێبیکیش لەم نوسراوە لەبازار نەماوە.
- پیا چوونەوەی هەرچی زیاتری نوسراوەکەمان و ڕاست کردنەوەی هەندێ لەهەڵەکانی چاپ و زیادو کەم کردنی هەندێ لەبابەتەکە پێویستی ڕۆژو خوێنەران و نوسراوەکە بوو.
- هەژاری و فەقیریشمان لەبەر دەرگای ڕەحمەتی خودا لەسەرووی هەمووان بوو.
- داوام لەخوایە لێمان قەبوول بفەرموێ و پاداشتیشمان بداتەوە بیکابە مایەی لێبورن و ڕەحمەتی خۆی بۆ ئێمە و خوێنەران، هەموو داواشمان لەخوێنەرانە دوعای خێرمان بۆ بکەن و لێ مان ببورن لەبەرامبەر ئەو هەڵەو کەم و کورتیانەی دەکەوێتە بەرچاویان ئەگەر ئاگادارمان بکەنەوە خێریان دەگاتێ، بەسوپاسو دوعای خێر لێیان وەردەگرین.

والحمد لله رب العالمين

٥/ذي القعدة ١٤٢٧

٢٠٠٧/١١/١٨

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدالله كما ينبغي لجلاله وجه وعظيم سلطانه والصلاة والسلام على رسول الله وعلى اله وصحبه ومن والاه.

خوێنەرانی بەڕێز برایانی خاوەن باوەڕ ئومێدی گەلانی چەوساوە چەکی خوڕەوشت و داب ونەریت بخەنەکار بۆ ڕزگاری لەدەریای جەهل و نەفامی ، لەوێلی و گومڕایی لە پەرتەوازی و سەرلێشێوایی بۆ دونیای ڕون و پێش کەوتن بۆ دونیای خۆشەویستی و برایەتی بۆ دونیای ڕەحم و ویژدان بۆ دونیای هەرەوەزو هاوکاری بۆ دونیای دۆست و دۆستایەتی خودا بۆ بازاری ئەدەب و ئەخلاق و راستگۆیی و وەفاداری، دڵ پاکی و بەئاگایی ، ئەمینی دڵنیایی، ڕزگاری و سەرفرازی ...شادی بەختیاری...شارستانی و ئاوەدانی...بەختیاری و کامەرانی...هتد. لەسایەی ڕەحمی خوداوە بەهەوڵی دڵسۆزانی ڕێگەی خودا لەهەموو لاوە گەنجان و هۆشیاران ڕوویان کردۆتە ماڵەکانی خودا چاویان هەڵێناوە حاڵی بوینە و تێ گەیشتوینە کەئەم ڕێگایە هەموو ئاواتی ئادەمیزاتی تێدایە بێ لەکەیەو بێ وێنەیە وەکو کەخاوەنەکەی بێ وێنەیە و بێ لەکەیە جا ئێمەش هەستمان کرد بەکەم و کوڕیێ لەم تازە لاوانە کەڕوەو مزگەوت هاتوون و عەرەب زمان نین و زیاتر پێویستیان بەچەند نوسراوەیەکی کوردی هەیە تاکو لێی باشترو چاکتر شەرەزای ئایین و بەرنامەکەیان بن، وەکەمو کوڕیەکانیان باشتر پڕ ببێتەوە، جادەستمان کرد بەنوسینی ئەم نوسراوەیە بۆ ئەوەی بێ بەمایی سود وەرگرتن لێیەوە، وەگەنجەکانی مزگەوتەکان بیخوێنن لێیەوە بەهرەمەند بن و شارەزاییان زیاتر بێت بەئایینەکەیان.

داواش لەخودای گەورە دەکەین کەکارو ووتارمان هەر بۆ ڕەزامەندی ئەو بێت و بەس.

نووسەر

ربيع الثاني ١٤١٤

# ئادابی مزگەوت

مزگەوت ئادابێكی تایبەتی خۆی پێویستە دەبێ ئادەمیزادی خاوەن باوەڕ لێی تێبگات و فێری ببێ و پەیڕەوی ڕاست و دروستی بكات.

## ١-ڕووكردنە مزگەوت:

خوای گەورە دەربارەی ڕووەو مزگەوت چوون دەفەرمووێ ﴿قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِٱلْقِسْطِ ۖ وَأَقِيمُوا۟ وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ۚ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴿٢٩﴾﴾ (الاعراف ٢٩) ڕووی خۆتان بكەنە مزگەوتەكان بەبەردەوامی و ڕوولەخوای گەورە بكەن بەدڵ پاكی و دڵسۆزی لەبەر خودا بپاڕێنەوە چونكە هەر خودایە چارەی هەموو كەم و كوڕیەكانی ئێوەی لەلایە، وە ئێوە بێ نیاز نین لەغەیری خۆتان...وەبزانن ئایین و بەرنامە هەرهی خودای گەورەیە وەبزانن ئێوە چۆن خەڵق بوونەو بەدیهاتون ئاواش دەگەڕێنەوە.. ڕووكردنە مزگەوت مایەی بەختەوەری و ئاسودەییە ڕووەو قاپی ڕەحمەتی خودایە، بەمەرجێ دلێكی پاك و بێ گەردی هەبێ وەبەكارو كردەوەی نالەبار و بێ جێ كارچاكیەكانی خۆی پوچەڵ و بەتاڵ نەكاتەوە...

وەسوننەت وایە ئادەمیزادی موسوڵمان بچێتە نزیكترین مزگەوت لەماڵیەوە بەتایبەتی ئەگەر مزگەوتەكە پیاوێ خواناسی لەخواترس دروستی كردبێ، وەئیمامێكی باشی ئەهلی تەقوای لێ بێ، وەئەگەر هاتوو مزگەوتێكی دوورتر باشتر بێ لەڕووی مەعنەویەوە بەوەی ئیماندارێكی باش دروستی

كردبیّ، وەپیاویّكی زانای خواناسی ئیمام بیّ، وەپیاوانی چاك نویّژی جەماعەتی تیا بكەن، وەژمارەیان زیاتربیّ، ئەوە باشتر وایە بچیّتە ئەو مزگەوت، بەلّگەشمان بۆ ئەمە ئەوئایەتە پیرۆزەیە كەخوای گەورە بەپیّغەمبەرەكەی دەفەرمویّ (مزگەوتیّ دروست كرابیّ لەسەر خواپەرستی و ئیمان لەیەكەم رۆژا موستەحەق ترە بەنویّژ تیاكردنی و لیّ راوەستانی كەپیاوانی وای تیان حەزئەكەن بۆ خۆ پاك كردنەوە خوای گەورە ئادەمیزادی موسلّمانی پاك و خاویّنی خۆش ئەویّ)(التوبه ١٠٨)دیارە ئەومزگەوتانەی كەلەسەر خواپەرستی و خواترسان دروست كراون بەرەكەتی ئیمانیان و عیبادەت كردن تیادا زۆرترو بەپیّزترە لەمزگەوتانیّ كەبۆ مەبەستی ریابازی و شتی تر دروست كراون ...هاتوچۆكردنی مزگەوت واجبە نەك هاركاتیّ نویّژی جومعە بەلّكە لەكاتەكانی تریش بەتایبەتی ئەگەر دابران لەموسلّمانان ببیّتە دوركەوتنەوە لەبەرنامەی خودا و، تیّكەلّبوونەوە لەگەلّ فاسیقان و كەوتنەوە دونیای غەفلەت ﴿وەهیچ عوزریش نەبیّ كەترس و نەخۆشیە﴾...چونكە لەئایینا هەركاریّ واجبی پیّ راوەستابیّ كارەكەش واجب دەبیّ (**مالایتم الواجب الا به فهو واجب**)بیّ گومان ئیمان راگرتن و پاراستن و پەرەپیّدانی ئەرك و واجبە، وەكۆمەلّیّ زانایان یەك قسەن لەهەموو كات و شویّنیّكا كەقەصدەكانی شەریعەتی ئیسلام پاراستنی پیّنج شتە :پاراستنی دین و ئیمان، پاراستنی عەقل و ژیری،پاراستنی پشت و وەچە، وەپاراستنی گیان و نەفس ،وەپاراستنی مالّ.

## ٢- چۆنیەتی ڕوكردنە مزگەوت.

خـوای گـەورە دەفـەرمووێ ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴾الاعراف

**واتـە: الرۆلانی ئـادەمی خـاوەن بـاوەڕان ڕێـك و پێكـی و جـوانی خۆتـان بپـارێزن لەڕووكردنـە مزگەوتـەكان خۆتـان پۆشـتە بكـەن و بـەهیچ شـێوەیێ عەورەتتان اكەبەینی ناوك و ئەژنۆیە بۆ پیاو بەلآم بۆژن گشت لەشیەتی تەنها دەست و دەم و چاو نەبێ »**

دیار نەبێ بەڵكو بەپێی ڕۆژوعورف عـادەت شـێوازێكی وانیـشان بـدەن كەمایەی ژیری و زانیاری و هۆشیاری و ڕێكوپێكی و جوانی بێ...

وەپیسی و پۆخڵی قێزە ونـی لـەخۆتان دووربگـرن، ئـادەمیزادی خـاوەن باوەڕ تاخۆی ڕێك و پێك و پوختەتر بكات خێری زۆرتر پێ ئەگات ،بەمـەرجێ مەبەستی ڕەزامەندی خوای گەورە بێ و بەس، جاپێویستە جوانترین و باشترین جل و بەرگی لەبەر بكات وەخۆی بۆن خـۆش بكـات وەخـۆی بپـارێزێ لـەكارو كردەوەیێك كەمایەی ڕق و كینـی خـەڵك و مەردوومـە وەخـەڵكان حـەزی لێ ناكەن وەكارێكی وانەكات خەڵك بەخراپە نـاوی بێـنن و ببـێ بـەهۆی ناشـرین كردنی شێوازی ڕوەو مزگەوت ،وەنابێت بەپەلەو خـۆش ڕەوی و ڕاكـردن بـەرەو مزگەوت بچین بەڵكو دەبێ میانڕەو بین جـا لـەكوێ بەجەماعـەت ڕاگەیـشتین لەوێوە نوێژەكە تەواو بكەین چونكە خۆش ڕەوی و بەپەلە ڕۆیشتن ئادەمیزادی ماندوو ئەكاو ئەشلەژێنێ و سەرەنجام زۆر بەپەلە نوێژەكەی دەخوێنێ وەناتوانێ بەڕێك و پێكی لەجێگەی خۆیا نوێژەكەی بكات، وەبێجگە لەوەش خوای گەورە

داوامان لێ دەكات لەڕۆيشتنماندا ميانڕەو بين وەكو دەفەرموێ(واقصد فى مشيك)كەخواى گەورە بۆمان دەگێڕێتەوە لەئامۆژگارى لوقمانى حەكيم بۆ كوڕەكەى كەپێى فەرموو (لەڕۆيشتندا ميانڕەو بە)ديارە ئەمەش حيكمەتى زۆرى تێدايە، هەروەها نابێ خواردنێكى ئاوا بخۆين كەبۆنى ناخۆشى لێ بێ و ببێ بەمايەى نارەحەتى مووسلمانان وەك پياز و سيرو توور و ...شتى تر ... وەهەر شتێكى كە خەلك ئازار ئەداو پێ ى سەخلەت دەبێ ﴿١﴾پێغەمبەر ﷺدەفەرمووێ :-(هەر يەكێ لەئيوە چووە مزگەوت دوورەكەعات نوێژ بكات پێش ئەوەى دابنيشێ) متفق عليه.

## ٣- خێرو پاداشتى چوونە مزگەوت

خێرو پاداشتى چوونە مزگەوت يەكجار زۆرە، وەك قەدەغە كردن و ياساغ كردنى گوناح وتاوانێكى يەكجار گەورەيە، خواى گەورە ئەفەرمووێ ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا..... ﴿١١٤﴾﴾ البقره

واتە: كێ لەو كەسە سەتەمكارو زاڵم ترە كە ڕێگەى مزگەوتى خودا ئەگرێ لەوەى كە يادى خواى تيا بكرێتەوە، وەكۆشش دەكا بۆ وێرانەكردنى. لەبارەى خێرى چوونە مزگەوت چەند فەرموودەيێ باس دەكەين تاكو زياتر لە گەورەيى و خێرى زۆرى شارەزا ببين :

أ-لەئەبوو هوريرەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتى ئەوەى خۆى پاك بكاتەوە و دەست نوێژ بگرێ لەماڵەوە ،پاشان ڕووەو ماڵێ لەماڵەكانى خودا بڕوات بۆ ئەوەى نوێژێ لە نوێژە فەرزەكان بەجێ بهێنێ، جا شەقاوو هەنگاوەكانى يەكێ ئەبێتە ڕەش كردنەوە و ئەهێشنى گوناهێكى ئەوى تريان

پلەیی لەلای خوای گەورە بەرزی دەكاتەوە) رواە مسلم.

ب- پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (گەورەترین پاداشت لەنوێژدا بۆئەو كەسەیە كەڕوەو مزگەوت هەنگاوی زۆر داوێ دیارە ماڵی لەهەموویان دورترە وە ئەوەی چاوەڕێی نوێژی جەماعەت دەكات تاكو لەگەڵ ئیمام بەجێ بگەیەنێ گەورەترین پاداشتی لەبۆ هەیە لەوەی نوێژەكەی دەكاو پاشان یەكسەر دەنوێ ) متفق علیە.

ت-لەبورەیدە رەزای خوای لێ بێ كە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (مزگێنی و موژدە بدەنە ئەوكەسانەی كەزۆر هات و چۆی مزگەوت دەكەن لەتاریكاییدا بەنورو ڕوناكیەكی تەواو لەڕۆژی دواییدا ) رواە ابوداود.

پ-لەئەبوو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی ئایا پێتان نیشان بدەم لەوەی كەخوای گەورە گوناهی پێ ڕەش

بكاتەوە و پلەو پایانی پێ بەرز دەكاتەوە؟ فەرموویان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی دەست نوێژی چاك و تەواو و هەنگاوی زۆر بەرەو مزگەوتەكان و چاوەڕوانی نوێژ لەدوای نوێژو ئەمە بۆئێوە ریباتە.ئەمە بۆ ئێوە ریباتە...رواە مسلم.

ج-لەئەبی سەعیدی خودری ڕەزای خوای لێ بێ پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دیتتان پیاوێ هاموشۆی مزگەوتانی دەكرد شایەدی بۆیدەن كەوا خاوەن ئیمانە وە خوای گەورە فەرموویەتی (بەڕاستی ئەوەی مزگەوت دروست دەكاو ئاوەدانیان دەكاتەوە ئیمانیان بەخودای گەورەو ڕۆژی دوایی هەیە ....هتد) رواە الترمذی.

ح- پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: فریشتەكان دوعای خێر بۆ ئەو كەسە

ده‌كه‌ن له‌ئێوه مادام له‌مزگه‌وتا بێ كه‌نوێژی تیا ده‌كا ده‌ڵێ خودایه ره‌حمه‌تی به‌سه‌ر دا ببارێنی ،خودایه لێی خۆش بی،هه‌تا بێ ده‌ست نوێژی به‌سه‌را دادێ یاده‌چێته ده‌ره‌وه ....متفق علیه.

خ-له‌عبدالله‌ی كوڕی ئیمامی عومه‌ره‌وه ره‌زای خوای لێ بێ پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رموویه‌تی (نوێژی جه‌ماعه‌ت باشتره له‌نوێژی به‌ته‌نها به‌بیست و حه‌وت ده‌ره‌جه‌و پله‌)متفق علیه. وه‌له‌فه‌رمووده‌ی تردا هاتووه پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌فه‌رمووێ: (خوای گه‌وره له‌ڕۆژی دواییدا ده‌فه‌رموێ كوانێ جیرانه‌كانی من ؟كوانێ جیرانه‌كانی من ؟كوانێ ئه‌وانه‌ی زۆر قورئانیان خوێندوه‌و ؟كوانێ ئه‌وانه‌ی مزگه‌وتیان دروست كردوه‌و ئاوه‌دانیان كردوته‌وه (این جیرانی این جیرانی این قراء القران این عمار المساجد..) ئه‌مه‌ش مه‌به‌ست له‌پله‌و پایه به‌رزیانه ده‌نا هیچ شتێ له‌خوای گه‌وره ون نابێ ..

## ٤- مزگه‌وت دروست كردن و ئاوه‌دان كردنه‌وه :

خوای گه‌وره بۆ خاوه‌ن باوه‌ڕان دیاری كردووه كه‌كوێ شایسته‌ی مزگه‌وت دروست كردن و ئاوه‌دان كردنه‌وه‌یه و كوێش شایسته‌ی ئه‌م به‌هره‌یه‌و نیعمه‌ته نیه ، تاكو موسڵمانان وریا بن و شوێنی پیرۆزی خۆیان بناسن و به‌ر پیلانی دوژمنانیان نه‌كه‌ون...وه‌ك ده‌فه‌رموێ ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ فَعَسَىٰٓ أُو۟لَٰٓئِكَ أَن يَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٨﴾﴾ التوبه

واته: به‌ڕاستی هه‌رئه‌وانه‌ن كه‌خانوانی ماڵی خوا دروست ده‌كه‌ن خاوه‌ن ئیمانن به‌خودای گه‌وره‌و ڕۆژی دوایی و نوێژی ته‌واوی خۆیان ده‌كه‌ن و زه‌كاتی

ماڵی خۆیان ئەدەن وەلەكەسێ ناترسن لەخوای گەورە نەبێ جا ئومێد وایە ئەم موسڵمانانە لەسەر ڕێگەی ڕێنموونەیی و هیدایەتی خودای گەورە بن .

جا بیناكردنی مزگەوت یابەشێكی مزگەوت یا پڕ كردنەوەی كەم و كورتیەكانی وە پاك و خاوێن كردنی و جوان كردنی ڕایەخ لێ ڕاهێخستنی و ڕووناك كردنەوەی ئاو بۆ دانانی ئەمە لەلایەك لەلایەكی ترەوە دوورگرتنی لەو كارو ووتانەی كەشایستەی مزگەوت نین وەك پینە دۆزی و تەنەكەسازی و ....وەهەر كارێكی تر كەببیتە هۆی پێ شل كردنی یا وێڵ كردنی قەصدو مەبەست لەدروست بوونی مزگەوت، یاتیا كۆبوونەوەی بۆ قسەو قسەرۆكی و دونیا و لەغوەو غەیبەت و دامە و دۆمینەو هەرشتێكی تر كەبكەوێتە دەرەوەی سنوری تەقوا وەسەر بكێشێ بۆ غەفلەت و كاری بێ شرعی و نابەجێ ، ئەم جۆرە چاودێریەو خزمەت كردنەی مزگەوت هەمووی نیشانەی ئیماندارێتیە بۆ كارسازانی چاكەكاری هاوكار لەكۆمەكی مزگەوت دروست كردن و ڕێكخستندا، هەروەها یارمەتی دانی مزگەوت لەسەر ڕاكێشانی خەڵك بۆ ڕوو تێ كردنی و ئاوەدانكردنەوەو دەرس و وانە لێ خوێندنی و نوێژو عیبادەت لێ كردنی پیرۆزو بەڕێزگرتنی ئەمانەو هەر كارو وتارێكی تر كەسەر بكێشێ بۆ خزمەتی كۆمەڵی موسڵمانان و مەبەست ڕەزامەندی خوای گەورەبێ ،جا ئەوەی بەم كارانە هەلبستێ ئەوە نیشانەی ئیمانیەتی بەخودای گەورەو ڕۆژی پاداشت هەروەها نەترسانیەتی لە لۆمەی جاهیلان و كۆلەواران و خوا نەناسان ،وە ناترسێن لەوەی لەم ڕێگایە تووشی مەینەت و میحنەو ئازار و ناخۆشی بن، وە سارد نابنەوە لەخزمەت كردنی ژیان وژینگە ...بەڵێ ئەمانە ئومێدیان لێ دەكرێ خاوەن باوەر بن و بەر لوتف و كەرەمی خودا بكەون و

چونكه بەراستی شایستەی رەحمی خودان پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ ئەوەی بۆ خودا مزگەوتێ دروست بكات یا هاوكاری بكات ئەگەر بەقەد هێلانە قەتێیەك بێ خوای گەورە كۆشكێكی لەبەهەشت بۆ دروست دەكا ،اخراجه ماجه حدیث انس وقال صحیح الاسناد ..هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا مَسَاجِدَ اللَّهِ شَاهِدِينَ عَلَىٰ أَنفُسِهِم بِالْكُفْرِ ۚ أُولَٰئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ وَفِي النَّارِ هُمْ خَالِدُونَ ﴿١٧﴾﴾ التوبه

واتە: بۆ خوانەناسان نی یە كە شەریك و هاوبەشیان بۆ خودا بریار داوە جا هەلسن بەدروست كردنی مزگەوتان وەشایەدی بەكوفرو بێ باوەری بەكردار یا ووتار یابەدل ئەمانە كارو كردەوەیان پوچەل و بەتال بۆتەوە هیچ خێریكیان بۆ نی یەو وە سەرەنجامیان ناو ئاگری جەهەندەمەو هەتا هەتایێ تیا ئەمێنێتەوە .

پێغەمبەر ﷺ : بریاری وێران كردن و سوتاندنی ئەو مزگەوتەی دا كە مونافیقەكان دروستیان كردبوو بۆ دژایەتی كردن لەگەل موسلمانان كەبەمزگەوتی (ضرار) زیرار لەقورئان ناوبراوە واتە مزگەوتی (زەرەرو زیان باری) وەك خوای گەورە لە سورەتی تەوبەدا دەفەرموێ ئەوانەی مزگەوتی زیراریان كردەوەو گرتویانە بەكوفرو جیاوازی كردن لەنێوان ئیمانداران وەكردویان بەسەنگەر بۆ ئەوانەی دژایەتی خواو پێغەمبەر ﷺ ی خودایان كردوە ،وە سوێند بەدرۆ دەخۆن و دەلێن تەنها خواستی چاكەكاریمان بووە و هیچی تر ،وەخودای گەورە شایەدی ئەدات كەئەوانە دوورِوو و درۆزنن جا هەرگیز لەو مزگەوتە رامەوەستە..هتد سورەتی التوبة ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا

مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًۢا بَيْنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبْلُ ۚ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّا ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ التوبه

## ٥- ده‌بێ چۆن بین له‌مزگه‌وتا ؟

ده‌بێ له‌ناو مزگه‌وتا زیاتر به‌ویقارو ئه‌ده‌ب خوره‌وشت جوان بین نابێ له‌غوه‌و قسه‌ی زیاده‌ی تیا بکه‌ین هه‌روه‌ها نابێ ده‌نگی تیا به‌رز بكه‌ینه‌وه كه ده‌بێته تێكدانی نوێژی خه‌لك و باری هێمنی ،وه‌نابێ سوحبه‌ت و شۆخی بكه‌ین به‌ده‌ست وه‌یا به‌زمان یا به‌هه‌ر جۆرێ بێ.

وه ده‌بێ مزگه‌وت بپارێزین له‌شێت و منداڵ و سه‌رخۆش ئه‌گه‌ر مه‌ترسی كاری ناهه‌موار و نابه‌جێ یان لێ بكرێ و چاودێری پاك و خاوێنی نه‌كه‌ن .. هه‌روه‌ها نابێ مۆڵه‌تی بێ باوه‌ڕان و كافران بده‌ین كه بێن بۆ مزگه‌وت ،یه‌كێ نه‌بێ كه‌ئومێدی ئه‌وه‌ی تیا بێ موسلمان ببێت ده‌بێ له‌ناو مزگه‌وتا زیاتر ڕێزی خۆمان و برایانمان و مامۆستایانمان بگرین وه‌ئه‌گه‌ر هات و كۆڵه‌وارێ یا حالی نه‌بووێ یا نه‌و موسلمانێ ده‌نگی به‌رز كرده‌وه یا میزی له‌ناو مزگه‌وت كرد یا كارو كرده‌وه‌یه‌كی نابه‌جێ ی كرد نابێ له‌ڕوویا بزه‌قینه‌وه خه‌لكی لێ به‌ناگا به‌كه‌ین و سه‌ركۆنه‌ی بكه‌ین و یارووشكێنی بكه‌ین به‌لكو ده‌بێ به‌ڕوویه‌كی خۆشه‌وه حالی بكه‌ین ،وه‌نه‌كه‌ین كه‌هه‌ست به‌كه‌م و كوری بكات به‌شێوه‌یه‌كی وا كه‌هه‌ل بگه‌ڕێته‌وه له‌مزگه‌وت .

هه‌روه‌ها نابێ به‌لغه‌م و چرم و تف له‌مزگه‌وتدا ڕووبكه‌ین ئه‌گه‌ر كارێكی

وا لێمان ڕوویدا پێویستە بەزووترین کات لای بەرین و خاوێنی بکەینەوە .. هەروەها نابێ کاغەزو پیسی و پۆخلی بخەینە مزگەوت یا تەنیشت مزگەوت بەشێوەیەکی واکە شێوازی مزگەوت تێك بدات وە موسلمانان نارەحەت بکات.

وەتا بۆمان بکرێ بەخۆمان و گوێ ڕایەلانمان پاك و خاوێنی مزگەوت بپارێزین هەروەها کەل و پەلی ناو مزگەوت وەك دارودیوارو ڕایەخ و کومبارو شێرەو حەنەفی ئاو وپلاك و سویچی کرەباو باخچەو حەدیقەی مزگەوت (ئەگەر هەیبێ) چاودێریان بکەین و بۆ ئەوەی هەر ڕێك و پێك و دلگیر بێ و زوو خراب نەبێ و لەبەین نەچێ .

هەروەها دەبێ بەڕووی گەش و خۆشەوە ڕووەو موسلمانان بینەوە دۆقەیان لەگەلا بکەین پاش سەلاولێ کردنیان و ئەحوالیان بپرسین وە ئەگەر یەکێ دیارنەبوو بچین بەشوێنیا، وە ئەگەر گیرو گرفتێکی هەبوو هەول دەین بۆی چارەسەر بکەین، وە شەریك و هاوبەشی خۆشی و ناخۆشیان بین .

هەروەها لەکاتی بەحێ هێشتنی مزگەوت بەپێ ی چەپ بێینە دەرەوە و بلێین (بسم الله والسلام علی رسول الله اللهم افتح لنا ابواب فضلك) وە نابێ بکەینە غەلبە غەلب و هەرا بەلکو دەبێ بەهێمنی و بێ دەنگی دوو دوو یەك یەك دەربچین ،وە هەرچیمان لەمزگەوت سوودمان لێ وەرگرت بەڕوویەکی خۆش و زمانی شیرینەوە بۆ خۆشەویستان بگێڕینەوە .

هەروەها دەبێ ئەو ڕاستیەمان لەبیر نەچێتەوە کەلەمزگەوتاو لەناو نوێژدا وادەو بەلێنێکی زۆرمان داوە بە خوای گەورە کە پیاوی چاك و پاك بین و، ڕاست و ڕەو و بەندەی خوا بین وە دوژمنی شەیتان و دۆستانیان بین ،جا لەدەرەوەش ئەم وادەو بەلێنانە بپارێزین چونکە خوای گەورە چاوی لێمانەو وەتا

کو جارێکی تر چاوو ڕوومان بێتن روەو مالی خـودای گـەورە بـچینەوەو داوای پێداویستیەکانی خۆمانی لیّ بکەین ،خۆ کەس نی یە بەختەوەری هەمیـشەیی و پێداویستیەکانی ئێمەی پیّ جیّ بەجیّ بیّ تەنها خوای گەورە خۆی نەبیّ .

هەروەها هەولی کار چاکی و خوێندن و برایـەتی و خۆشەویـستی بـدەین لەناو موسلمانان، کەڕەگ و داکوتیّ و بلاوببێتـەوە ، ئەگـەر هـاتوو دوو بـرای موسلمان دلیان لەیـەکتر گـەردی گـرت ،پـشتیان تێـك کـرد دەبـیّ ئاشـتیان کەینەوە.

هەروەها ئەگـەر یـەکیّ بانگـەوازێکی کـرد لەمزگـەوتا وەك بلـیّ کـیّ ئـەوەی بزرکردوە یا کویّ ئەوەی دیتیەوە یا .. یا هتد دەبیّ قەدەغەی بکەین و حـالی بکەین کە مزگەوت بۆ ئەوە دروست نەکراوە بەلکو بۆ ئەوە دروست کردوە کـە بۆی دروست کراوە ،ئیدی خانەو ومالی جار چیان نی یە[1] ، وەك بۆ شتی تریش ناشیّ لەگەل سنووری تەقوا یەك ناگرنەوە.

## ٦-خێرو پاداشتی مانەوە لەمزگەوت (الاعتكاف)

مانـەوە لەمزگـەوت دا بەمەبەسـت و نیـازی عیبـادەتی خـوای گـەورە سوننەتە وەپیّ ی دەووتریّ (الاعتکاف)وە خێرو پاداشتی گەلیّ زۆری هەیە، وە سوننەتە کاتیّ کە دەچیتە مزگەوت بەپیّ ی ڕاسـت بـچینە ژوورەوە و بلـیّ ی (بسم الله والسلام علی رسول الله اللّهم افتح لنا ابواب رحمتك) وەپاشان بلـیّ (نویت سنة الاعتکـاف) واتـە نیـەت بێنـی بەمەبەسـتی کـەوا لەمزگـەوت

[1] ئەوانەی شت وون دەکەن یا دەبیننەوە بابیبەن بۆ ئەو بنکە ناوخۆییانەی کە بەرنامەی تایبەتیان هەیە بۆ ئەم کارە

دەمێنێتەوە بۆ عیبادەت، وە هەركاتێ هاتیە دەرەوە سونەتەكەی كۆتای دێ، جا ئەگەر جارێكی تر چوویتەوە مزگەوتەوە سونەتە نیەتەكەی دووبارە بكەیتەوە وەنابێ جەنابت (بێ دەست نوێژی گەورە) بخاتە سەر خۆی وە ئەگەر كەوتە سەری دەبێ زوو خۆی بشوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ ڕۆژێ دادێ لەئاخیری زەمان كەسانێ لەئومەتی من ئەچنە مزگەوت تێیدا دائەنیشن و حەلقە دەبەستن باسی خۆشی دونیا و خۆشەویستی دونیا دەكەن جا لەگەڵیان دامەنیشن وەخوای گەورە هیچ پێویستیەكی بەوان نیە ...اخرجة ابن حبان من حديث ابن مسعود وقال صحيح الاسناد...هەروەها خێری مانەوە لەمزگەوت و هاموشۆی مزگەوت دەبێتە مایەی ئەوەی كەدڵی ببەسترێتەوە بە مزگەوت وە ئەوەی دڵی بەسترابێتەوە بەمزگەوت دەبێ بەچینێك لەوحەوت چینەی كەلەڕۆژی مەحشەردا خوای گەورە لەژێر سێبەری ڕەحمی خۆیا حەشریان دەكات لەورۆژیدا هیچ سێبەرێ نیە لەغەیری سێبەری ڕەحمی خوا ...رواه البخاري.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی فریشتە دوعای خێر بۆ ئەو كەسە دەكەن لەئێوە مادام لەمزگەوتدا بێ، كەنوێژی تیا دەكا دەڵێ خودایە ڕەحمەتی بەسەردا ببارێنە خودایە لێی خۆش بە هەتا بێ دەست نوێژی بەسەردا دێت یا دەچێتە دەرەوە...متفق علیه.

بێجگە لەمانەش مانەوە لەمزگەوت دەبێتە نزیك بوونەوە لەخودای گەورە زیاتر زاڵ بوون بەسەر نەفس و شەیتان لەگەڵ پاداشتی ئەو عیبادەتەی كەدەی كەی ئەویش خوا هەرخۆی دەزانێ چەندە.

### ٧- مزگەوت بنکەو سەرچاوەی ژیانی بەختەوەریە :

مزگەوت لەکاتێکدا قوتابخانەو دانیشتگایە وە فێرگەو مەدرەسەیە هەروەها سەرچاوەو بنکەیە بۆ گشت فەرمانەکانی ژیان، وەڕەونەق و تیشك دەرێکی نورینە ڕێگای ژیان ڕەوشەن دەکاتەوە، مەردوم فێری ڕاسترین ڕێگای ژیان دەکات و لەهەموو تەنگ و چەلەمەکانی ژیان ڕزگاریان دەکاو چارەسەریان بۆ دائەنێ وەلەمێژووی ئیسلامدا دەورێکی سەرەکی دیوەو هەزاران پاڵەوانی بۆ ئیسلام پێ گەیاندووە کەمەردووم لەژێر سایەیاندا حەساوەتەو مافی خۆی لێ چەنگ کەوتووە، لەهەموو ڕوو لایەنێکی ژیانەوە مزگەوت ئەو جێگایە پیرۆزەیە کەبەماڵی خودا نێو براوە تیشکی پیرۆزی خۆی ئاخنیوە بەناو دڵ دەروونی ئیمانداران وەئومێدگا بووە بۆ چەوساوان و بێ نەوایان و هەژاران ، هەروەها شوێنی زانست و زانیاری بووە مزگەوت لەئیسلامدا جێگەی گشت وەزارەتەکانی دەوڵەتی ئیسلام بووەو، فەرمانی ڕەواو کاربەدەستان و خەڵکی تر هەژارو داماوو لەهەموو چینەکانی تری کۆمەڵی لەیەك صەف و پۆلدا کۆی کردونەتەوە، بێ ئەوەی هیچ جیاوازیەك لەنێوانیاندا هەبێ، دوژمنانی ئیسلام زانیویانە بەدەوری گرنگی مزگەوت بۆ موسڵمانان بۆیە گەلێ پیلانیان گێڕاوە بۆ ئەوەی مزگەوت لەکۆمەڵگا جیابکەنەوە وەبەلایەنێکی ساکارو لابەلای ژیان بەخەڵك و کۆمەڵی نیشان بدەن، لەمێژوی ئیسلامدا دیارە مزگەوت چۆن دەورێکی گرنگی دیوە لەخزمەتی کۆمەڵ، لەتەبایی و یەکێتی و بەزەیی و خۆشەویستی و زانیاری و یەکترناسی و ئازادی و بیر فراوانی و سیلەی ڕەحم و وەفای و بیرتیژی و سینە فراوانی...هتد. خستۆتە ناو ڕیزەکانی کۆمەڵەوە وە خەڵکی فێرە ئەو ژینە

کردووه کەمایەی بەختەوەری دونیـاو قیامـەت بـێ، وەهـەرکاتێ لـەناو خـوا بێئاگایاندا خواپەرستێ هـەڵی بـۆ ڕەخـسابێ لەمزگـەوتێ گـەنجانی دەوروبـەر بەئاسـودەیی و ڕوونورانیـەوە ڕوەومزگـەوت چـوینەو پێـشوازیان لێ کـردووە دەوریان لێداوە پەرۆشی ڕێنومایی و هیدایەتی خوای گەورە بوینەو هـەنگاویان بۆی هەڵناوه.

مزگەوت تەنانەت لەمەسەلەی ژن و ژنخوازیدا کەبەردی بناغەی کۆمەڵ و ژیان و ژینگەیە دەورێکی سەرەکی بووە، وەك و هەموو لایەن و بارەکانی تـری ژیان ...وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ (اعلنوا النكاح واجعلوها في المساجد واضربوا فيها الدفوف) رواه بخاري ، مەسەلەی ژن و ژنخوازیتان ئاشکرا بکەن و دیاردەی ئەمانە (جا ئاهەنگ بێ یا دەربڕینی هەر جۆرە خۆشـیەکی تـر بـێ )بخەنــە مزگەوتــەکان وە دەففــەی لەگــەلا لێ بــدەن..بەجێگەیانــدنی ئــەم فەرموودەیەش کەپڕیەتی لەخێرو بەرەکەتی دونیا و قیامەت لەمێـژووی هـەتا هەتایی لای خودا تۆمار ئەکرێ ،دیـارە لەمزگـەوت نێـرو مـێ تێکـەڵ نـابێ لـەدەیان ئـاژاوە خـەڵك نـەجاتی دەبـێ و عیزەتـی پـارێزراو دەبـێ وەك بـێ شەرعیشی تیا ڕوو نادات، سەرەڕای ئەوەش کەچەند ووتـارو قـسەی خێریـشی لێ دەکرێ لەدەمی مامۆسـتایانەوە بـۆ موسـڵمانان، وەلـەزیادە مەسـرەفیش نەجاتمان ئـەداو سـەرەڕای بـەجێ گەیانـدنی فـەرمانی پێغەمبەریـشمان ﷺ کەمایەی ڕەزامەندی خواوەندی گەورەو میهرەبانە.

# ئادابی دراوسێ و جیران

## ١- دراوسێ و جیران لەقورئان

خوای گەورەو میهرەبان دەفەرمویێ ﴿وَٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا﴾ (٣٦) (النساء ٣٦)

واتە: بەندایەتی خوای گەورە بكەن بەهیچ شیوەیێ لەهیچ شت هاوبەشی بۆ بڕیار مەدەن وە چاك و باش بن لەگەڵ دایك و باوكتان (لەكەڵ خزم و خوێش و بێ باوكان و هەژارانە)وەلەگەڵ جیران و دراوسێی نزیك و دوورتانا وە لەگەڵ جیرانی ئیش و كارو سەفەرو پیشەی ژیانتانا وەلەگەڵ ئەو كەسانەی كەلەسەفەردا ماڵ و پارەو پولیان لێ بڕاوە پێویستیان بەیارمەتی هەیە، وەلەگەڵ ئەوكەسانەش كەعەبد و جاریەتانن وەیا كەلەژێر دەستانن، وەبەڕاستی خوای گەورە ئادەمیزادی لوت بەرزو فەخرو شانازی بەخۆكەری خۆش ناوێ، وەدیارە لەم ئایەتەدا لوت بەرزی و فەخرو شانازی بەخۆكردنە بۆتە بەربەست لەڕێگای بەندایەتی كردنی خوای گەورەو چاكەخوازی لەگەڵ دایك و باوك و جیران و هەژارو لێ قەوماو داماوان، هەروەها واتە خوای گەورە ئەو كەسانەی خۆش ناوێ كەسیفەتێكی وایان تیابێ ببێتە بەربەست لەچاكەكاری و پیاوەتی و گیانی خێرخوازی ،خوای گەورە لەم ئایەتەدا سەرنجمان ڕادەكێشێ بۆ

ئه‌وه‌ی كه‌سیفه‌تێكی وان تیا نه‌بێ ببێ به‌به‌ربه‌ست له‌وه‌ی چاكه خوازبین له‌گه‌ڵ ده‌رو دراوسێدا، هه‌روه‌ها داوامان لێ ده‌كات ئه‌و سیفه‌تانه له‌نه‌فس و گیانی خۆمان پاك كه‌ینه‌وه‌و لابه‌رین كه‌مایه‌ی خه‌شم و ڕق و كینی خودایه ، لێره‌دا بۆمان ده‌رده‌كه‌وێ چاكه خوازی له‌گه‌ڵ خه‌ڵك و مه‌ردوما وه‌به‌تایبه‌تی له‌گه‌ڵ هاوسێ و جیراناندا داواكراوه ئیمانی پێ ته‌واو ده‌بێ له‌دڵ و ده‌رووندا.

وه‌له‌م باره‌وه فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ زۆره وه‌كو هه‌ندێكیان باس ده‌كه‌ین ، پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رمووێ ئه‌گه‌ر خوا خێری یه‌كێكی بووێ ئه‌وه خۆشه‌ویستی ده‌كا له‌لای هاوسێ و جیرانه‌كانی (رواه احمد) ، هه‌روه‌ها ده‌فه‌رمووێ خۆش گوزه‌رانی و سه‌عاده‌تی مرۆڤی موسڵمان له‌وه‌دایه خانوو ماڵێكی گوشاد و فراوانی هه‌بێ وه‌جیران و دراوسێیه‌كی باشی هه‌بێ وه‌سواریه‌كی چاك و باشی هه‌بێ ...رواه احمد.

ئه‌وجا باباش بین تاكو خۆمان و برایانی موسڵمان له‌خۆش گوزه‌رانی و سه‌عاده‌ت بێ به‌ش نه‌بن.

## ٢-كێ هاوسێ و جیرانه ؟!

حه‌زره‌تی عائیشه‌ی خێزانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ وه ڕزای خوای لێ بێ له‌گه‌ڵ ئیبن و شه‌هاب و ئه‌وزاعی پێیان وایه تا چل ماڵ له‌م لاو ئه‌ولاوه جیران و دراوسێ حسێبه به‌ڵگه‌شیان بۆ ئه‌مه ئه‌م فه‌رمووده‌یه(ده‌ڵێن پیاوێ هاته لای پێغه‌مبه‌ر ﷺ ووتی من هاتوومه ناو گه‌ڕه‌كی قه‌ومێكه‌وه، كێ له‌هه‌موویانه‌وه نزیكتره لێم زیاترو زۆرتر نارِه‌حه‌تم ده‌كات، پێغه‌مبه‌ر ﷺ ئه‌بوبه‌كرو عومه‌رو علی نارد بۆ ده‌رگای مزگه‌وت و به‌ده‌نگی به‌رز ڕایان

گەیاند و فەرموویان بۆ ئاگاداری و بزانن تا چل ماڵ بەهاوسێ حسێبە وەهەرکەسێ شەڕو خراپەی بۆجیران و هاوسێ کەی هەبێ ناچێتە بەهەشتەوە) رواه البخاري.

ئەو ماڵانەی لەدەوروبەری ماڵتانەوەیە وەهەموو ڕۆژێ لەوانەیە لەهاتو چوونی ئیش و کاردا بکەونە بەرچاوی یەك ئەمانە حەقی جیرانەتیان پترو زیاترە لەوەی لەدوو ڕۆژدا لەوانەیە جارێ بکەونە بەرچاوی یەکترەوە هەروەها، ئەوەی هەنگاوێ لەپێش تر بێ ماڵەکەیان ئەو لەحەقی جیرانەتیان لەپێشترە ، حەزرەتی عائیشە گوتی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من دوو جیرانم هەیە جاری واهەیە بەشە خێرێکمان هەیە بەشی هەردووکیان ناکات جا بۆ کامەیان بەرم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی کامەیان دەرگاکەی لەتۆ نزیکترە بۆ ئەویان بنێرە) رواه البخاري.

## ٣-هاوسێ و جیران حەقی ڕێزلێنانیان هەیە :

ئادەمیزاد پێویستە ڕێزو قەدری هاوسێ و جیرانی خۆی بگرێ لەهەموو ڕوو لایەنێکی ژیانەوە وەتا بۆی دەکرێ چاکەی لەگەلا بکا و یارمەتی بدات ، پێغەمبەر ﷺ ڕوو لەئەبو زەڕ دەکات و دەفەرمووێ(ئەگەر ئاو گۆشتت لێنا ئاوی زۆری تیا بکە ئینجا بڕوانە بۆ دانیشتوانی ماڵێك لە هاوسێ و جیرانەکانت هەندێکیان بۆ بنێرە و چاکەیان لەگەلا بکا) رواه مسلم. بەڵێ چاکە لەگەڵ جیران کردن لەخوڕەوشتی بەرزو جوانە مایەی خۆشەویستی دەرو دراوسێیانە، جێگەی ڕەزامەندی خوای کاربەجێ و میهرەبانە، ئەگەر ئادەمیزاد چێشت بۆ جیرانەکەی ببات یا هەرچاکەیەکی تری لەگەڵدا بکات

ئەوا جیرانەکەی ئەویش لەبەرامبەریدا چێشتی بۆ دەنێرێتەوە لەبەرامبەر چاکەی چاکەی لەگەلا دەکاتەوە ئەوە وەك یەك وەستا بەلام زۆر سودو قازانجی هەیە وەدروست بوونی خۆشەویستی تەبایی و خۆرەوشتی جوان و بەرەکەت و رەحمەت و ئاسودەیی و دلنیایی و دروست بوونی گیانی کۆمەکی و هاوکاری، هەروەها رازی بوون و رەحمەتی خوداش سەربارو بن بار، باشە ئەم خالانە چۆن دروست ببێ ئەگەر بۆنی چێشت و خواردنی خۆش بچێت بەسەر مالیاندا وەجیرانەکەش نەیبێ و مندالەکانیان بگرێن و داوابکەن باوك و دایکیشیان دەست بەچۆکا وەرینن و دونیایان لەسەر تەنگ بێتەوە وەدەیان هەناسەی سارد هەلکێشن و ئێش و ئازار بەدلیان بگات ئەم کارەش بەردەوام دووبارە بێتەوە، جا بیرکەوە چی دروست دەبێت ؟بەلێ رق و کین و کەیف بەیەك نەهاتن و بەدەم یەکەوە نەچوون، دەست گرتن بەرژدی و رەزیلیەوە، پچرانی گیانی هاوسێیاتی و ...هتد.دێتە کایەوە.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ هاوسێ و جیرانی نزیکی هەلناوە تا دیاری و هەدیە بۆیەکتر ببەن چونکە چاویان لەیەکترە چی دەچیتە مالێ و چی لێ دێتە دەرەوە ،دیارە ئەگەر شتێکی وای بینی و حەزی لێ کرد پێی خۆشە بۆی بنێرن و بیکەنە هاوبەشی خۆیان، لەبەرامبەر ئەوە ئەویش کاتێ دیتی هاوسێ کەی ئادەمیزادی ئاوا باشە، ئەوا خۆشی دەوێ و گەرگیروگرفت و بەلایێ هات بەسەریا زوو بەدەمیەوە دەچێت و یارمەتی دەداو فریای دەکەوێ وەتەمەنای ئاشوب و فیتنەی بۆ ناخوازێ و دوعای خراپی لێ ناکات.

ئادەمیزاد ئەگەر توانای زۆری نەبوو لەچاکەکردن لەگەلێ جیرانەکەی چاکەی بەقەد توانا لەگەلا بکات باکەمیش بێ، بەقەد توانای خۆی، گرنگ

ئەوەیە دڵسۆزاتی و چاکە خوازی بنوێنێ، چاکە کەمەکەی بەبێ نرخ نەزانێ وەبەهاوسێ کەش کەچاکەی کەمی لەگەڵا دەکرێ بەسووك و کەم نرخی دانەنێ پێشوازی لێ بکاو بێ منەتی دەرنەبڕێ و دوعای خێری بۆ بکا ، لەمبارەیەوە پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ (ئەی ئافرەتانی ئیماندارو موسڵمانان ئەگەر یەکێ لەهاوسێ و جیرانەکانتان شتێکی بۆناردن یا شتێکتان بۆ دراوسێکانتان نارد بەسوك و کەمی نەزانن هەرچەندە سمكۆڵەی مەڕیش بێ) رواه البخاري.

لەم جۆرە کاتانەدا دراوسێی نزیك پێش دەخرێ بەسەر ئەوانی دوورترا وەك باسمان کرد

## ٤- چەند جۆرە هاوسێ و جیران هەیە

مەرج نی یە ئادەمیزادی موسڵمان، هەر موسڵمانی یا هەر خزم و خوێشی موسلمانی جیران بێت، لەوانەیە ئادەمیزادی بێ باوەری جیران بێت ،جا با بزانین چەند جۆرە هاوسێ و جیران هەیە؟ بەڵێ سێ جۆرە وەك لەفەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردۆتەوە و هەر جۆرەشیان ڕێزو حەقی تایبەتی خۆی هەیە.

**یەکەم**/ هاوسێەك کەکافرو بێ باوەر بێ ئەمە تەنها حەقی هاوسێیاتی و جیرانەتی هەیە.

**دووەم**/ هاوسێەك کەموسلمان بێ ئەمە دوو حەقی هەیە موسڵمانەتی و جیرانەتی.

**سێ یەم**/ هاوسێەك کەموسلمان بێ خزم و خوێش بێ ئەمەیان سێ حەقی هەیە ،خزمایەتی و موسلمانەتی و جیرانەتی) راوه البخاري.

لەئایینی پیرۆزی ئیسلامدا گرنگ و بایەخێکی زۆر دراوە بە جیرانـەتی و دراوسێ یاتی، وە موسلمان داوا لێکراوە کە رێزو قەدری جیرانەکانی بگرێ، جا ئەو جیرانە خزم و خوێش بێ یان نە، موسلمان بـێ یـا کـافرو بـێ بـاوەڕ بـێ، عابید بێ یا فاسیق بێ، هاو وولاتی بێ یـا بێگانـە بـێ، مالەکـەی لکـا بـێ بەمالەکەتانەوە یا بەینیان هەبێ، هەریەکە بەپێ ی مافی خۆی گەر خزم بـێ و موسلمان بێ و جیران بێ ئەمەش حەقی هەیە و لەپێش تـرە تاکەسـێك تـەنیا جیران و مـوسلمان، بێ کـە دوو حـەقی بەسـەرتەوە هەیـە، هـەروەها ئەمـەش لەپێـشترە لەیـەکێکی تـر کەتـەنها جـیران و هاوسـێ بـێ کەتاکـە حـەقێکی بەسەرتەوە هەیە کەجیرانەتیە ،. جیران ئەوەندە فـەرمان کـراوە بـەرێز گرتنـی هاوەلێکی وەك کوری ئیمامی عومەر بۆمان دەگێڕێتەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی (فریشتەی وەحی حەزرەتی جوبرائیـل ئەوەنـدە لـەبارەی جـیران و دراوسێ وە باسی بۆ کردم ،هەتا گومانم وابرد میراتی لێ دەگرێ) رواه البخاری

.

لەبەر ئەو هەموو فەرمایشتەی پێغەمبـەر بـوو ﷺ موسـلمانان رێـزی هاوسێ ی بێ باوەڕیشیان دەگرت و لەخێرو چاکە لەگـەڵ کردنـدا فەرامۆشـیان نەدەکردن، یەکێ لەو بەرێزانە وەك عبدالله ی کوڕی عمر ڕەزای خـوای لێ بـێ جارێکیان لەماڵەوە مـەڕێکیان سـەربڕیوە بـۆ خێـرو خێـرات کـاتێ ویـستیان بیبەخشنەوە سێ جار ووتی بەماڵی یەهودیەکەی جیرانمان دەست پێ بکەن، زۆر بەپەرۆشەوە دووبارەی

دەکردەوە نەبادا مافی هاوسێ یەکیان پشت گوێ بخرێ.( رواه البخاری)

هەروەها کاتێ پێغەمبەری خودا ﷺ قوربانی سوننەت دەکات وەلەکاتی

گۆشت دابەش کردندا دەفەرمووێ (بەحەزرەتی عائیشە لەجیرانە جولەکەکەمان دەست پێ بکە ) تفسیر القرطبی ١٨٨/٣ .دیارە دەبێ موسڵمان و خزمان حەقیان زیاتربێ بەڵێ بەم شێوەیە لەئاییني پیرۆزی ئیسلامدا ڕێزی هاوسێ و جیران گیراوە با کافرو بێ باوەڕیش بوبێ.

## ٥- ئازاردانی هاوسێ و جیران زۆرگوناهە :

مادام خوای گەورە ئێمەی ڕێنومایی کردوەو هیدایەتی داوین پێویستە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بکەین چاك و باش بین لەگەڵ دراوسێ و جیرانمان باناگامان لەخۆمان بێ ئازاری دراوسێ و جیرانان نەدەین بەهیچ شێوەیێك تاکو خوای گەورە لێمان نەڕەنجێ.

پێغەمبەر ﷺ لەبارەی ئەو کەسانەی کەئازاری جیران و هاوسێ کانیان دەدەن دەفەرمووێ (قەسەم بەخوا ئیمانی نابێ، قەسەم بەخوا ئیمانی نابێ، قەسەم بەخوا ئیمانی نابێ، ووتیان کێ ئەی پێغەمبەری خودا فەرمووی ئەوەی جیران و هاوسێ کەی لەشەڕو گێچەڵی دڵنیای و ئەمین نەبێ ﴿٢﴾ متفق علیە.کەواتە ئەوکەسەی ئازاریجیران و دراوسێکەی بدات لەڕێزی ئیمانداراني تەواو دەچێتە دەر ، هەندێك لەزانایان ئازاردانی جیران و هاوسێ بەگوناهی گەورە حسێب دەکەن ﴿٣﴾ جابڕوانەو سەرنج بدە تاچ ئەندازەیەك ئازاردان و خراپ بوون لەگەڵ هاوسێ و جیراندا گوناهە و تاوانێکی گەورەیە .هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (ئەوەی باوەڕی بەخواو ڕۆژی قیامەت هەیە بائازاری هاوسێ و جیرانەکەی نەدات)متفق علیە.کەواتە موسڵمان بابزانێ و ئاگاداربێ و خۆی بپارێزێ لەوەی خواو پێغەمبەر ﷺ پێیان ناخۆشە لەجیاتی

ئه‌وه‌ى ئازاريان بدات باچاكه‌و پياوه‌تى له‌گه‌ڵيان بكات وه‌ك سه‌لام لىٚ كـردن و ديارى بۆ بردن ،ڕووخۆش بوون له‌كاتى چاوپێكه‌وتنندا هه‌واڵ پرسين و سـه‌رلێدان و يارمه‌تيدان ئه‌مانه هـه‌مووى نيـشانه‌ى ڕێـزلىٚ گـرتنن. پێغه‌مبـه‌ريش ﷺ ده‌فـه‌رمویٚ(ئـه‌وه‌ى بـاوه‌ڕى بـه‌خواو ڕۆژى قيامـه‌ت هه‌يـه‌باڕێزى هاوسـىٚ و جيرانه‌كه‌ى بگرىٚ و چاكه‌يان له‌گه‌لاٚ بكا) رواه مسلم.

لێرانه‌دا دياره كـه ئيمـان به‌سـتراوه‌ته‌وه و په‌يوه‌نديـه‌كى بـه‌هێزى هه‌يـه له‌گه‌ڵ ڕێزو چاكه كردن له‌گه‌ڵ جيراندا.

هاوه‌ڵـه بـه‌ڕێزه‌كانى پێغه‌مبـه‌رى خۆشه‌ويـست ڕه‌زاى خوايـان لىٚ بێـت ئيمانێكى ته‌واو باشيان هه‌بوو ،وه‌ئيمان فه‌رمان به‌ريان بوو له‌دڵ و ده‌روونياندا بۆيه توانيان هه‌زاران گومڕاو سه‌لێشێواو ئاسوده بكه‌ن، به‌به‌رزى ئيمانى خۆيان و خۆڕه‌وشتى جوانيان به‌ره‌و ئيمان و هيدايه‌ت بيان هێنن.

ده‌گێڕنه‌وه يه‌كىٚ له‌وهاوه‌ڵه به‌ڕێزانه، ماڵيان مشكى زۆر بوو ووتى باشـه ده‌بىٚ چار چى بىٚ ؟ووتيان پشيله ڕابگره جا ڕاده‌كه‌ن و ده‌رده‌چن ،ووتـى باشـه ده‌رده‌چن بۆكوىٚ؟ دياره هه‌ربۆماڵه جيرانان ده‌چن كه‌واته من ئه‌وه‌ى بۆخۆم ئه‌م ويست بۆ ئه‌وان نه‌م ويست به‌خواى ئه‌مه ئينساف نيه ئه‌مه ئازاردانى دراوسىٚ و جيرانه خواو پێغه‌مبه‌رى خوا ﷺ پێيان ناخۆشه وه‌من هه‌رگيز ناتوانم كارى وابكه‌م .

هه‌روه‌ها ووتيان يا رسـول الله (فـلان ئـافره‌ت بـه‌ڕۆژوو ده‌بـىٚ شـه‌ونوێژ ده‌كات وه‌ئازارى جيرانه‌كانيش ده‌دات؟فه‌رمووى ئه‌و ئافره‌ته له‌ناو ئاگرايه واته ئه‌گه‌ر به‌رده‌وام ئازارى جيرانانى بدات و وه‌ته‌وبه نه‌كات و په‌شـيمان نه‌بێتـه‌وه ده‌چێته ناو ئاگرى دۆزه‌خه‌وه ئه‌وجا باهه‌ر به‌ڕۆژو بىٚ و شه‌ونوێژ بكات)اخرجـه

احمد وحاکم وقال صحيح الاسناد﴿٤﴾

## ٦- گوناهی گەورە ئەوەیە کەلەگەڵ جیراندا بکرێ

لەبەر ئەوەی دراوسیێ و جیران حەقی چاکەو پیاوەتیان هەیە جا ئەگەر پێچەوانە بوەوە ئەوە ئەبێتە گوناه و تاوانێکی زۆر گەورە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ،ئەوەی زینایەك لەگەڵ جیران و دراوسێکەی بکات گوناهەکەی گەورەترە لە دە زینا کەلەگەڵ کەسانێ دوورتر بکات) المسند الامام احمد٨/٦.

ئەمەش هۆی ئەوەیە گوایا جیرانەو جێگەی متمانەیەو هاتو چۆو سەردانی دەکاو خەڵکی دڵی لێ پیس ناکەن و شوبهەی لێ ناکەن کەچی ئەویش خیانەتی لەتەکا دەکاو ناموسی پیس دەکا.

هەروەها لەبارەی دزیشەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ئەوەی دزی بکات لەگەڵ یەکێ لەماڵە جیرانەکانی باری گوناهی گرانترەو گەورە ترە لەوەی دزی لە دەماڵ بکات لەماڵەکانی کەسانی تر کەجیرانی نین.(رواه الامامامحمد ٨/٦.ئەم دوو فەرموودەیە قیاسە لەسەر هەموو خراپەو تاوانەکانی تر وەك نەزەرو غەیبەت و بوختان و جنێودان ....هتد.هەروەها پێچەوانەش ئەوەی چاکە لەگەڵ جیرانەکەی بکات خێری چەند قات زیاترە لەوەی لەگەڵ کەسانی تر بکات .

جا بۆئەوەی باشتر بزانین کەگوناه لەگەڵ جیران چۆنە با زیاتر باسی ماف و حەقی خۆی بکەین ئەوسا ڕوون دەبێتەوە چونکە حەق و ماف نەدانی جیرانیش لەپۆلەکانی گوناه و تاوان دەژمێردرێت ،وەلەڕاستیدا حەق و مافی دراوسێ و جیران بەسەریەکەوە زۆرە فەرموو بابزانین موعازی کوڕی جەبەل

چیمان بۆ ده‌گێڕێته‌وه ده‌فه‌رموێ گوتمـان ئـه‌ی پێغه‌مبـه‌ری خـوا ﷺ مـاف و حه‌قی جیران چیه؟فه‌رمووی (ئه‌گـه‌ر داوای قـه‌رزی لیٚ كـردی قـه‌رزی بـده‌یتیٚ وه‌ئه‌گه‌ر داوای كۆمه‌كی لیٚ كردی كۆمه‌كی بكه‌یت وه‌ئه‌گـه‌ر پێویـستییٚ ڕووی تیٚ كرد یارمه‌تی بده‌ی وه‌ئه‌گه‌ر مـرد شـوێنی ته‌رمه‌كـه‌ی بكـه‌ویت وه‌ئه‌گـه‌ر سودێكی ده‌ست كه‌وت پێت خۆش بێت و پیرۆزبایی لیٚ بكه‌یت به‌بۆنه‌ی چێشت و شیو ئازاری نه‌ده‌یت وه‌ئه‌گه‌ر بۆنه‌كه‌ی بۆچوو به‌شـی بنێریـت خـانووی بـه‌رز نه‌كه‌یته‌وه به‌سه‌ر خانووی ماڵیا تابۆی بڕوانیت یا زاڵ بیت به‌سه‌ریدا یا ڕێگه‌ی باو هه‌واو ڕۆژی لیٚ بگریت مه‌گه‌ر ئیزنی لیٚ وه‌ربگریت ئه‌گه‌ر میوه‌ت قسمه‌ت بوو به‌شی بده‌یت ده‌نا به‌نهێنی بیبه‌ره ماڵه‌وه یـا منداڵـه‌كانت شـتێك نه‌به‌نـه ده‌ره‌وه كه‌منداڵه‌كه‌ی ئه‌و به‌دیاریه‌وه غه‌م بخواو ڕكه بگریٚ تیٚ ده‌گـه‌ن و حـاڵی ده‌بن چیتان پیٚ ده‌ڵێم؟حه‌ق و مافی هاوسـیٚ نـادات قه‌سـه‌م بـه‌خوا به‌تـه‌واوی كه‌سانیٚ نه‌بیٚ له‌وانه‌ی كه‌خوا ڕه‌حمی پیٚ كردون ﴿٥﴾ اخرجه خرائطي.

### ٧- دراوسیٚ و جیران ده‌بیٚ بۆ ناته‌بابن؟!

له‌ڕاستیدا ناته‌بایی و نـاكۆكی نێـوان جـیران هـه‌مووی له‌بـه‌ر لـه‌خوابیٚ ئاگایی و، له‌خوا نه‌ترسانه، وه‌له‌به‌ر بیٚ ئاگاییـه له‌ده‌سـتورو به‌رنامـه‌ی ژیـان وه‌له‌به‌ر وێڵ و گومڕایی و سه‌رلێشێواویه ئه‌مه‌ش به‌رهه‌م و نه‌تیجـه‌ی ده‌سـتی شـه‌یتانه‌كانی و ئیـنس و جنـه، هـۆی گـه‌وره ئـه‌م خالاٌنـه‌ی خواره‌وه‌یـه كه‌سه‌رئه‌كێـشیٚ بـۆ ناتـه‌بایی و چـینه‌كانی كۆمـه‌ڵ وه‌به‌تایبـه‌تی دراوسـیٚ و جیرانه‌كان :-

أ- په‌رته‌وازی كۆمه‌ڵ به‌بیرو باوه‌ڕانی جیاجیا و نارێك، شـه‌یتانه‌كان لـه‌م

ڕێیانه‌وه وایان كردووه كه‌گه‌ل و كۆمه‌ڵ ببێ به‌چه‌ند چین چینێ جیاواز وه
هه‌رچینێ خۆی پێ باش و ڕاست ره‌وبێ ئه‌ویتریان پێ لاده‌رو لا ڕێ بێ
وه‌هه‌روه‌ها جا له‌سه‌ره‌نجام و نه‌تیجه‌دا ڕه‌گ و ڕیشه‌ی خۆشه‌ویستی پچڕاندوه
وه‌ته‌بایی و گیانی هه‌ره‌وه‌زی و هاوكاری له‌نێوان دراوسێ و جیران لای داوه‌و
هه‌ڵگرتووه، بۆته هۆی دووركه‌وتنه‌وه له‌یه‌ك و كه‌یف به‌یه‌ك نه‌هاتن و دروست
بوونی غه‌یبه‌ت و بوختان و درۆكردن، له‌ئه‌نجامی ئه‌مانه‌شدا ده‌م و چاو ڕوو
ناشیرین و ناڕێك بوون له‌به‌رامبه‌ریه‌كا، ئه‌مه گشتی له‌به‌ر ئه‌وه‌یه له‌ئایینی
پیرۆزی خۆیان دوركه‌وتونه‌ته‌وه .

ب-زۆرتر ناكۆكی نێوان جیرانان و هاوسێ یان له‌به‌ر نه‌بووی په‌روه‌ده‌یه‌كی
ئیسلامی و خواناسانه‌یه، زیاد له‌مه‌ش په‌روه‌رده‌یه‌كی شه‌یتانی له‌هه‌موو
جیهاندا كه‌گه‌لان و كۆمه‌لانی بردۆته دونیای وێڵ و گومڕایی و حه‌یرانیه‌وه،
وه‌له‌ڕێگه‌ی صحن و ته‌له‌فزیۆن و فلیمه بێ سه‌روبنه‌كانی سینه‌ماو
ئیزاعه‌كانیانه‌وه كه‌توانیان به‌سه‌ر كۆمه‌ڵدا ڕابنوێنن به‌ناوی پێشكه‌وتن و
شارستانی و زانیاری و هونه‌رو فه‌ن ...هتد له‌ئه‌نجامی ئه‌وه‌شدا خه‌ڵك و
مه‌ردووم دوورخرایه‌وه له‌ده‌ستورو به‌رنامه‌ی خوا، یان له‌ئه‌نجامی ئه‌وه‌شدا
ئه‌خلاق و خوره‌وشت شوێنی خۆیانیان پێ شێل كرا ده‌ردو به‌لای بێ شه‌رمی
حه‌یایی و بێ ڕێزی په‌ره‌ی سه‌ندو گه‌وره‌و بچوكی نه‌ماو، ڕێزو قه‌دری زانین و
زانا نه‌ما وه‌ك و پێویست، تاوای لێ هات جیران ئاماده‌بن له‌سه‌ر شتێكی
بچووكی منداڵ بۆ یه‌كتر بچنه مه‌یدان و یه‌كتر هه‌راسان بكه‌ن كه‌س ئاماده
نیه له‌كه‌س ببورێ، وه‌كه‌س صبرو ئارامی نیه بۆ چاره‌سه‌ر كردنی گیرو گرفتێ،
ئه‌گه‌ر په‌یوه‌ندی بۆخۆیه‌وه هه‌بێ نه‌گه‌رنا له‌دوور و نه نزیك بۆی ناڕوانێ،

وەكەس منداڵی كەس وەك هی خۆی سەیر ناكا، ڕەحم و بەزەیی نەما گیانی هاوكاری و برایەتی جیرانێتی .. كەسایەتی هتد كزۆڵ وسست و لاواز بووە، ئومێد وایە دەستی خواناسان بەیارمەتی خوای گەورە ببێتە پەرەبستێ لەهەموو جیهاندا لەرووی شالاوو لافاوەكانی گومڕایی و نەزانین ...

دەبێ چارەسەر چی بێ ؟!!

شك و گومان لەوە دانی یە كەتەنها چارەسەرێك بۆ ئەم گیروگرفتانە گەڕانەوەیە بۆ ئایینی ئیسلام بە شێوەیەكی ڕاست و دروست وەگێڕانەوەی دلان بۆ بازاری ئیمان ،ئەوەی ویژدان و ئینسانی هەبێ، وە كاریگەرێكی ئەم لاو ئەولاو كاری لێ نەكردبێ ،ژیرو فیترەتی خۆی ئازاد بكاو فەرمان و ڕەئی بداتەوە دەستی ،دەبینین ئەویش دەبێتە شایەدێك لەسەر ئەوەی كەتەنها ئایین و بەرنامەی خوایە و چارەو حەلی هەموو كێشەو گیرو گرفتێكی تیایە ،لەمانەش دروست كردنی گیانی هەرەوەزی و هاوكاری و خۆشەویستێتی نێوان دراوسێ و جیران ،ودلەناو بردنی هەموو كەم و كوریەكان ..

جاسەیر كەو سەرنج بدە بزانە چۆن ئیمانداری و گوێرایەلی خواو پێغەمبەر ﷺ ئامیزادی وا دروست دەكات ،نەهەر كێشەو گیرو گرفت گەورە ناكات بەلكو بنە بری دەكات و حەل و چارەیەكی وای بۆ دائەنێ كە ببێتە مایەی پەندو ئامۆژگاری .. (دەگێرنەوە بەسەندێكی صالح كەپیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ سكالای لەدەست هاوسێكەی دەكرد ،برۆ صەبرو ئارامت بێ پاش ئەوە نارەحەت كرایەوە ،دووجار یا سێ جار هاتەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ هەمان سكالای كردەوە برۆ كەل و پەل و شتەكانت لەو سەر رێگەیەدا دانێ) ئەویش شتەكانی هێناو لەسەر ڕێگەی گەورەی شاردا

هەلی رشت و داینا ،خەلكی لێیان دەپرسی ؟ئەوە هۆی چی یە شتەكانت لەو سەر رێگەدا هەل رشتووە؟ باسی خۆی بۆ گێڕانەوە، خەلكیش جیرانە خراپەكەیان بەنەعلەتیان دەكردو قسەیان پێ دەگووت و سەرزەنشتیان دەكرد ،دەیان گووت دەبێ ئەو كابرایە چۆن وێرابێ ئاوەها ئازاری جیران و دراوسێ بدا ،باشە دەبێ نەیزانیبێ و نەی بیستبێ پێغەمبەر ﷺ سێ جار لەسەریەك سوێندی خواردوە ئەوەی ئازاری جیران و هاوسێ ی خۆی بدات ئیمانی نابێ !هەی خوا واو وای لێ بكات ، ئەم دەنگ و باسە بلاو بۆوە گەیشتە گوێچكەكانی ئەهلی شار، وەخەلك نارەزایان دەربری و سەرزەنشتی كابرایان دەكرد ،ناچار ئەویش هات بۆ لای و ئەو پەری شەرمەزاری و پەشیمانی دایگرتبوو دەستە و دامێنی بوو گوورتی مەردی خوابە بگەرێوە جێگەی خۆت و خۆ بەتەواوی ئابروم چوو!! ئیتر هەرگیز شتێكی وا لەمنەوە نابینی دل گرانت بكات و پێت ناخۆش بێ ..) ..اخراجه ابو داود وابن حبان .بەلێ بەم جۆرە خۆگرتنە بووە هۆی ئەوە هاوسێكەی لەكاری ناهەمووارو خراپەی پێشووی پەشیمان ببێتەوە و بگەرێتەوە بۆ سەر رێگای راست، وە خەلكی تریش بترسێ لەئابروو چوون جیرانی خۆی ئازار نەدا ،نەبادا ئەویش ئامادەبێ كەل و پەلی خۆی لەسەرە رێگا هەل برێژێ .

سەیركە لەهیچ جارو كەرەتێكا پێغەمبەر ﷺ نەی فەرموو برۆ تۆش ئازاری بدەو ! ! چونكە پێغەمبەر ﷺ دانایەو زانایە مامۆستایە ئەزانێ كارو پیشەی خراپ بەخراپ چارەسەر نابێ بەتایبەتی لەگەل جیران و دراوسێ دا ،بەلكو باری ناهەمووار هەر بەچاكە خوازی و صەبرو ئارامی و عەقل و هۆشەوە ،چارەسەر دەكرێ، بائێمەش هەول بدەین بەگوێرەی توانامان لەگەل

جیران و دراوسێکانمان چاك و باش بین چاکه‌یان له‌گه‌لا به‌که‌ین ئه‌وه‌تا پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رمووێ چاکترین هاوسێ لای خوای گه‌وره ئه‌و که‌سه‌یه که‌چاکتر بێ بۆ جیران و دراوسێکانی .رواه الترمذی وقال حدیث حسن .

هه‌روه‌ها با هه‌ولیش بده‌ین که‌سانی جیران و دراوسێ و ناسیاومان حالّی بکه‌ین له‌ئیسلام وه‌ڕێگه‌ی هیدایه‌تیان بۆ ڕوون بکه‌ینه‌وه پێش ئه‌وه‌ی ئاماده‌بکرێین و به‌مه‌یدانی مه‌حشه‌ردا له‌لای خودای گه‌وره شکایه‌تمان لێ بکرێت له‌لایان ناسیارو جیرانان بلّێین وه‌ره کابرا من تۆ ده‌ناسم، ئه‌ی خوایه ئه‌م کابرایه هه‌مووجار به‌لامان ڕائه‌بوورد ئاگاداربوو به‌به‌رنامه‌و ڕێگه‌ی هیدایه‌تی تۆ وه‌هه‌رگیز منی بێدارو ئاگادار نه‌ده‌کرده‌وه به‌لّکو بۆخۆم عاقل و ژیر بومایه توشی ئه‌م مالّ وێرانیه هه‌تایه نه‌بوومایه .

جا هه‌ولّبده‌ین له‌زۆنگاوی به‌دبه‌ختی و گومڕایی ڕزگاریان بکه‌ین به‌خوڕه‌وشتی جوان حالیان بکه‌ین وه‌ئیسلامه‌تی و به‌رنامه‌ی خوا له‌لایان شیرین و جوان بکه‌ین پێش ئه‌وه‌ی تووشی سکای سه‌رلێشێواو گومڕاییان ببین سه‌ره‌نجام عیتابی خوای گه‌وره‌مان بێته سه‌ر.

# ئادابی سەلام کردن

## ١-ئادابی سەلام کردن چی یە ؟

پێش هەموو شتێ پێویستە بزانین سەلام (السلام)واتە ئاشتی ناوێکە لەناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە وەبنچینەی ئەم ناوە (سلم)ە واتە تەواوی دوور لەکەم و کوری ،ئاشتی سیفەتێکە لەسیفەتە جوانەکانی خوای گەورە، و دروشمی ئاشتی لەسەراسەری بوونەوەر دەردەکەوێ لەنەخش و نیگارەکانی، لەرازاوەیی و دیمەنەکانی مانای ئاشتی دەخوێندرێتەوە.. ئاشتی هەنگاوێکە ئیمانداران لەسەر زەوی بەرەو ڕووی دەڕۆن تا بەهۆی ئاشتی دونیاوە ئاشتی هەمیشەیی بەهەشت وەدەست بێنن ،گیاندارە شاخ دارەکان!! شاخەکانیان وەکو ئالای ئاشتی بەرزیان کردوتەوە تاکو ناحەزانی ئاشتی پێ پەرچ بدەنەوە، هەروەها باقی گیاندارانی تر هەر جۆری بەشێوەێی ئەنوێنێ و دیاری دەکا کەوا ئاشتی خوازەو دوژمنی ناحەزی و شەڕ فرۆشانە ..وەك بالندەکان هەر کاتێ دەنگێکی گەورە ببیسن ،دەزانن ئاشتی لەشوێن خۆی ترازاوە بۆیە خێرا لەشەقەی بال دەدەن و ئەڕۆن بۆ شوێنی تر، تابگەن بەدونیای ئاشتی، هەروەها یاساکانی زەوی و ئاسمان و نێوانیان دروشمی ئاشتی و سەلامەتیان لێ دەدرەوشێتەوە ..هەروەها سەلام ئەم مانایانە هەل دەگرێ وە تێیدا کۆ دەبێتەوە ،وەك ئاشتی و هێمنی و سەلامەتی و دلنیای و ڕەحمەت و بەرەکەت و پیرۆزی و هیدایەت،.وەسوننەتێکی گەورەیە کەموسلمانان سەلاو لەیەك بکەن ..بەلام وەلام دانەوەی واجبە و ئەوەی کەم و کورتی تیا بخەنە گوناهی

ده‌گاتێ جا بۆیه پێویسته ئادابی سه‌لام كردن به‌باشی فێربین .. كه‌موسلمانێ ده‌گاته براكه‌ی موسلمانی سه‌لاوی لێ ده‌كات، واته : ئاگاداری ده‌كاته‌وه به‌گه‌یشتنی و بۆ لای یادكردنی و دوعای خێر بۆ كردنی و حه‌ز كردن به‌خۆش به‌ختی . وه(السلام علیكم ورحمه الله وبركاته) واته ئه‌ی برای موسلمانم ئاشتی و پیرۆزی و دلنیایی و سه‌لامه‌تی و به‌ره‌كه‌ت وره‌حمه‌تی و هیدایه‌تی خوای گه‌وره‌ت له‌سه‌ر بێ .. كه‌ئه‌م سه‌لاوه خوێندرا ئیتر ده‌رگاكانی خۆشه‌ویستی و برایه‌تی و ته‌بایی به‌زه‌یی خودا ده‌كه‌ونه سه‌ر پشت بۆ براكه‌ی .. وه‌ده‌رگاكانی رق و قین و خراپی و ترس وله‌رز و غه‌فله‌ت و بێ ئاگای دائه‌خرێن .. بۆیه وه‌لامه‌كه‌ی ده‌بێ به‌ئه‌رك و واجب له‌سه‌ر براكه‌ی كه‌ئه‌ویش هه‌ر به‌م شێوه‌یه وه‌لامی بداته‌وه یا به‌شێوه‌یه‌كی باشتریش وه‌كو خوای گه‌وره پێمان ده‌فه‌رمووێ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾ ﴾ (النساء ٨٦)،

باشه له‌غه‌یری (صیغه‌و زاراوه‌ی سه‌لام )چی هه‌یه له‌م ڕووه‌وه كه‌جێگای یه‌ك له‌هه‌زاری مانای سه‌لاو پر بكاته‌وه ؟!! هه‌له‌و هه‌له‌و ..چۆنی یا جۆره ئیشاره‌تێك به‌ده‌ست بێ یا به‌سه‌ر بێ یا به‌یانی باش بێ یا ئیواره باش بێ یا ئه‌و كاته باش بێ باشه كێ باشی و بكاو چۆن باش بێ به‌چی باش بێ ..هتد ؟ كه‌ی ئه‌و مانایانه‌یان تیایه كه‌له سلاودا هه‌یه ؟ ؟..یا له‌وه‌لامه‌كه‌ی دا .. سه‌رچاوم سه‌رچاوم ،اهلا اهلا ..یا خۆشبی .. ئه‌مانه و هاووێنه‌یان كه‌ی جێگه‌ی وه‌لامه‌كه‌ی پرده‌كه‌نه‌وه -١-؟ ؟ ! ! له‌هه‌ر شوێنێ دیتت سه‌لاو كردن وه‌لام دانه‌وه‌ی له‌شوێن خۆیا نه‌بوو یه‌كسه‌ر دیار ئه‌دا كه خه‌لكی ئه‌م شوێنه بێ ئاگان له‌به‌رنامه‌ی خودا، ده‌نا سه‌لاو به هیچ شتێ ناگۆڕنه‌وه ..دیاره ڕه‌حمه‌ت

و ئاشتی و بەرەکەت هەر لەلای خودای ئاشتی خوازو خۆشەویستە، بۆیەش دەبێ هەر لەو داوا بکرێ، وەك لەزیکرو ویردەکانی پێغەمبەر ﷺ دا دەرئەکەوێ کەفەرموویەتی (اللهم انت السلام ومنك السلام تباركت ياذا الجلال والكرام) سوننەتە ئیمەش ئەو دوعایە بخوێنین بەتایبەتی لەپاش سەلاوی نوێژەکانا .. لەئەحیا علومی دیندا هاتووە: ئافرەتێکی خوا پەرست برازایەکی زانای هەبوو، پیێ ی ووت ئەی کوڕی خۆم ئەگەر روح و گیانم دەرچوو و بەرز بووەوە بەرەو ئاسمانەکانی تا گەیشت بەلیقای خودا، چی لەحزوور خودادا بلێم ؟فەرمووی بلێ (اللهم انت السلام ومنك السلام تباركت ياذا الجلال والكرام) جا پاش ماوەیەك ئافرەتەکە ئەمری خوای فەرموو، دوایی هاتە خەونی برازاکەی ووتی خودا بەختیارت بکات وەکو تۆ زیکرو ویردێکی وات فێرکردم و لەخزمەت خوادا خوێندم، زۆر پێەوە دلشاد بووم ..

## ٢- سەلام کردن و وەلام دانەوەی دەبێ چۆن بێ ؟

سەلام کردن و وەلام دانەوەی صیغەو زاراوەی تایبەتی خۆی هەیە، سوننەتە و خێری زۆرترە بۆ ئەو موسلمانەی کەلەسەرەتا سەلام دەکات و ئەوەی وەلامیش دەداتەوە خێری دەگاتێ بەشەرتێ کەم و کوری تیا نەخا نیەتی چاکی بێ ،چونکە وەلام دانەوەی واجبە ،نابێ پشتی تێ بکرێ کورترین صیغەو زاراوەی سەلام کردن ئەوەیە کەبلێ ی (سلام عليكم)وە سوننەتە (ورحمة الله) لەگەل بدەیت هەروەها (بركاته) لەگەلا بخوێنی جا ئەنجامی وەلامەکە ئەوها دەردەچێ (وعليكم السلام ورحمة الله وبركاته) .. وە ئەوەی سەلام دەکات باشتر وایە بلێ (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته ) وە واوی پێش (عليكم) کەواوی عەتفە پێویستە بلێی ،وە سەلام کردن و وەلام دانەوەکەشی دەبێ بەمانای

كۆمه‌ل بیّ واته (ضمیر)ی جه‌مع و كۆمه‌لّ به‌كار بیّنیّ ئه‌گه‌رتاكه كه‌سیّكیش بیّ به‌لّگه‌مان بۆئه‌و قسانه نوسیومانه ئه‌م ئایه‌ته‌ی خوای گه‌وره‌یه كه‌ده‌فه‌رمووێ
وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ (النساء ٨٦)

واته: ئه‌گه‌ر سه‌لامتان لیّ كراباشتر وه‌لاّمی بده‌نه‌وه یا به‌قه‌د خۆی)هه‌روه‌ها فه‌رمووده‌مان زۆره له‌م باره‌یه‌وه و ئه‌مانه هه‌ندیّكیانن :-

- له‌عیمرانی كوڕی حوسه‌ین ڕه‌زای خوایان لیّ بیّ (فه‌رمووی پیاویّ هاته لای پیّغه‌مبه‌ر ﷺ سه‌لامی كرد ووتی (السلام علیكم)جا پیّغه‌مبه‌ر ﷺ وه‌لاّمه‌كه‌ی داوه پیاوه‌كه دانیشت جا پیّغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی: ده (واته ده خیّری گه‌یشتیّ)پاشان یه‌كیّ تر هات ووتی (السلام علیكم ورحمة الله) پیّغه‌مبه‌ر ﷺ وه‌لاّمی دایه‌وه، پیاوه‌كه دانیشت جا فه‌رمووی بیست پاشان پیاویّكی تر هات ووتی (السلام علیكم ورحمة الله وبركاته) پیّغه‌مبه‌ر ﷺ وه‌لاّمی دایه‌وه، كابراش دانیشت جافه‌رمووی سی (رواه ابوداود) لیّره‌دا بۆمان ڕوون ده‌بیّته‌وه تا صیغه‌ی یا زاراوه‌كه‌ی سه‌لام زیاتر بخویّنی به‌سه‌ر موسلّمانان، ئه‌وه زیاتر خیّرو پاداشتی ده‌گاتیّ، له‌عائیشه (ڕه‌زای خوای لیّ بیّ) فه‌رمووی پیّغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی پیّم ئه‌وه جوبرائیله (فریشته‌ی وه‌حی) سه‌لامت لیّ ده‌كات منیش ووتم (وعلیه السلام ورحمة الله وبركاته) متفق علیه.

- له‌ئه‌نه‌سه‌وه (ڕه‌زای خوای لیّ بیّ)فه‌رمووی كاتیّ كه پیّغه‌مبه‌ر ﷺ قسه‌یه‌كی بفه‌رموبایه، سیّ باره‌ی ده‌كرده‌وه تالیّ ی تیّ بگه‌ن، كاتیّ كه ده‌چووه لای گه‌ل و قه‌ومیّ سه‌لامی لیّ ده‌كردن و سیّ باره‌ی ده‌كرده‌وه) رواه البخاري .

- لەئەبی ئومامە ﷺ فەرمووی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (باشترین و نزیك ترین خەلکان لەلای خوای گەورە ئەو کەسانەن کەسەلام لەپێشدا دەکەن)رواه ابو داود .جا ئەی برایانی موسلمان با ئێمە هۆشیارو وووریابین لەسەلام کردندا دەست پێشخەری بکەین بەوەی سەر لەموسلمانان و خزمان و دۆستان و جیرانان بدەین، وەسەلامی ڕێك و پێك و بەجێیان لێ بکەین[٢] ..

- لەئەبی هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: قەسەم بەو کەسەی ڕوح و گیانی بەدەستە ناچێتە بەهەشت هەتا ئیمان نەهێنن، ئیمان ناهێنن تاکو یەکتریتان خۆش نەوێ، ئایا پێتان نیشان بدەم کارێ ئەگەر ئەنجامی بدەن یەکترتان خۆش بووێ؟! سەلام زۆر لەیەکتر بکەن) رواه مسلم .

دیارە ئەگەر یەکێ خۆی لەکەس نەگەیەنێ وەیا لەمالەوە دانیشێ و تێکەلی خەلك و مەردووم نەبێ ..وەك کۆلەوارانی لەئاییی خوا بێ ئاگا، دەلێن حەقت لەکەس نەبێ، جا ئەگەر وابێ سەلاویش لەکەس ناکات دیارە خۆشەویستاتی خەلکیشی نابێ، لەئەنجامدا خۆشیشیان ناوێ، لەکۆتایشدا ئیمانی نابێ، ئەمەش بەلگەیە کەچاویشی بە بەهەشت ناکەوێ، ئەوجا باگوێ ڕایەلی فەرموودەی خواو پێغەمبەری خوا بین واز لەقسەو ووتاری کۆلەواران بینین.

## ٢- کێ سەلام لەکێ بکات؟

- لەئەبو هورەیرە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (سوار سەلام بکات لە پیادە، پیادە سەلام لەدانیشتوو بکات و ژمارەکەم لەژمارە زۆر سەلام

---

[٢]) ئەگەر لەکۆمەلێ سەلام کرا ئەوسا یەکێ یا زیاتر وەلامی دایەوەگوناهەکە لەسەر باقی ئەوانی تر لادەچێ چونکە فەرزی کیفیایە (فرض الکفایة) واتە ئەگەر چەند کەسێ پێی هەلبستن گوناه و واجبەکە لەسەر هەموویان لادەچێ..

بكات)متفق عليه. وه لەڕیوایەتێكی بوخاری هاتووه (بـچوك سـەلام لەگـەوره بكات).

- لەئەبوو ئیمامەوه(ڕەزای خوای لیّ بیّ ): (گـوتراوه ئـەی پێغەمبــەری خودا ﷺ دوو پیاو دەگەن بەیـەك كامـەیان زووتـرو پێـشتر سـەلام بكـات؟ فەرمووی كامەیان ئەولاتره بەخوای گـەوره ) رواه الترمـذي، لـەباوكی یوسـف (عبدالله كوڕی سـەلام)رەزای خـوای لیّ بـیّ فـەرمووی گـوێم لیّ بـوو بیـستم لەپێغەمبەری خودا ﷺ دەی فـەرموو: ئـەی كۆمـەلانی خـەلك و مـەردووم سەلام زۆر لەیەكتر بكەن و خواردن بدەن بەهەژاران و نەداران و یەكتر، صـیلەی ڕەحم بەجیّ بگەیـەنن، نوێـژ بكـەن كەخـەلك و مـەردووم نوسـتوون، دەچـنە بەهەشت بەبیّ چەندو چۆن، واتە بەئاشتی و بەسەلام) رواه الترمذی. لەتوفەیلی كوڕی ئەبو كەعب دەلیّ دەچوومە بـازارو بـەلای عبـدالله ی كـوڕی عومـەردا چووم هاتە دوام كەلەگەلما بێتە بازاڕ جا كەچـووینە بـازاڕ بـەلای هەركەسـیّ ڕانابوردین ئیللا عبدالله سەلامی لیّ دەكـرد كۆنـەفرۆش بایـە یـا فرۆشـیاری هەرشتیّ تربایە یاهەژار بایە، یا داماو بایە، منیش پێم ووت باشە چ ئـیش و كارت هەیە لەبازاڕ ئەتوو نەلەلای فرۆشیاریّ ڕادەوەستی وەنەپرسـیار لـەنرخی شت دەكەی و نەدادەنیشی لەمەجلیسەكانی بازاڕی و پێت دەلێم دامانیشینەو لێرانە باهەندیّ بدوێین و قسان بكەین؟ ووتی ئەی توفەیل من كەبەیانی هاتم بۆ بازاڕ تەنها لەبەر سەلام كردن بوو لەخەلك لەوەی دەیبینین و لەوەی لێی ڕاسـت دێین، لەئەبو ئومامـە صـودی كـوڕی عـەجلانی بـاهیی ڕەزای خـوای لیّ بـیّ فەرمووی پێغەمبەر ﷺ (فەرمووی ئـەولاترین و باشـترینی خـەلكان لـەلای خوای گەوره ئەوانەن كەلەپێشدا سەلام دەكەن)رواه ابوداود.

بزانن: نابێ سەلام لەئافرەت بکەین، بەتایبەتی ئەگەر بەتەنیا لەرێگا پێك گەیشتن، چونکە سەیر کردنی دروست نیە حەرامە ،جائەگەر سەیری نەکەی دیارە نازانی و لەوانەیە سەر بکێشێ بۆقسەرۆکی خەڵك یا پاش سەلامەکەی قسەکردن و ئەحواڵ پرسین و چاو لەچاوی یەك نان و ئەمانە گشتی حەرامن، چونکە سەرئەکێشێ بۆ دونیای خراپەکاری و فەساد، هەروەها هەر سەلام کردنێکی تر بێ بەنیەتی خراپ و نیازی بۆگەن و ببێ بەهۆی هەڵخەلەتاندن و فێڵ کردن و خیانەت کردن دروست نیە، جا لەئافرەت بێ یا گەنج بێ یا پیربێ یامنداڵ بێ ....هتد. چونکە سەلام دەبێ بەماناى خۆی بێ وەکو باسمان کرد و قەصدو نیەتی مانایە پڕپیت و پیرۆزەکەشی تیابێ ، هەر چەندە سەلام کردن سوننەتە بەڵام لەزۆر کات و شوێندا نابێ بەجێ بگەیەندرێ وەکو یەکێ دەست بەئاو دەگەیەنێ یاسەری خۆی دەشوا لەحەمامە یا نان دەخوات و کاتی خواردنە یا لەدەرس خوێندن دایە وەئەمانەش لەسەریان نابێتە ئەرك و واجب کەوەڵاّم بدەنەوە، وەدەتوانن پاش کۆتایی پێ هاتنی کارەکە سلاّو وەرگرنەوە.

سەلام کردن لەمنداڵان سوننەتە، لەئەنەسەوە کاتێ کەبەلای منداڵان رائەبوارد سەلامی لێ دەکردن و دەی فەرموو پێغەمبەر ﷺ سەلامی لەمنداڵان دەکرد) متفق علیە.

هەروەها سەلام کردن لەکۆمەڵی ژنان دروستە بەمەرجێ مەترسی هیچ فیتنەیەکی لێ نەکرێ وەکو لەئەسماء کچی یەزید فەرمووی پێغەمبەر ﷺ بەلاماندا تێ پەڕی ئێمەش کۆمەڵێ بووین لەژنان سەلامی لێ کردین﴿٧﴾

## ٤- سەلام كردن ڕەوشتی پیاوچاكانە

خــوای گــەورە لــەدوا ڕۆژا ســەلام لەئــەهلی بەهەشــتیان دەكــات وەك لەسوڕەتی (یس)دا دەفەرموێ(سلام قولا من رب رحـيم)٥٨، هــەروەها خــوای گــەورە بۆمــان دەگێڕێتــەوە كەســەلام كــردن لەخوڕەوشــتی بەهەشــتیانە وەك دەفـــــەرمووێ ﴿لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا ۝٢٥ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا ۝٢٦﴾ الواقعە ئایەتی ٢٥-٢٦

واتە: (لەناو بەهەشتدا لەغوەو قسەی زیادیـان گـوێ لێ نـابێ و توشـی تاوان و ناڕەحەتی نابن بەڵكو تەنها پێیان دەوترێ سەلام و ڕەحمەتی خواتان لێ بێ بەهەشتتان پیرۆز بێ ).

هەروەها فریشتەكان پێشوازی لەئەهلی بەهەشت دەكەن و سلام و پیرۆزباییان لێ دەكەن دەڵێن فەرموون بۆ بەهەشت هەتا هەتایێ بمێننەوە ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ۝٧٣﴾ (سورەتی الزمر ٧٣).

لەعبدالله ی كوڕی عەمری كوڕی عاص (پیاوێ پرسیاری لە پێغەمبــەری خوا ﷺ كرد كامە كارو خوڕەوشت لەئیسلامدا باشترین و خێرترین شــتێكە؟ فەرمووی خواردن بەخشین و سەلام كردن لەو كەسەی دەیناســی و نایناســی) متفق عليه.

وەكاتێ میوانە بەڕێزەكانی حەزرەتی ئیبراهیم (عليه الـسلام) (كــەبریتی بوون لەچەند فریشتەیەك)هاتنە لایــی و ســەلامیان لێ كــرد ئــەویش وەڵامــی

ســـه‌لامی دانـــاوه ) هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٤﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَـٰمًا ۖ قَالَ سَلَـٰمٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٢٥﴾ (سوره‌تی الذاريات ٢٤-٢٥)،

له‌ئه‌بو هوره‌یره‌وه پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌روویه‌تی له‌و كاته‌ی كه‌خوای گه‌وره حه‌زره‌تی ئاده‌می خه‌لق كرد، پێی ووت برۆ سه‌لام له‌و كۆمه‌ڵه فریشته دانیشتووه بكه، وه‌گوێ بگره‌و ببیسه له‌وه‌ی كه‌حه‌زت لێ یه‌تی و خۆشتیانی ده‌وێ جا ئه‌مه سه‌لامی تۆیه، وه‌سه‌لامی نه‌وه‌و وه‌چه‌ی تۆیه، جاووتی (السلام علیكم) فریشته‌كان وه‌لاٌمیان دایه‌وه به‌(السلام علیكم ورحمه الله) له‌وه‌لاٌمه‌كه‌دا (ورحمة الله) یان بۆ زیاد كرد.متفق علیه.

هه‌روه‌ها خوای گه‌وره ده‌فه‌رمویّ (ئه‌گه‌رچوونه ماڵیّ سه‌لام له‌خانـه‌واده‌ی ئه‌و ماڵه بكه‌ن به‌سه‌لامیّ كه‌له‌لای خواوه بیّ، پیرۆزو موبـاره‌ك و پـاك و بـیّ گـه‌ردبیّ) هـه‌روه‌ها سـوننه‌ته ئـاده‌میزاد كـاتیّ كه‌گه‌ڕایـه‌وه ماڵـه‌وه سـه‌لام له‌خانه‌واده‌ی ماڵه‌وه بكا كه‌مایه‌ی خۆشه‌ویستی و به‌ره‌كه‌ته بۆ هـه‌موو لایـه‌ك له‌و خانه‌واده، وه‌ك پێغه‌مبه‌ر ﷺ به‌ئه‌نـه‌س ده‌فـه‌رمویّ(ئـه‌ی ڕۆڵـه ئه‌گـه‌ر چوویته ماڵه‌وه سه‌لام له‌خانه‌واده‌ت بكه، ده‌بێته به‌ره‌كه‌ت و ڕه‌حمه‌ت بۆ خـۆت و بۆكه‌سانی ماڵه‌وه‌ت.. رواه الترمذي .

چه‌ند كـه‌س له‌ژیانـداجاران ڕقمـان لیّ بۆتـه‌وه كـاتیّ كه‌هاتۆتـه لامـان سه‌لامی كردووه، ئـیتر ڕق و كینه‌كـه‌ی دلّمـانی بـاری كـردووه خۆشه‌ویـستی شوێنی گرتوته‌وه، وه‌به‌پێچه‌وانه چـه‌ندین كـه‌س بـه‌لامان تێپـه‌ریوه سـه‌لامی نه‌كردوه ڕق و قینه له‌ئاستیا هه‌ولی داوه بێتـه دلمـان وه ووتومانـه ته‌ماشـای بكه، هه‌ر سه‌لامیشی نه‌كرد ؟!

له‌باوكی عه‌ماره‌وه بـه‌رائی كـوری عـازه‌ب ره‌زای خـوای لیّ بـیّ ووتـی

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردوین بەحەوت شت :

أ- بەسەردانی نەخۆش :- بەشێوەیی کەمایەی ئاسوودەیی و دلخۆشی نەخۆشەکە بێ و ئەگەر دیاری لەگەل خۆمان ببەین باشترەو دوعای خێری بۆ بکەین هەراسانی نەکەین، بەزۆر لەلادانیشتن یا بۆنی ناخۆش یا بەقسەوگوفتارێ یا بەهەر شتێکی تربێ.

ب-ئامادەبوون و بەدوا کەوتنی تەرمی برای موسلمانت، کاتێ دەمرێ و بەرەو گۆرستان دەیبەن ،بەشێوەیەك کەببێ بەمایەی کۆمەکی و دل دانەوەی خاوەن مردووەکە ،وەبیر کردنەوە لەرۆژێ کەتۆش ئەوها هەلدەگرن بەرەو گۆرستان دەتبەن،دیارە کەس و کاریشت پێان خۆشە خەلك بەکۆمەکیانەوە بێ.

ج- دوعای خێر بۆ ئەوەی بپژمێ :واتە ئەوەی دەپژمێ پێویستە بلێ (الحمدلله) ئەوسا ئەوەی گوێ ی لێ یە بلێ (یرحمك الله) ئەویش دوعای خێری بۆ بکا بلێ (یهدیك الله ویصلح بالکم) واتە خوا هیدایەت و رێنمایت بکات و حالت چاك و باش بکات .

د- یارمەتی دانی بێ هێزو زەعیف :رزگار کردنی ئەمانە بەپێ ی توانا پێویستە، جالە هەر رووێکەوە بێ، لەرووی پارەو پول و ماددە بێ، یا بەرووی زانست و زانیاری بێ، یا لەرووی ستەم و زولمی زالمان بێ،..هتد

ه-یارمەتی دانی ستەم لێکراو، رزگار کردنی دەبێ گەورە ئاواتی ئیماندار بێ ، چونکە مایەی رازی کردنی خوایە و خوای

گەورە حەرامی کردوە لەنێو مەخلوقدا ستەم و زولم کردن ،وە ئەو کەسەی خۆش ناوێ کەیارمەتی ستەم لێکراوو لێقەوماوان نادات .

و- سەلام زۆر لەیەك کردن : بەو شێوەی کەباسمان کردووە و مەبەستی

خوای گەورە بێ و ڕەزامەندی ئەو بـێ، وەئومێـدی پاداشـتی ئـەو بـێ، ببـێ بەمایەی خۆشەویستی و تەبایی ·

ز- بەجێ گەیاندنی سوێندو بەڵێنـەكانی ﴿٨﴾ :دەبـێ موسـلمان سـوێند تەنها بەخوای گەورەو سیفەتەكانی بخوات بـۆ مەبەسـتی چـاكەو كارچـاكی و دڵنیـاكردنی خـەڵك لەڕاسـتی دروسـتیدا، نـابێ سـوێند بەغـەیری خـودا و سـیفەتەكانی بخـورێ جـا هـەر شـتێ بـێ دەبـێ موسـلمان سـوور بـێ لەسەربەجێگەیاندنی سـوێند و بـەڵێن و قـسەكانی بـۆ خزمـەتی موسـلمانان چونكە مایەی ڕێزو عیزەت و كەرامەت و ئیمانە .

بـرای موسـلمان بـا لەكۆمـەڵی پیـاو چـاكان دەرنەچـین و، ئاگامـان لەخورەوشـت و حـەقی موسـلمانان بـێ بەسـەرمانەوە، هـەروەها ئاگامـان لەبەرنامەی ئاینەكەمان بێ، چونكە هەر ئەم ڕێگایە مایەی بەختەوەری دونیاو قیامەتمانە .

## ٥- سەلام كردن لەكاتی بەیەك گەیشتن و لێك جیابوونەوە.

سەلام لەیەك كردن چۆن سوننەتە لەبەیەك گەیشتندا، ئـاواش سـوونەتە لەجیابونەوە...لەئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ فـەرمووی پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی (ئەگەر یەكێ لەئێوە چوو بۆ مەجلیسێ بـا سـەلام بكـا، ئەوسـا كاتێك ویستی هەڵبستێ و بڕوا باسـەلام بـۆ ڕۆیـشتنەكەش بكـا، سـەلامی سەرەتا لەسەلامی كۆتایی باشتر نی یە )رواه ابو داود .

جا سەلام كردن و وەلامدانەوەی چۆنە لەسەرەتای بەیەك گەیـشتندا هـەر ئاواشە لەكاتی لەیەك جیابوونەوە و مەجلیس بـەجێ هێـشتن، هـەروەها لـە

ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لیّ بیّ فەموویەتی (پیّغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ئەگەر یەكیّ لەئیوە بەبراكەی موسلمانی گەیشت با سەلامی لیّ بكا جا ئەگەر داریّك یا بەردیّك یا دیواریّ كەوتە نیّوانیان دیسان بەیەك گەیشتنەوە، با دووبارە سەلامی لیّ بكاتەوە)رواه ابوداود.

سوننەت بەجیّ گەیاندن مایەی نزیك بوونەوەیە لەخوداو مایەی پاداشت زۆر بوونە لەڕۆژی دوایی، هەروەها لەدونیاش هەزارەها حیكمەتی جۆراو جۆری تیایە و لەهەمان كاتیشدا شورەیەكە ئیمانی خۆی پیّ دەڕازیّنیّتەوە و بۆیە موسلّمان سوننەتەكان ئەقۆزیّتەوەو بەزایەیان نادات.

هەروەها (پیّغەمبەر ﷺ دەفەرمویّ ( سەلام لەعارەق خۆر مەكەن، مەچوونە لایان ئەگەر نەخۆش كەوتن، وەنویّژی مردوویان لەسەر مەكەن كەمردن) بەلّیّ سەلام كردن لەعارەق خۆر یا كەسانیّ هاو ویّنەی لەگوناه و تاواندا دروست نیە بەتایبەتی ئەگەر بەحەلالی بزانیّ یا واتیّ بگات تۆڕیّرت لیّی ناوە، ئەویش بەموسەققەفی خواردیتیەوە، بەلّیّ ئەگەر زانیت سەلامەكەت دەیهیّنیّ بۆلای ئیسلام و ئومیّدی ئەوەی لیّ دەكریّ كەواز لەئارەق خواردن بیّنیّ یا واز لەگوناه و تاوانی بیّنیّ ئەوە دروستە سەلامی لیّ بكەی، و بەقەصدو نیەتی ڕزگاركردنی لەكاری بیّ شەرعی، هەروەها ئەگەر كۆمەلّیّ لەموسلّمانان و كافران بەیەكەوە دانیشتون دروستە سەلامیان لیّ بكەی بەنیەتی موسلّمانەكان بەتەنها ، ( لەئوسامە (پیّغەمبەر ﷺ ڕابوورد بەسەر مەجلیسی موسلّمانان و موشریك و بت پەرست و جوولەكە تیّكەلاّو ببون سەلامی لیّ كردن) رواه الترمذی والبخاری تاج٢ ل (٢٥٠) هەروەها لەبیرمان نەچیّ ئیّمە ڕۆژیّ نۆ جار لەنویّژە فەرزەكان سەلام لەخوای گەورە دەكەین،

ئەگەر نوێژە سوننەتەکانیش بکەین بەقەد ژمارەی (تەحیات)ەکان سەلام لەخوای گەورە دەکەین کاتێ دەڵێین (التحيات لله والصلوات والطيبات والبركات) واتە: ئەی پەروەردگار هەموو ژیان و مانەوەیەك هەر شایستەی تۆیە هەروەها هەموو ڕەحمەت و پاکی و بێ گەردی و پیرۆزی هەر شایستەی تۆیە، هەر هی تۆیە، باهەژاران و غەریبان و داماوانی ناو گۆڕەکانیشمان لەبیرو یاد نەچێ و فەرامۆشیان نەکەین، کەسەلام کردن لەوانیش سوننەتە کاتێ کەبەلای گۆڕەکانیانا ڕائەبورین وەکو (پێغەمبەر ﷺ فەرامۆشی نەکردوون سەلامی لێ کردوون ، لەئەبو بوریدە ڕەزای خوای لێ بێ (پێغەمبەر ﷺ فێری دەکردین کاتێ کەدەردەچووین بۆلای قەبرستانان بلێین (السلام عليكم اهل الديار من المؤمنين والمسلمين وانا ان شاء الله بكم لاحقون، اسال الله لنا ولكم العافية) رواه مسلم، واتە: سەلامتان لێ بێ خاوەنی گۆڕستان لەئیمانداران و موسڵمانان وە ئێمەش (ان شاء الله)بە ئێوە دەگەین وەلەخوای گەورە داوا دەکەم عافیەت و خۆشی بدا بەئێمەو ئێوە.

## ٦-سەلام کردن لەکاتی مۆڵەت وەرگتندا

خوای گەورە لەسوڕەتی نوڕدا دەفەرمووێ: ئەی ئەوکەسانەی ئیمانتان هەیە مەچوونە ماڵێ کەماڵی خۆتان نەبێ تا بێدارو ئاگاداریان نەکەنەوە و ئیزن و روخصەتیان لێ وەرنەگرن و جا سەلامیان لێ بکەن لەئەهل و خانەوادەی ماڵەکە ئەمە بۆ ئێوە خێرترو باشترە تکاتان وابێ یادی خوای گەورە بکەنەوە، وەئەگەر کەسێکتان چەنگ نەکەوت لەماڵەکەدا بێ (بەوەی سێ جار لەدەرگاتان داو کەس نەهات)مەچوونە ژوورەوە هەتا ئیزن و مۆڵەت

ده‌درێن، ئه‌گه‌ر پێتان ووترا بگه‌ڕێنه‌وه ئیش و كارمان هه‌یه یا ئه‌گه‌ر ته‌نها ووتیان بگه‌ڕێنه‌وه، ئه‌وا بگه‌ڕێنه‌وه ئه‌مه بۆ ئێوه پاكتره، وه خوای گه‌وره به‌كارو كرده‌وه‌یێ ئێوه ده‌ی كه‌ن ئاگادارو زانایه ) يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ ۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُواْ فَٱرْجِعُواْ ۖ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨﴾ النور

ئه‌گه‌ر ئێمه ئاگاداری ئه‌و ئامۆژگارییه جوانانه‌ی خوای گه‌وره بین له‌ده‌یان گیروگرفتی كۆمه‌لآیه‌تی ڕزگارمان ده‌بێ، ئه‌گه‌ر به‌جوانی لێی تێ بگه‌ین كاری پێ بكه‌ین، سه‌ره‌ڕای ڕزگاربونیشمان جوانترین خوره‌وشتمان بۆ پێك دێ ڕه‌زامه‌ندی خوای گه‌وره‌ش له‌وێ بوه‌ستێ، له‌ئه‌بوو موسی ئه‌شعه‌ریه‌وه ووتی : (پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی: ئیزن وه‌رگرتن سێ جاره (سێ جار له‌ده‌رگادانه یا ئاگادار كردنه‌وه‌یه ) ئه‌گه‌ر ئیزن و مۆڵه‌تت وه‌رگرت باشه ده‌نا بگه‌ڕێوه) متفق علیه، هه‌روه‌ها نابێ سه‌یری ناو ئه‌و ماڵه بكه‌ی پێش ئیزن و مۆڵه‌ت وه‌رگرتن جا له‌كونی ده‌رگاوه‌بێ یا له‌هه‌رشوێنێكی تربێ .له‌سه‌هلی كوڕی سه‌عد ڕه‌زای خوای لێ بێ ووتی (پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی ئیزن و مۆڵه‌ت وه‌رگرتن له‌پێناوی ئه‌وه‌یه بۆ ماڵیان بچێت و دیاره له‌مه‌شدا چاوت ده‌كه‌وێ به‌ماڵیان و به‌حاڵیان ،له‌روبعی كوری خیراش ووتی :پیاوێ له‌به‌نی عامر داوای ئیزن و موله‌تی كردووه له‌پێغه‌مبه‌ر ﷺ كه‌له‌ماله‌وه بووه جاووتی بێمه ژووره‌وه؟ جا (پێغه‌مبه‌ر ﷺ گووتیه خادیمه‌كه‌ی برۆ فێری ئیزن و موله‌تی

وەرگرتنی بکەو پیّ ی بلیّ سەلام بکە بە(السلام علیکم) ئایا بیّمە ژوورەوە؟ جا (پیّغەمبەر ﷺ ئیزنی داو ئەوسا هاتە ژوورەوە) رواه ابو داود ئیزن و مۆلەت وەرگرتن فەرمانی خواو پیّغەمبەرە و لە خورِەوشتی جوانە مایەی رِیّزو قەدر وەرگرتنە، وەبنەبرِ کردنی دەیان گیرو گرفتە ..وەئەگەر ئیزن و مۆلەتمان داواکرد بەوەی لەدەرگاماندا وەیەکیّ هات ووتی تۆ کیّ ی؟ مەلیّ منم بەلکو ناوی خۆت بیّنە بەشیّوەیەکی وا کەبەباشی بتناسیّ و گومانی نەبیّ و نەمیّنیّ لەناسینت ..لەجابر رەزای خوای لیّ بیّ چووم بەلای (پیّغەمبەر ﷺ لەدەرگام دا فەرمووی ئەوە کیّە؟ ووتم منم فەرمووی منم منم (بەشیّوەیەکی پیّ نارازی بوون) متفق علیه. هەروەها لەم بارەوە ئەنەس رەزای خوای لیّ بیّ لەفەرموودە مەشهورەکەی ئیسرادا دەگیّرِیّتەوە دەفەرمویّ (پیّغەمبەر ﷺ فەرمووی پاشان لەگەلّ جوبرائیل بۆ ئاسمانی دونیا چووین لەدەرگایدا پیّی ووترا ئەوەکیّیە؟ فەرمووی جوبرائیلە فەرمووی ئەوە کیّیە لەگەلّتا ووتی موحەممەدە، پاشان بۆئاسمانی دووەم لەدەرگایدا ووتیان ئەوە کیّیە؟ ووتی جوبرائیلە ووتی ئەوە کیّیە لەگەلّتا ووتی موحەممەدە،هەروەها لەدەرگاکانی سیّ یەم و چوارەم و باقی دەرگاکانی تر هەر بەم شیّوەیە پرسیاریان دەکرد ئەوە کیّیە ؟ئەی ووت جوبرائیلە ﴿٩﴾ متفق علیه.

# ئادابی مەجلیس

## ١- پێویستە بزانین:

موسڵمان زۆر پێویستە لەهەموو ڕوویێکەوە شارەزای ئایینی پیرۆزی خۆی بێت، تاوەکو بتوانێ لەهەموو لایەکەوە دەرگا لەشەیتان و سەربازەکانی دابخا و ئیمانەکەی بەجوانی و پاکی بپێڵێتەوە تاکو بەهەمیشەیی بتوانێ شیرینی ئیمان نۆش بکـا و بەختـەوەری و ڕووسـپیاتی دوا ڕۆژیـش زیـاتر بەرئومێـد بکـات ،ئایینی پیرۆزی ئیسلامیش هیچ لایەن و ڕوویێك نەماوە باسی نەکردبێ چـارەی گـیرو گرفتـەکانی بـۆ دانـەنابێ لەوانـەش ئـادابی مـەجلیس، خـوای گـەورە دەفەرمووێ(ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە، تەقوای خـوای گـەورە بکـەن وەلەگـەڵ ڕاسـت گۆیـان بـن )يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ التوبه

چونکە ڕاست گۆیی پاکی دڵ و چاوو گوێ دەپارێزێ و لەسروشتی خۆیان دەهێڵێتەوە، بەڵام درۆو بوختان و غەیبەت و نەمیمی لەغوەو قسەڕۆکی زیادو بێ مانا سروشتی پاکیان تێك دەداو بەرەو ئەنجامێکی خراپیان دەبات و خـوای گەورە لەبارەی بەنی ئیسرائیلیەکانەوە دەفەرمووێ (زۆر گوێیان لەدرۆ گرتـووە لەکەسانێ کەنەچوونەلای (پێغەمبەر ﷺ وەهیچ زانیاریان بەئایینەوە نیە تـا سەرەنجام خوای گەورە خەشم و قینی لێ گرتون و خواست و ئیرادەی هاتە سـەر ئەوە کەدڵیان پاك نەکاتەوەو لەدونیا تووشـی ڕیـسوایی و بـێ نرخـی کـردوون

وه‌له‌رۆژی دوایشدا ئه‌شكه‌نجه‌و عه‌زابی گه‌وره‌ی بۆ دانـاون ﴿١٠﴾ بـرای موسڵمان گوێ گرتن له‌درۆ به‌ڕاستی فیتنه‌و موسیبه‌تێكی گه‌وره‌یه ئه‌ی ده‌بـێ درۆكردن چۆن به‌ڵایه‌ك بـێ ﴿١١﴾ هـه‌روه‌ها لـه‌بوختان و لـه‌غوه‌و غه‌یبـه‌ت و نـه‌میمی و ،ته‌نانـه‌ت له‌باسـی غه‌یبه‌تـدا هـاتووه كـه (پێغه‌مبـه‌ر ﷺ ده‌فه‌رمووێ (غه‌یبه‌ت كارو گـوێ گـری هاوبه‌شـن لـه‌گوناه و تاوانـدا ﴿١٢﴾ هـه‌روه‌ها موسـڵمان نـابێ لـه‌كۆڕو مه‌جلیسـێ دابنیـشێ، كه‌ئیهانـه‌و قـسه‌و قـسه‌ڕۆكی وای تیـابێ به‌رامبـه‌ر بـه‌خوای گـه‌وره‌و ئایینـه پیرۆزه‌كـه‌ی یـا (پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی یا به‌شـێك له‌ده‌سـتورو به‌رنامه‌كـه‌ی بزانـه‌خوای گـه‌وره چـی ده‌فه‌رمووێ له‌سوره‌تی النساء له‌ئایه‌تی ١٤٠دا .

(بێ گومان ئێمه دامان به‌زاندووه له‌كتێبدا بۆ سەر ئێوه ئه‌گـه‌ر گوێتـان لێ بوو (بیستان)بێ باوه‌ڕی و كوفر ده‌ربڕا به‌نیشانه‌و ئایه‌ته‌كانی خوای گـه‌وره، گاڵته‌و گه‌پی پێ كرا دامه‌نیشن له‌لایان و گوێیان مه‌ده‌نێ هـه‌تا ئه‌چـنه سـه‌ر باس و خواسێكی تر، ده‌نا ئێوه‌ش وه‌ك ئه‌وانن) ئه‌و ڕێگایانـه‌ی دڵ و ده‌روونـی پێ پاك ده‌بێتـه‌وه وه‌یـا پێـی پـیس و پۆخـڵ ده‌بـێ چـاوو گوێـچكه‌و زمانـه به‌سه‌رۆكایه‌تی عه‌قل و ژیری وه‌كو خوای گه‌وره ده‌فـه‌رمووێ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ اسراء

(له‌سه‌ر كارو ووتارو به‌رنامه‌یێ مه‌بـه كـه‌زانیاریت پێیـه‌وه نـه‌بێ بزانـه به‌ڕاستی گوێ و چاوو دڵ ئه‌وانه گـشتیان به‌سـه‌ر تـۆوه به‌رپرسـیارن ). بـه‌ڵێ ئاده‌میزادی موسڵمانی هۆشیار حه‌زناكات وێنه‌یه‌ك له‌وێنه‌كانی چاوو مێشك و فكریا بێ، جێگه‌ی ڕه‌زامه‌ندی خوای گه‌وره نه‌بێ ،یا ده‌نگ و بـاس و قـسه‌یێ له‌شریتی تۆمار كراوی له گوێچكه‌یدابێ یـا خـه‌یاڵات و گومـانی لـه‌دڵیا بـێ

كه‌جێگه‌ی خه‌شم و قینی خوای گه‌وره بێ، خۆ شك و گومانی تیا نیه مه‌جلیسه‌كانی ئێستای دونیا زۆربه‌ی هه‌ره زۆریان له‌هه‌موو ڕوو لایه‌نێكه‌وه به‌خواست و كه‌یفی شه‌یتان و شه‌یتانیه‌كانن و له‌غوه‌و درۆ ته‌مانه هه‌مووی له‌لایه‌ك، له‌لایه‌كی تره‌وه باسی خواو پێغه‌مبه‌ر ﷺ ناكرێ .باس هه‌ر باسی ورگ و گیرفان پڕكردنه دونیاو دونیا په‌رستنه خه‌ڵكانی بێ ژماره ئه‌مڕۆ كۆڕو مه‌جلیسیان له‌گه‌ڵ صحن و ته‌له‌فزیۆنایه، هه‌موو هه‌ست و نه‌ستی خۆیانیان داوه‌تێ، هه‌موو چاوو گوێچكه‌یان داوه‌تێ زۆر كات و ساتی خۆیان پێ ده‌كوژن كردویانه به‌هۆكارێك بۆ كات پێ كوشتن بێ ئه‌وه‌ی بیری لێ بكه‌نه‌وه سه‌ره‌نجام چی ده‌بێ چی نابێ؟ حه‌یاو ئه‌خلاق ئه‌ڕمێنێ ڕێزو حوه‌ت ده‌چوێنێ ڕووتی و قووتی ده‌نوێنێ، تۆی مێ بازی ده‌چێنێ، فێره كوشتن و دڵ ڕه‌قی ده‌كات، له‌بۆ دزین و ته‌ماعی ده‌بات، تووشی دونیا په‌رستی ده‌كات له‌بیری ده‌چوێنێ، ڕێگاكه‌ی نه‌جات، بۆ دونیای فانی و غه‌فله‌تی ده‌بات له‌ڕێی خوای گه‌وره‌ی ته‌واو ده‌رده‌خات، ئاییني چاكی له‌بیرا ده‌بات (يعلمون ظاهرا من الحياة الدنيا وهم عن الاخرة هم غافلون) الروم/٧ (پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رمووێ: له‌هه‌ر شوێنێ كۆڕو مه‌جلیس ببه‌سترێ و دروست ببێ وه‌ناوی خوای گه‌وره‌ی تیا نه‌هێنرێ و صه‌لاوه‌ت له‌سه‌ر محمد ﷺ لێ نه‌درێ ئه‌وه جۆره حه‌سره‌ت و نه‌دامه‌ت و په‌شیمانیه‌ك به‌سه‌ر داده‌بارێنێ، جا ئه‌شكه‌نجه‌و عه‌زابی ئه‌و كه‌سه ده‌دا كه‌خواستی لێ بێ وه له‌و كه‌سه‌ش خۆش ده‌بێ كه‌خواستی لێ بێ) رواه الترمذي.

## ٢- رووكردنە مەجلیس و هەڵسان :

یەكێ لەمامۆستایان ئامۆژگاری كوڕەكەی دەكات دەفەرمووێ: كوری خۆشەویستم، هەر كاتێ خوێندتەوە یا بیستت لەقورئانی پیرۆز (یایها الذین امنوا) واتە: " ئەی ئەو كەسانەی ئیمانتان هەیە" بزانە ئەمە لەگەل تۆیەتی چونكە تۆ خاوەن ئیمانی، دلی بۆ بكەرەوە بزانە خوای گەورە چۆن فەرمانێكت پێ دەكات ..خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمۡ تَفَسَّحُواْ فِي ٱلۡمَجَٰلِسِ فَٱفۡسَحُواْ يَفۡسَحِ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ۝١١﴾ سورة المجادلة /١١، (ئەی ئەو كەسانەی ئیمانتان هەیە ئەگەر پێتان ووترا فراوانی و گوشادی بخەنە مەجلیسەكەتان، وابكەن خوای گەورە گوشادی و فراوانیتان پێ دەبەخشێ، ئەگەر پێتان ووترا فەرموون بڕۆن؟ ئێوەش بڕۆن، خوای گەورە ئەو كەسانەی خاوەن ئیمانن بەرز دەكاتەوە و ئەو كەسانەی خاوەن زانیارین بەچەند پلە و دەرەجەیێ، خوای گەورە ئاگادارو شارەزایە بەكارو كردەوەیی كە ئێوە دەی كەن) .

هەروەها پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرمووێ: (كەس لەئێوە ئادەمیزادێ هەلنەستێنێ، پاشان بەخۆی لەجێگەی دابنیشێ، بەلكو گوشادی و فراوانی بخەنە مەجلیستان، كوری ئیمامی عومەر گەر یەكێ لەبەری هەلبسابایە لەشوێنی دانەدەنیشت)متفق علیە.

ئەگەر یەكێ میوانی هات، بۆ خۆشەویستی وڕێز لێ گرتن لەشوێنی خۆی

دانا، بردی بۆ سەرووی جێگەی دانیشت ئەوە دروستە و سوننەتە، هەرچەند بەرێزی و بەرزی لەئیسلامدا بەسەروو خوارووی مەجلیسی نی یە (پێغەمبەر ﷺ شوێنێکی دیاری کراوی نەبوو لەمەجلیسدا بەلکوهەر شوێنی خالی و بەتال بایەو بۆی برەخسابایە لێ ی دادەنیشت) جابری کوری سەمورە رەزای خوای لێ بێ ووتی ئێمە کەدەچووینە لای (پێغەمبەر ﷺ هەریەکەمان لەو شوێنە دادەنیشتین کەرێزی دانیشتوانی پێ کۆتایی هاتووە)رواە ابو داود .

لەباوکی عبدالله کەسەلمانی فارسی یە رەزای خوایان لێ بێ فەرمووی (پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (هەر پیاوێ خۆی بشۆرێ لەرۆژی جومعە دا و خۆی پاك بکاتەوە ، خۆی رێك و پێك و پوختە بکات، پاشان ئەوەی ئەرك و واجبیەتی بیکات، بێ دەنگ بێ لە کاتێکا کە ئیمام وتار دەدا ئیللا خوای گەورە گوناهەکانی بەینی ئەم جومعە و جمعەی رابردوو دەبسوورێ) رواە البخاري.

هەروەها پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ : (حەلال نی یە بۆ پیاوێ جیایی بخا، لەنێوان دوو کەسی دانیشتوو لەتەك یەکا ،مەگەر ئیزن و مۆلەتیان لێ وەرگرێ ) رواە ابو داود.

هەروەها دەفەرمووێ ﷺ (نەفرەت و نەعلەت لەو کەسەی کەلەناوەندی بازنەو حەلقەی دانیشتوان دادەنیشێ) رواە ابو داود.

ئەبوو سەعید خودری رەزای خوای لێ بێ فەرمووی گوێم لێ بوو و بیستم لەپێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو (باشترین مەجلیس ئەوەیە گوشادو فراوان بێ ) رواە ابو داود..ئاینی پیرۆزی ئیسلام زۆر بەتەنگی مەردووم و خەلکەوەیە داوایان لێ دەکات بۆ گوشادی فراوانی، چونکە لە تەسکی و تریسکیدا

ئادەمیزاد نارەحەت دەبێ و ئیسراحەت ناکاو پێ ی ئاسوودە نابێ .

لەئـەبوو هـورەیرەوە رەزای خـوای لێ بـێ فـەرمووی (پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی ﴿١٣﴾(هەر کۆرو کۆمـەل و مەجلیـسێ لەدانیـشتنکەیانا یـادی خوای گەورەیان نـەکردبێ، ئـیللا وەك لەسـەر کەلاشـەی کـەرو گـوێ درێـژی تۆپیوو، هەلّستابن وایە رۆژی قیامەت دەبێتە داخ و حەسرت و نەدامەت) رواە ابو داود.

## ٣- باشترین مەجلیس :

باشترین مەجلیس ئـەو مەجلیـسەیە کەئەنجامەکـەی پـاکی و پـیرۆزی و بەرەکەت و رەحمەتی خودای گەورەی تیابێ، مایـەی ڕەزامەنـدی ئـەو بێـت و خێری دونیاو قیامەتی تیابێ .لەمانە مەجلیسێ کەباس و یادی خوای گەورەی تیـابێ ،وەك ئـەبو هـورەیرە رەزای خـوای لێ بـێ لەپێغەمبـەری خـودا ﷺ دەگێرێتەوە و فەرموویەتی (خودای گەورە چەند فریشتەیەکی تایبەتی دانـاوە، دێن و دەچن لەرێگایان موشتاق و ئیشتاقی کۆرو مەجلیسێکن کەیادو زیکری خوای گەورە دەکەن، بانگ دەکەن لـەنێوان خۆیانـا وەرن بەپەلـە کۆبنـەوە بـۆ پێداویستیەکان ،جا دەوریان لێ دەدەن وە بەبالەکانی خۆیان دایان دەپۆشـن تـا ئاسمانی دونیا دادەگرێ و بەرز دەبێ ،جا پرسیاریان لێ دەکـات پـەروەردگاریان (وەخۆی زاناترە لەهەموو کەسێ) چ دەلێن بەندەکانی من دەلێن تەسبیحی تـۆ دەکەن (سبحان الله دەلێن) وەتەکبیری تۆ دەکەن (الله اکبر دەلـێن)وە حەمـدی تۆ دەکەن (الحمدللـه دەلـێن) وە تەمجیـدی تـۆ دەکـەن (بـەپاکی و بـەرزی تـۆ هەلدەدەن)پەروەردگار دەفەرمووێ ئایا منیان دیوە ؟دەلێن قەسەم بـەتۆ نـەیان

دیوی جا دەفەرمووێ :دەی باشە ئەگەر ببینن دەلێن ئەگەر بتبینن زیاترو زۆرتر عیبادەتی تۆ دەكەن زۆر بەپاكی و بەرزی تۆوە هەلدەلێن و زۆرتر تەسبیحی تۆ دەكەن ..پەروەردگار دەفەرمووێ چی داوادەكەن؟ دەلێن نەخێر قەسەم بەخوا نەیان دیوە .دەفەرمووێ ئەی باشە ئەگەر بیبینن چۆن دەبێ؟ فەرمووی دەلێن ئەگەر ئەوان بەهەشتیان بدیتبایە زۆر سوور دەبوون لەسەر داواكردنی، وەخواست و رەغبەتیان بۆ زیاتر دەبوو دەفەرمووێ داوای لەچی خۆ پاراستنێ دەكەن؟ ووتی دەلێن داوای خۆپارێزی و پەنا دەگرن لەتۆ لە ئاگری دۆزەخ ..دەفەرمویێ ئایا ئاگری دۆزەخیان دیوە؟ فەرموی دەلێن نەخێر..قەسەم بەخوا نەیان دیوە جادەفەرمویێ باشە ئەگەر بیبینن چۆن دەبێ؟! فەرمووی دەلێن ئەگەر ببینن زۆرتر لەبەری رادەكەن و لێ دەترسێن و خۆیانیان پێ لەتۆ دەپارێزن و زیاتر پەنا دەگرن بەتۆ ..دەفەرمووێ ئەی فریشتەكان من ئێوە بەشایەد دەگرم كەمن بێ گومان لەو دانیشتوانە خۆش بووم، فەرمووی فریشتەیێ لەفریشتەكان لەناویان دەلێ ئەی پەروەردگار ئەوە فلان كەسە لەوان نی یە بەلكو بۆ پێداویستی خۆی هاتووە؟ پەروەردگار لەوەلاّمیدا دەفەرمووێ كەسیان تێدا تووشی شەقاوەت و گومرایی نابێ مادام لەگەل وان دانیشتبێ (متفق علیه).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ ئەگەر رابووردن بەلای باغەكانی بەهەشت تیا بحەسێنەوە، وترا باغەكانی بەهەشت چین؟ فەرمووی (مەجلیسەكانی یاد كردنی خودایە) اخراجە الترمذی .

هەروەها پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرمووێ (ئامادەبوون لەمەجلیسی زانایەكی باشترە لەهەزار رەكعەتی نوێژ (سوننەت)و سەردانی

هەزار نەخۆش و ئامـادەبوون لـەكفن و دفـن كردنـی هـەزار جـەنازە. ووتیـان یارسول الله له خوێندنەوەی قورئانیش بـێ ؟فـەرمووی بـەبێ زانیـاری قورئـان دەخوێندرێ و سوود قـازانج دەبەخـشێ (دیـاره نـەخێر) جـا لـەبارەی نوێـژی سوننەتیشەوه پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ هیچ بەندەیەكی موسـلمان نـی یـه كەنوێژی بۆ خودا بكات وه لەهەموو رۆژێ دوانـزه رەكـەعاتی سـوننەت زیـاد لەفەرزەكان بكات، ئیللا خوای گەوره قەصرو خانوێكی لەبەهەشت بۆ دروسـت دەكات) رواه مسلم .

وه لەبارەی سەردانی نەخۆشیـشەوه پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمووێ (هـەر موسلمانێ بچێته زیارەتی موسلمانێ لەنەخۆشیدا سەر لەبەیانی ئـیللا حـەفتا هەزار فریشته داوای بەهەشتی بۆ دەكەن لەخودای گەورەو دوعـای خێـری بـۆ دەكەن (بەمـەرجێ لەبەر خوا زیـارەتی بكـات و بـەس)) ئەگـەر دانـی ئێـواره بچێته زیارەتی و سەردانی بكا دیسان حەفتا هەزار فریـشتەو ملائیكـه دوعـا خێری بۆ دەكەن و خوای گەوره باغێكی زۆر باشی لەبەهەشت پێشكەش دەكا) رواه الترمذي.

وەلەبارەی خێـری ئامـادەبوونیش لـەمردوو بـەرێ كـردن و كفـن و دفـن كردنی، پێغەمبەر خۆشەویستمان ﷺ دەفەرمووێ (ئەوەی ئامـادەبێ لـەدیار تەرم و جەنازەی برای موسلمانی هەتا نوێژی لەسەر دەكـرێ، لـەبۆ وی خێـری قیراتەك هەیه وه ئەوەی ئامادەبێ تاكو لـەگۆڕو قـەبریش دەنـێن و دەی نێـژن ئەوه لەبۆوی خێری دوو قیرات هەیه.. وتیان ئەی پێغەمبەری خوا، دوو قـیرات چین ؟فەرمووی وەك دوو چیای زۆر گەورەن) متفق علیه وەله ریوایەتێكی تـردا دەفەرمویێ: هەر قیراتی بەقەد چیاو شاخی ئوحده و، ئەی برای موسلمان ئـەوا

خێری نوێژو سه‌ردانی نه‌خۆش و ئاماده‌بوون له‌ته‌رم و جه‌نازه ناشتنت زانی، ئه‌وسا بیركه‌وه كه‌ئاماده‌بوون له‌مه‌جلیسی زانایه‌ك خێرتره له‌هه‌زار ره‌كه‌عه‌ت نوێژوو هه‌زار جار سه‌ر له نه‌خۆش بده‌یت و هه‌زار جار ئاماده‌بییت له‌مردوو به‌رێ كردندا، جا زانای خوا ناس بناسه‌و له‌مه‌جلیسه‌كانی ئاماده‌و حازربه تا خێره‌كه‌ت ده‌ست كه‌وێ و له‌ده‌ستت نه‌ڕوا.

به‌لێ باشترین مه‌جلیس ئه‌و مه‌جلیسانه‌یه كه‌باس و یادی خوای تیا ده‌كرێ وه مایه‌ی به‌خته‌وه‌ری و ئاسوده‌یی ئاده میزاده له‌هه‌موو كات و شوێنێ له‌دونیا و له‌عاله‌می به‌رزه‌خ و گۆرستاندا و له‌عاله‌می حه‌شرو قیامه‌تدا

## ٤- كه‌فاره‌تی مه‌جلیس :

مه‌جلیس هه‌ر ئه‌و مه‌جلیسه نی یه، پیاو له‌دیوه‌خان یا له‌میوانداری دابنیشێ، به‌لكو له‌سه‌ر ڕێگا ڕاوه‌ستانێ بێ یا كارگه‌و كیلگه‌یێ بێ ..یا قوتابخانه‌و مزگه‌وت بێ، یا كارو پیشه‌یێ كۆی كردبنه‌وه، جا هه‌ر دانیشتنێ بێ، وه له‌هه‌ر شوێنێ بێ ئه‌وه هه‌ر مه‌جلیسه مادام كۆبونه‌وه ڕازو نیاز ده‌ربڕینی تیا بێ یاگفت و گۆو كۆبونه‌وه‌ی تیا بێ، به‌لێ جا له‌هه‌ر جۆریان بێ ده‌بێ موسلمان ره‌چاوی رازی بوونی خودای گه‌وره بكات وه‌ده‌بێ له‌بیری نه‌چێ هه‌موو هه‌لسوكه‌وتی ژیان كه‌ته‌قدیر كراوه له‌لای خوای گه‌وره بۆ ئیمتحان و تاقی كردنه‌وه‌ی ئه‌وه ،جابا ماهیه‌ت و ووته‌و كردارێ بنوێنێ تابه‌پێ ی پله‌و پایه‌ی خۆی خوای گه‌وره حیسابی له‌گه‌ل بكات، جا پاداشتی بداته‌وه یا تۆله‌ی لێ بسه‌نێ، له‌ئه‌بی سه‌عیدی كوری خودری یه‌وه ره‌زای خوای لێ بێ پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی (خۆتان بپارێزن له‌دانیشتن له‌سه‌ر ڕێگاكان، ووتیان واده‌بێ

رێك ناکەوێ لەشوێنی تر بوەستین، جا ناچاری ڕاوەستانی سەر ڕێگاکان دەبین، فەرمووی ئەگەر مانەوە لەسەر ڕێگاو دانیشتن حەقی ڕێگاکەش بدەن ووتیان حەقی ڕێگا چیە؟ فەرمووی چاو داکەوێنن و تەماشای شتی حەرام نەکەن ودەست بەردرای ئێش و ئازار بن (خۆتان دووربگرن لەگێچەرو زەرەرو زیان لەغەیری خۆتان، جا غەیبەت بێ یا درۆ یابوختان یا نەمیمی یا سوك کردنی خەڵك یا هتد) وەلاّمی سەلام بدەنەوە بەتەواوی بەڕوێکی خۆش و بەڕێزەوە بەمایەی خۆشەویستی و سۆزەوە، ئەمرو فەرمان بەچاکەو قەدەغەی خراپە بکەن (کۆشش بکەن لەبەجێ گەیاندنی دەستوورو بەرنامەی خوا و ئامۆژگاری بکەن بۆ حەق و ڕاستی، واز لەهەموو گوفتارو کردارێ کەمایەی خەشم و قینی خودایە بهێنن) رواه البخاري.

ئەم فەرموودەیە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کەئادەمیزاد لەهەر کۆڕو مەجلیسێ بێ وەلەهەر شوێنێ بێ، چەند حەق و مافێکی ئەم کۆڕو مەجلیسەی و ئەو شوێنەی لەسەرە جا دەبێ هۆشیارو وریاو ئاگاداربێ شەیتانەکان وای لێ نەکەن تووشی خەشم و قینی خودا بێ.

وەئەگەر هات لەمەجلیسێکدا تووشی زۆر قسەووتن و لەغوە بووە وەلەکۆتاییەکەی کەفارەتی مەجلیس لەبیر نەکات و بەدڵ و بەگیانی بڵێ (سبحانك الله اللهم وبحمدك اشهدان لا الە الا انت استغفرك واتوب اليك )کەدەبێتە مایەی لێ خۆش بوونی ئەو لەغوەو قسە زیادانەی لەدەمیا دەرچوونە، وەئەگەر مەجلیسی زیکرو یادی خوای گەورە بێ، ئەوە وەکو مۆرێك وایە بەئومێدو هیوای قەبووڵ بوون لەلای خوای گەورەو میهرەبان ﴿١٤﴾موسڵمان بۆ هەرکارێ بچێ، دەبێ بزانێ بەرپرسیارە لەلای خوای گەورە

،جائه‌گه‌ر زانی و هه‌ستی كرد كه‌ناتوانیّ له‌و شویّنه‌دا خـودا ڕازی بكـات، یـا لیّی تووشـی گونـاه و تـاوان دیّـت ئه‌وكاتـه نـابیّ بـچیّت (ئه‌گـه‌ر داوه‌تـیش كرابیّ)وه‌كو مه‌جلیسیّ نیّـرو مـیّ و ژن و پیـاوی تیّكـه‌لاّو بـن به‌شـیّوه‌یه‌كی ناشه‌رعی یا قومارو دامه‌و دۆمینـه‌و عـاره‌ق و بلیـارد و فیـشه‌و یارییـه بـیّ سووده‌كانی تیا بیّ، یا مه‌جلسی دیار صحن و سـینه‌ماو ته‌لـه‌فزیۆن و ڤیـدیۆ بیّ، به‌تایبه‌تی ئه‌گه‌ر فلیمه‌كانیان بیّ شه‌رعی و بیّ دینی و دونیا په‌رستی تیا بوو، تابۆی بكریّ له‌هه‌له‌و گونـاه و سـه‌ربازه‌كانیان بگه‌ڕیّتـه‌وه، نـه‌بۆخۆی و نه‌به‌ئیمانه‌كه‌ی نه‌نازیّ، به‌مانایه‌كی تر تابۆی ده‌كریّ، خۆی تووشی زۆرانبـازی نه‌فس و شه‌یتان نه‌كات، ئه‌گه‌ریش تووش بوو خۆڕاگرو دامـه‌زراو بـیّ، ئه‌گـه‌ر نه‌چیّ باشـتره، نـه‌ك بـه‌وه‌ی بلّـیّ ده‌ی ده‌ی مـن ده‌چـمه ئـه‌و شـویّنه‌و بـابیّ شه‌رعیشی تیا بیّ، من خۆم لیّـی ده‌پـارێزم، یـا كارلـه‌من ناكـات، هـه‌روه‌ها له‌یادو زیكری خودا غافل و بیّ ئاگـا نـه‌بیّ وه‌له‌هـه‌موو هـه‌لّس و كـه‌وتیّك و دانیشتن و پـالّ دانه‌وه‌یـه‌ك خـوای هـه‌ر لـه‌یاد، بـیّ پیّغه‌مبـه‌ری ئـازیز ﷺ ده‌فـه‌رمووێ ئـه‌وه‌ی له‌شـویّنیّ دانیـشت و یـادو زیكـری خـوای گـه‌وره‌ی نه‌كردتووشی حه‌سرت و نه‌دامه‌تیّك ده‌بیّ له‌لای خوای گـه‌وره‌وه، ئـه‌وه‌ی پـالّی داوه له‌شویّنیّ وه‌زیكرو یـادی خـوای گـه‌وره‌ی نـه‌كرد خـوای گـه‌وره تووشـی حه‌سره‌ت و نه‌دامه‌تی ده‌كات) رواه ابو داود.

## ٥- دۆقه ( مصافحه ) :

له‌كوڕی خه‌تاب قه‌تاده‌وه ره‌زای خوای لیّ بیّ ووتی :(گوتمه ئه‌نـه‌س ئایـا دۆقه‌و موصافحه له‌ناو ئه‌صحابی پیّغه‌مبه‌ر ﷺ هـه‌بوو ؟ووتـی بـه‌لیّ) رواه

البخاري والترمذي .

لەبەرا ئەوە (رەزای خوای لیّ بیّ فەرمووی) : پیّغەمبەر ﷺ فەرموویەتی هیچ دوو موسلمانیّ نی یە بەیەك بگەن و دۆقەو موصافحە لەگەل یەکا بکەن، ئیللا خوای گەورە لیّیان دەبووریّ پیّش ئەوەی لیّك دابڕیّن و لیّك جیا ببنەوە) رواه ابو داود والترمذي.

- لەئەنەسەوە رەزای خوای لیّ بیّ وتی ئەی پیّغەمبەری خودا ﷺ پیاویّ لەئیمە دەگاتە برای خۆی ئایا خۆی بۆ دابنویّنیّ؟ فەرمووی نەخیّر ووتی بیگریّ و ماچی بکا ؟ فەرمووی نەخیّر، ووتی ئەی دۆقەو موصافەحەی لەگەلّ بکا؟ (فەرمووی بەلیّ) رواه الترمذي .

بەلّیّ سوننەتە موسلّمان ئەگەر گەیشت بەبرای موسلّمانی دۆقەی لەگەلاّ بکاو لەپاش سەلام کردن لەئەحوالی بپرسیّ .

لەسەفوانی کوڕی عەسال ووتی جولەکەیەك ووتیە برادەرەکەی بابڕۆین بۆ لای ئەو پیّغەمبەرە ﷺ جاهاتنە لایی و نۆ پرسیاریان لیّ کرد تاکۆتایی فەرموودەکە ... لەئەنجامدا دوو جولەکەکە دەست و پیّی پیّغەمبەریان ماچ کرد — ووتیان شایەدی دەدەین کەتۆ پیّغەمبەری (رواه الترمذی) و غیره :

لەعبدالله ی کوڕی ئیمامی عومەرەوە رەزای خوایان لیّ بیّ لەبەسەر هاتیّکدا دەگیّڕیّتەوە لەکۆتاییەکەیدا خۆمان نەوی کرد بۆ دەستی پیّغەمبەر ﷺ ماچمان کرد) رواه ابوداود.

لەعائیشەوە ڕەزای خوای لیّ بیّ فەرمووی: (زەیدی کوڕی حاریثە گەڕاوە بۆ مەدینە وە پیّغەمبەری خوا ﷺ لەمالاّ بوو ، جاهات لەدەرگایدا پیّغەمبەر ﷺ لەبۆی هەلّساوە بەبەرگەکەی ڕای کیّشاو دەستی لەملی کردو

ماچی كرد ) رواه مسلم .

له‌ئه‌بو هوره‌یره‌وه ڕه‌زای خوای لێ بێ ووتی پێغه‌مبه‌ر ﷺ حه‌سه‌نی كوری عه‌لی ره‌زای خوای لێ بێ ماچ كرد ،جا ئه‌قره‌عی كوری حابس ووتی: من ده مندالم هه‌یه تا ئێستا یه‌كێكم ماچ نه‌كردووه، جا پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی ئه‌وه‌ی ره‌حمی نه‌بێ ڕه‌حمیشی پێ ناكرێ ) متفق علیه.

له‌هه‌موو كاتێكدا ئایینی ئیسلام بۆ ڕوح و مه‌به‌سته‌كه‌ی ده‌ڕوانێ و حیسابی نیه‌ته، جاهه‌ركه‌سێ كارێكی به‌زاهیر شه‌رعی به‌نیه‌تێكی خراپ بكات، ئه‌وه مالی خۆی وێران ده‌كات چونكه ده‌كاته نیفاق و دووڕوویی .

هه‌روه‌ها موسلمان ده‌بێ له‌ش سوك و گورج و گۆل بێ ، سوننه‌ته له‌به‌ر براكه‌ی موسلمانی هه‌لبسێته‌وه‌و ڕێزی لێ بنێ، به‌نیه‌تی خۆشه‌ویستی هه‌لنانیه‌وه بۆ ئیسلام، دۆقه‌ی له‌گه‌لا بكا ئایینی ئیسلام ته‌مبه‌لی و داوه‌شاوی خۆش ناوێ و په‌سه‌ندی ناكات ،جابرای موسلمان واباشه‌و سوننه‌ته كه‌له‌به‌ر گه‌وره‌و بچوك هه‌لبستیته‌وه‌و رێزیان له‌به‌ر خودا لێ بنێ و دۆقه‌یان له‌گه‌لا بكه‌ی تاكو خۆشه‌ویستاتی خۆت بهاوێته دلی گه‌وره‌و بچوك، ڕوح سوكی و ڕه‌وشتی جوان ده‌ربخه‌یت، تابتوانی ئیسلامیان لا شیرین بكه‌یت[٣] ..ئه‌وه‌تا وه‌كو باسمان كرد پێغه‌مبه‌ر ﷺ هه‌لساوه‌ته‌وه له‌به‌ر زه‌یدی كوڕی حاریسه، هه‌روه‌ها جارێ تر فه‌رمانی به‌موسلمانان كردووه كه‌هه‌ل بستن به‌پێشوازی گه‌وره‌كه‌یانه‌وه بچن كه‌سه‌عدی كوڕی مه‌عاز بوو له‌كاتێكدا كه‌له‌شه‌ڕی خه‌نده‌ق بریندار ببوو و حوكمی به‌نی قوڕه‌یزه‌ی درا بووه ده‌ستی، بۆ

---

[٣] بزانه دۆقه كردن له‌گه‌ل ئافه‌رتان حه‌رامه و دروست نییه وه سه‌ر ده‌كێشێ بۆ گوناهی گه‌وره‌و فه‌سادی كۆمه‌ل و دروست بوونی گه‌لێك ئاشوب و فیتنه پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رموێ (من دۆقه له‌گه‌ل ژنان ناكه‌م).

چاره‌سه‌ر كردنی كێشه‌كه‌یان له‌سه‌ر ئیزنی گه‌وره‌كانی به‌نی قوره‌یزه‌و ئیزنی پێغه‌مبه‌ر ﷺ ﴿١٥﴾.

به‌لاّم هه‌ستانه‌وه‌یێ له‌به‌ر گه‌وره‌یی و ته‌عزیم بیّ یا له‌به‌ر ماڵی كابرای ده‌وڵه‌مه‌ند بیّ یا له‌به‌ر هه‌رنیه‌تی تری خراپ بیّ ئه‌وه ئایینی پیرۆزی ئیسلام په‌سه‌ندی ناكات، پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رمووێ (هه‌ر كه‌سیّ رێز له‌ده‌وله‌مه‌ند بنیّ له‌به‌ر ماله‌كه‌ی له‌به‌ری هه‌لسێته‌وه ئه‌وه دوو له‌سه‌ر سیّ ی ئیمانه‌كه‌ی ده‌روات).

هه‌روه‌ها پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویست ﷺ ده‌فه‌رمووێ ئه‌وه‌ی رێز له‌فاسقیّ بنیّ، بیّ گومان ئه‌وه یارمه‌تی داوه بۆ خراپ كردن و وێران

كردنی ئایینی ئیسلام) احیاء ج٢ل ٨٠.

كه‌واته رووگه‌ش و روخۆش به له به‌رامبه‌ر برای موسلمان ، ده‌ست ماچ كردنی پیاوی خوداو صالح و به‌ش و ماچ كردنی منداڵ له‌به‌ر ره‌حم و شه‌فه‌قه‌ته‌وه سوننه‌تن، هه‌روه‌ها ماچ كردنی خۆشه‌ویستیّ ئه‌گه‌ر له‌سه‌فه‌رێكی هاتبێته‌وه و ماوه‌یه‌كی باش بیّ نه‌ت دیبیّ به‌لام ئه‌گه‌ر رۆژانه یه‌كتر ببینن ماچ كردنی په‌سه‌ند نه‌كراوه (١٦) (١٧) .

- له‌باسی پژمین و﴿١٨﴾ باوه‌شكدا ﴿١٩﴾

له‌ئه‌بو هوره‌یره ره‌زای خوای لیّ بیّ پێغه‌مبه‌ر ﷺ (فه‌رموویه‌تی خوای گه‌وره پژمینی خۆش ده‌ویّ وه‌باوشكی خۆش ناویّ جا ئه‌گه‌ر یه‌كیّ له‌ئێوه پژمی وه ستایشی خوای كرد به‌وه‌ی ووتی (الحمدللـه) حه‌قی ده‌كه‌وێته سه‌ر هه‌موو ئه‌و موسلمانانه‌ی كه گوێیان لیّ یه دوعای خێری بۆ بكه‌ن به‌وه‌ی پیّ ی بلێن (یرحمك الله)، به‌لام باوه‌شك له‌شه‌یتانه‌وه‌یه، ئه‌گه‌ر یه‌كیّ له‌ئێوه

باوەشكی هات، شەیتان پیّ ی پیّدەكەنیّ) رواه البخاري.

لەئەبو هورەیرە رەزای خوای لیّ بیّ پیّغەمبەر ﷺ (فەرموویەتی ئەگەر یەكیّ لەئیّوە بپشمیّ بابلیّ (الحمدلله) واتە حەمد و ستایشی خوا بكات، بابراكەی یا برادەرەكەی پیّ ی بلیّ (یرحمك الله) واتە خوا رەحمت پیّ بكات ئەویش وەلامی بداتەوە بلیّ (یهدیك الله ویصلح بالكم) واتە خوا رەحمت پیّ بكات و هیدایەتت بدات و حالت چاك و باش بكات ) رواه مسلم .

وەلەئەبو هورەیرە .. ووتی كاتیّ پیّغەمبەر ﷺ بپشمابا دەستی موبارەكی خۆی، یابەرگ و پۆشاكی خۆی دەخستە سەردەم و لووتی ودەنگی نزم دەكردەوە) رواه ابو داودو الترمذي لەئەبوو موسی رەزای خوای لیّ بیّ فەرمووی جولەكەكان ئەپژمین لەلای پیّغەمبەر ﷺ تكای ئەوەیان دەكردو دەیان ویست كەپیّیان بلیّن (یرحمك الله)جا پیّغەمبەر ﷺ دەی فەرموو (یهدیكم الله ویصلح بالكم) رواه ابو داود. بزانن ئەگەر ئەوەی دەپژمیّ نەلیّت (الحمدلله) لەسەر بیسەران نابیّتە واجب پیّی بلیّن (یرحمك الله).

بەلّیّ جا دەبیّ بەكافرو بیّ باوەڕ بلّیّی (یهدیكم الله ویصلح بالكم )چونكە كافرو بیّ باوەڕ شایستەی دوعای خیّریۆ كردنن بەو شیّوەیەی كە پیّغەمبەر ﷺ دوعای بۆ كردوون لەپشمیندا. لەئەوبو سەعیدی خودری یەوە پیّغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (ئەگەر یەكیّ باوەشكی هاتیّ با بەدەستی دەمی خۆی بگریّ چونكە شەیتانی دەچیتیّ ) رواه مسلم.

كەواتە ئادەمیزاد لەوكاتەی كەباوەشكی دیّتیّ دەمی خۆی بگریّ، بەپشتی دەست بیّ یابەهەر شتیّكی تر بیّ، بلّیّ ( اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) واتە پەنا دەگرم بەخوای گەورە لەشەیتانی مەلعون و ڕەجم كراوی دوور

لەرەحمی خودا) بەڵێ نابێ بێ ئاگابین لەو دوژمنەی کەخۆی و قەبیلەکەی ئێمە دەبینن، بێ ئەوەی ئێمە ئەوان ببینین، هەموو کات لـەپیلان گێـڕان دان لێمـان دەیانەوێ ڕیسوای قاپی ڕەحمەتی خودا بین و بەهەشتی پڕ نیعمـەتمان لەدەسـت بدات، وەدۆستایەتی پـەروەردگاری جیهانمـان لێ بـچوێنێ (٢٠) وەکـو خـوای گەورە ئاگادارمان دەکاتـەوە لـەو دوژمنـە سەرسـەختە و دەفـەرمووێ (ئـەی ڕۆلانی ئادەمی شەیتان تووشی فیتنەو هەلاکەتتان نەکات وەکو باوك و دایکی و ئێوەی (کەئادەم و حەوایە)دەرچوواند لەبەهەشت، تووشی بێ حورمەتی کردن و بەرگی بەهەشتیان لەبەر داکەندرا وەعەورەتیان ئاشـکرا بـوو، جـابزانن ئـەو شەیتانە خۆی و قەبیلەکەی ئێوە دەبینێ بێ ئەوەی ئێـوە بیـان بیـنن و بـزانن ئێمە شەیتانەکانمان گێڕاوە بەدۆستانی ئەو کەسانەی کەڕوو لەخوا نین و ئیمـان ناهێنن)سورەتی الاعراف ئایەتی ٢٧.

## هەندێ لەو ڕێگایانەی شەیتان گەڵ و کۆمەڵی پێ دەتلێنێتەوە :

### ١- درۆ دەردو بەلایەکی زۆر گەورەیە :

درۆ(٢١) پێچەوانەی ڕاستگۆییە، دەردو بەلایـەکی زۆر گـەورەی تـاك و کۆمەڵە، لەناو هەر گەل و کۆمەڵێ بلاوبێتەوە، دەبێتە مایـەی تێـك چـوون و پـچڕانی خۆشەویـستی و تـەبایی، و بـێ سـیقەیی و بـێ بڕوایـی لەئـەنجامی ئەمەشدا فەشەلی دەکەوێتە ناو یەکێتی گەل و کۆمەڵ چین چین و تـاقم تـاقم دروست دەبێ، وەنەمانی یەکێتی دەبێتـە هـۆی بـێ هێـزی و لاوازی سـستی، لەئەنجامی ئەوەشدا دوژمن بەسەریانا زاڵ دەبێ هەرچی لەژێر دەست یانـە دەی بات و پیاوە خاوەن عیززەت و ئازیزەکانیشی تووشی زەلیلـی و ژێـر چـەپۆکی

دەبن و خراپی و ماڵ ویرانی دەبێتە بەشی وولآت و نیشتمانیان، خـوای گـەورە سیفەتی درۆزنی داوەتە پاڵ کافران و مونافقـان و لەگـەڵ زاڵمانـا هێناویەتیـە ریزو پۆلێك، بۆیە لەکتێبـە پیرۆزەکـەی نـەفرەت و نەعلـەت لـەدرۆزن و زاڵـم دەکات .

بەڕاستی زەرەرو زیانی درۆ گـەلێ زۆرە، لـەڕووی مـادی و مەعنەویـەوە هەرناژمێردرێ، درۆ پێچەوانەی تەبیعەت و سروشـتی ئـادەمیزاد و بوونـەوەرە بەتێکڕایی ، هەموو یاساو دەستوورەکانی دژی درۆن و لەوپەڕی ڕاسـت گـۆیی دان، وەدرۆ مایەی خەشم و قـین و نـەفرەتی خـوای گەورەیـە، وەدەرگـایێ زۆر گەورەیـە لەڕێگـەی شـەیتانەکان، لـەم ڕێگایـەوە هـەزاران گونـاه و تـاوان بەئادەمیزاد دەکاو هەر بەم درۆیەش پینە دەکات .

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ (ڕاست گۆیی ڕێنومایی کاری چاك دەکـات کـاری چاك ڕێنومایی بەلای بەهەشتەوە دەکات پیاوی واهەیە هەر ڕاست دەڵێ تـاکو لای خوای گەورە ڕاست گۆ دەنوسرێ، درۆ ڕێنومایی بەلای کاری خراپ دەکات کاری خراپ ڕێنومایی بەلای ئـاگری دۆزەخـەوە دەکـات پیـاوی واهەیـە هـەر درۆدەکات تاکو لای خوای گەورە بە درۆزن دەنوسرێ) متفـق علیـە، جایـەکێ لای خودا بەدرۆزن بنوسرێ هەرشایەنی ئەوەیە هاوارو واوەیلا لـەدوای هـاوارو واوەیلا لەبۆخۆی بکات دەبێ ئەو جۆرە مرۆڤە چـەند دڵـسۆز بـێ بـۆ شـەیتان چەند سوك و ڕیسواو بێ قیمەت بـێ لای یـەزدان، هـەروەها پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمووێ (گەورەترین خیانەت ئەوەیە کەدرۆ لەگەڵ برای موسـڵمانت بکـەی ئەویش بەڕاست گۆت قسێ بگات ) رواه ابو دواد .

هەروەها پێغەمبەری خۆشەویست و ڕاسـتگۆو ئـەمین ﷺ دەفـەرمووێ

ئه‌گه‌ر مرۆڤێ درۆی كرد فریشته به‌قه‌د یه‌ك میل لێی دوور ده‌كه‌وته‌وه له‌به‌ر بۆگه‌نی درۆیه‌كه‌ی) رواه الترمذي. وه‌مه‌به‌ست له‌و فریشته به‌ڕێزانه‌یه كه‌به(كراما كاتبين)ناویان هاتووه له‌قورئاندا (وه‌ك له‌كتێبی تاج باسی ده‌كات) پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رمووێ یه‌كێ ئه‌وه‌نده گوناهه‌ی به‌سه بۆقوڕبه‌سه‌ری وماڵ وێرانی قیامه‌تی له‌وه‌ی كه‌گوێی لێ ده‌بێ بیگێڕێته‌وه) تاج٥ ل٤٢، چونكه شكی تیا نیه ئه‌و قسانه‌ی كه‌ده‌كرێن زۆربه‌ی درۆن یا به‌شێكیان تێدایه درۆیه پیلانی شه‌یتانه‌كانن بۆ چه‌ند قه‌صدو مه‌رامێكی بۆگه‌نیان ،به‌ڵێ ئیمان له‌ناو هه‌ركۆمه‌ڵێ نه‌ما ئه‌وا شه‌یتان هێلانه‌ی تیا ده‌كاو هه‌زاره‌ها وه‌چه‌و لایه‌نگر ده‌نێته‌وه جا بازاڕ به‌هه‌موو لایه‌كانیه‌وه پڕ ده‌بن له‌درۆ﴿٢٢﴾.

داخی گران له‌سه‌ر ئاده‌میزاد كه‌ڕێگه‌ی به‌خته‌وه‌ری و به‌رزی خۆی ناگرێ وه‌زۆربه‌یان ده‌بن به‌ئه‌ڵقه له‌گوێی شه‌یتانه‌كان به‌ڵێ به‌رزترین پله‌ی ئاده‌میزاد له‌پاش پله‌ی پێغه‌مبه‌رایه‌تی پله‌ی ڕاستگۆییه وه‌ك خوای گه‌وره ده‌فه‌رمووێ

﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ سوره‌تی

واته (ئه‌وه‌ی گوێڕایه‌ڵی خواو پێغه‌مبه‌ری خوابكات خوای گه‌وره كۆی ده‌كاته‌وه له‌گه‌ڵ ئه‌وانه‌ی كه‌نیعمه‌تی زۆری به‌سه‌ردا باران دوون له‌پێغه‌مبه‌ران و ڕاست گۆیان و شه‌هیدان و پیاو چاكان، ئای كه ئه‌وانه براده‌رایه‌تی و برایه‌تی هاوژیانیان چه‌ندێ خۆشه)

## ٢-گومان (الظن):

گومان ڕێگایێکه شه‌یتان خه‌ڵکانی پێ ده‌ست خه‌ڵه‌ت ئه‌دات، خه‌دعی ده‌کات وه‌سه‌رچیغ و گومڕای ده‌کات ، ڕاستییان لێ ده‌شارێته‌وه ئه‌مه له‌لایه‌ك ،له‌لایه‌کی تره‌وه تووشی گوناه و تاوانیان ده‌کا، خۆشه‌ویستی و دڵسۆزی و وه‌فایی ته‌بایی له‌نێوان کۆمه‌ڵ ڕیشه‌کێش ده‌کات و ده‌بێ موسڵمان ئاگاداربێ پیلانه‌کانی شه‌یتان و شه‌یتانیه‌کان دانه‌که‌وێ و خۆی لێیان بپارێزێ ئه‌وه‌تا خوای گه‌وره ده‌فه‌رمووێ وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا أَفَلَمْ تَكُونُوا تَعْقِلُونَ ﴿٦٢﴾ یس

واته: (ئه‌ی ئاده‌میزاده‌کان، شه‌یتان بێ گومان زۆرکۆمه‌ڵ و گه‌لی له‌پێش ئێوه سه‌رلێشواوو گومڕا کردووه جا نه‌ده‌با بۆخۆتان عاقل و ژیر بوونایه و شاره‌زای پیلانه‌کانی بوونایه )وه‌خوای گه‌وره له‌باره‌ی شك و گومانی خراپدا ڕووه‌و ئیمانداران ده‌فه‌رمووێ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ ﴿١٢﴾ (الحجرات (ئه‌ی کۆمه‌ڵانی ئیمانتان هێناوه زۆر له‌گومانه‌کان له‌خۆتان لاده‌ن و بزانن هه‌ندێ گومان هه‌یه گوناه و تاوانه،

وه‌خوای گه‌وره ده‌فه‌رمووێ وَإِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا ﴿٢٨﴾ النجم

واته: (به‌ڕاستی زه‌ن و گومان شتێك له‌حه‌ق وڕاستی زیاد ناکات) له‌سوره‌تی ئیسرادا له‌ئایه‌تی ٣٦دا ده‌فه‌رمووێ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ ﴿٣٦﴾

(له‌سه‌ر کارو فه‌رمان و شتێ مه‌به که‌زانیاریت پێوه نیه)کارو فه‌رمان و

تێگەیشتن و بیروباوەڕ نابێ لەسەر کۆلەگەی گومان زەن و ئەوهام و خەیاڵات و خەون دامەزرابێ، بەڵکو دەبێ لەسەر بەڵگەو زانیاری و زانست دامەزرابێ ..

لەئەبوو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (بەڕاستی زەن و گومان درۆترین قسەوگوفتارە، جا ئاگاداری خۆتان بن )، جاسوسی لەسەر یەك مەکەن وحەسودی بەیەك مەبەن و خۆتان لەیەکتری توند و تورە مەکەن ،پشت لەیەکتری مەکەن بەوەی قسان لەگەل یەکتری نەکەن وەهەمووتان بەندانی خوابن وەکو برایان) متفق علیه .

بەلێ هەزاران ئامۆژگاری ئاوا جوانی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ هەیە، ئەگەر ئاگاداری بین و هەموو لایەکمان پێوە بەختەوەر دەبین لەدونیا و عالەمی بەرزەخ و رۆژی قیامەتدا، ئاسوودە دەبین بەرەحمەتی خوای گەورە بۆ رۆژێکی هەتا هەتایی ..

بەلێ ئەوە ئیمانە خەلك و مەردووم دەکا بەبراو بوغزو قین و جاسوسی و حەسودی و درۆ گومان و غەیبەت لەناو دەبات، ئایا چ شتێ یا چ بیرو باوەرێ هەیە ئەو چارانەی پێ بکرێ ئەو هەموو گیرو گرفتەی پێ حەل بکرێ ؟ ! .

## ٣- سە لەگەل یەکتر نەکردن و پشت تیك کردن :

زۆر ئادەمیزاد هەن لەبەر بێ ئاگایی و نەزانین، لەبەرنامەکەی خودا خۆیان دەکەنە بەندەی هەواو ئارەزووی خۆیان یا غەیری خۆیان، لەبیریان چۆتەوە، خوای گەورە بۆیێ ئەوانی خەلق کردووە کەببنە بەندەی ئەوو ،بە پێ ی دەستوور بەرنامەی ئەوا رەفتارو کردار بکەن، نەك هەواو ئارەزووی خۆیان ،یا یەکێ تر، یا رێچکە و رێبازێ کەدەست کردی هەواو ئارەزووی ئادەمیزاد،

یا ڕێگاییێ کە هیچ زانیاری پێوە نەبێت ،نەباسی سەرەتای ژیان و ئیستای ژیان و دوا ڕۆژی ژیانت بۆ بکات نەهەقی فیترەو عەقل و ژێری بدات.

بەلێ قسە لەگەل یەك نەکردن دەبێتە پچرانی ریشەی یەکێتی کۆمەل و موسلمانان، زۆر لەخەلکان زۆر بەساکاری لێ ی حالی بووینە و لایان وایە ئەگەر چەند رۆژێ یا چەند مانگێ قسە لەگەل براکەی موسلمانی نەکات هیچی تیا نی یە ،یا هەیە خۆی پێ هەلدەکێشی و شانازی بەوە دەکات کە توانیویەتی دلسۆز بێ لەبەندایەتی بۆ نەفس و هەوای خۆی ،ئەوە لەلای خوای گەورە و پێغەمبەری ئازیز تاوان و گوناهێکی زۆر گەورەیە .. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: حەلال نی یە بۆ موسلمان پشت لەبراکەی خۆی بکات پاش سێ شەوان کەبەیەك بگەن ئەو روو لەولا بکات و ئەوی تر ڕوو لەلاکەی تر بکات، باشترینیان ئەو کەسەیە کە زووتر سەلام لەوی تر بکات) متفق علیە ...

بەلێ لەسەر گوێرایەلی بەندایەتی نەفس و هەوای خۆی، مردووە نزیکە خوای گەورە بەموشریك و کافر لەقەلەمی بدات ..هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (حەلال نی یە بۆ کەسێ ئیمانی هەبێ پشت لەبرای ئیماندااری بکات بەسەرەوەی سێ رۆژان وە ئەگەر هاتوو سێ ڕۆژ تێ پەڕی وەگەیشت بەبرای ئیمانداری سەلامی لێ کرد، ئەوە زۆری خێر دەگاتێ ئەگەر ئەویش وەلامی داوە ئەوە هاوبەش دەبێ لەپاداشتەکەی، وە ئەگەر وەلامیشی نەدایەوە ئەوە خۆی خستە ناو گوناه و تاوان ،وە ئەوەی تر گوناهی لەسەر لادەچێ) .. رواه ابو داود.

هەروەها پێغەمبەری سەردارو سالار ﷺ دەفەرمووێ: (کارو کردەوەی خەلکان ڕوون دەکرێتەوە و پەخش دەکرێ لەهەموو هەفتان دووجار لە دووشەم

و پێنج شەم دا ،جا خوای گەورە لەگوناهەكانی ئیمانداران خۆش دەبێ تەنها لەو بەندە نەبێ كەلەگەل براكەی ئیمانداری خۆی لێك توورە و عەداوەت و ڕكیان لەیەكەو پشتیان تێك كردووە جا دەووترێ وازیان لێ بێنن و دوایان بخەن هەتا پێك دێنەوە و ئاشت دەبنەوە) رواه مسلم .

بەلێ قسە لەگەل یەكتر نەكردن و پشت تێك كردن و خوو ڕەوشتی ئیمانداری تەواو نی یە ،پاش ئەو هەموو فەرموودەیە ، سەیرە ئادەمیزادی ئیماندار چۆن غیرەت دەكات كاری وا بكات .

جا برای ئیماندار هەركاتێ هەستت كرد دوو برای ئیماندار دلیان لەیەك گەردی گرتووە خێرا ئاشتیان بكەنەوە ، لێ نەگەڕێن شەیتان بەسەر نەفس و گیانیان زال ببێ بەلكو ئیصلاحی نێوانیان بكەن، وەكو خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾﴾ الحجرات ،

واتە: (ئیمانداران بەراستی برای یەكن جا ئیصلاحیی نێوان برایانی خۆتان بكەن و لەخوای بترسێن رەجاو تكاتان وابێ رەحم و بەزەیتان پێ بكرێ ).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (حەلال نییە بۆ مسولمان پشت لە براكەی بكات و قسەی لەگەل نەكات ،ئەوەی سێ رۆژ تێپەری هەر پشت لەبراكەی موسلمانی بكا و بمرێ دەچێتە ناو ئاگری دۆزەخ) رواه ابو داود.

برای ئیماندار جا تۆش هۆشیارو وریا بە، باشەیتان لەم رێگایانەوە تووشی مال وێرانی و دۆزەخی پر ئازارو عەزابت نەكات .

## ٤- غەیبەت

غەیبەت لەو دەرگاو ڕێگایانەیە شەیتانی مەلعون خۆی دەگەیەنێتە دەروونی ئادەمیزاد و هێلانەی تیا دەكات، غەیبەت چی یە ؟!!.. وەك لەفەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دەردەكەوێ كە دەفەرمووێ: (ئایا دەزانن غەیبەت چی یە؟ ووتیان خواو پێغەمبەری خوا لەهەموو كەسێ باشتر دەزانن فەرمووی غەیبەت ئەوەیە باسی برای موسلمانی خۆت بكەی كەپێ ی ناخۆش بێ ،ووترا ئەی ئەگەر ئەوەی ووترا ڕاست و بەجێ بوو، فەرمووی ئەگەر ڕاست بوو ئەوە غەیبەتت كردووە ئەگەر وەنەبوو بوختانت پێ كردووە) ﴿٢٣﴾ ،لای زانایان غەیبەت لەگوناهە گەورەكانە لەبەر ئەوەی لەقورئاندا هاتووە خوای گەورە ڕاستەوخۆ دەفەرمووێ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجْتَنِبُواْ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾ سورەتی

(ئەی ئەوكەسانەی ئیمانتان هێناوە، خۆتان لادەن لەزۆر زەن و گومان، بەڕاستی هەندێ گومان هەیە تاوانەو گوناهە و جاسوسی نەكەن وەهەندێكتان غەیبەتی هەندێكی ترتان نەكەن، ئایا كەسێ لەئێوە پێی خۆشە گۆشتی برای خۆی بەمردوێتی بخوات جاحەزی لێ ناكەن و دەی كەرهێنن كەواتە لەخوا بترسێن و تەوبە بكەن و بگەڕێنەوە لای خوا بەدڵ و بەگیان بەڕاستی خوای گەورە تەوبە وەرگرو میهرەبانە) .

حەزرەتی عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ دەفەرمووێ ووتم بە پێغەمبەر ﷺ صەفیەخان ئەوهاو ئەوهایە(گوایە كورتە بالآیە) جا پێغەمبەر ﷺ

فەرمووی (بەڕاستی ووشەیەکت ووت ئەگەر گوناه و پیسی ئەو ووشەیە بخەیتە ئاوی بەحرو دەریا شێلوو بۆگەنی دەکات) تاج ٥ل٢٦.

باشە ئەگەر ووشەیەك بەحرێك شێلو و بۆگەنی بکات باشە ئەدی ماوەیەك هەرباسی غەیبەت بێ دەبێ چی شیلوو بۆگەن بکات، کەزۆر لەمەجلیسەکانی دونیای ئێستا زۆرینەی غەیبەتە، ئەمەیە دڵەکانی لێك و پێك کردوەو ڕەش و ڕەقی کردووە. لەعبداللە ڕەزای خوای لێ بێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (کەسێ باسی کەسێکی ترم بۆنەکات لەهاوەڵەکانم لەهیچ شتێ، چونکە من حەز دەکەم دەرچم لە ناو ئێوە بەدڵێکی پاك و خاوێن) تاج ل٢٦، بەڵێ غەیبەت دڵ پیس دەکاو لەسروشتی پاکی خۆی لائەدا، خەڵکانی غەیبەت کراو سوك و کەم نرخ دەکا لەبەر چاو دڵا ،وەك تۆ کەزەمی یەکێکت گوێ لێ دەبێ ئیتر لەبەر چاوت کەم نرخ دەبێ و ناتوانی هەمان دڵ و ڕووی چاوی پێشوی بدەیتێ جا گوێ دانە، غەیبەتیش گوناهێکی زۆر گەورەیە، چونکە دەبێتە هاوبەش لەگەڵ غەیبەت کەرەکە وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ (غەیبەت کەرو گوێ گر هاوبەشن لەگوناه و تاواندا)احیاء علوم الدین و تاج ج١ل٢٠٩، ئەگەر گوێ گرەکە خۆی کرِو بێ دەنگ بکات وەگوێی بۆشل بکات، بەلاَم ئەگەر قەدەغەی کردو پێی ناخۆش بوو و گوێی بۆ نەگرت ئەوکاتە گوناهی ناگاتێ.

لەئەبوو هورەیرە دەفەرمووێ پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی (بەندە هەیە دەمی لێ دەکاتەوە، قسان دەکات بەبێ موبالاتی جا ووتەو قسەی وای لەدەم دێتە دەرەوە، وەك باری گوناه و تاوان دەیدا بەسەر خۆیا دەبێتە مایەی هەرزەلینی بۆ ناو دۆزەخ، بەقولاَیی زیاترو دوورتر لەنێوان ڕۆژهەلاَت ڕۆژ ئاوا)

متفق علیه.

لەسوفیانی کوڕی عبدالله ڕەزای خوای لیّ بیّ ووتومە پیّغەمبەر ﷺ ئامۆژگاریەکم بکە، بەفەرمانیّ پشتی پیّ ببەستم، فەرمووی: دان بەپەروەردگارت بنیّ و پاشان دامەزراوبەو ئیستقامەتت ببیّ، ووتم ئەی پیّغەمبەری خواﷺ لەچی زیاتر بترسیّم لەوەی پیّی گوناهبار ببم، پیّغەمبەر ﷺ زمانی موبارەکی خۆی گرت و پاشان فەرمووی ئەمە) رواه الترمذي.

لەئەنەسەوە ڕەزای خوای لیّ بیّ پیّغەمبەر ﷺ (فەرموویەتی لەو کاتەی کەچوومە میعراج، ڕابووردم بەلای گەل و قەومیّ (نینۆکیان وەك مس و نوحاس وابوو دەم و چاوو سنگی خۆیانیان پیّ دادەڕنی) ووتم ئەوانە کیّن ئەی جوبرائیل ؟فەرمووی ئەوانەی کە گۆشتی خەلّکیان دەخوارد غەیبەتی خەلّکیان دەکرد و دەکەوتنە ناو باسی ناموسیان)رواه ابو داود.

غەیبەت هەرلەیەك ڕووە نیە، بەلّکو بەدەنی یان نەسەبی یا ئەخلاقی یا کارو پیشەی یاقسەو گوفتاری یا ئاین و بەرنامەی یاکاروباری دونیای هەتا جل و بەرگی ومالّی و سورای و بەهەر جۆریّ باس بکریّ و پیّی ناخۆش بیّ دەبیّتە غەیبەتی، جا بەنیسبەت بەدەن و جسمی گەر بلّیّ کورتە یا دریّژە یا ڕەشە یا لاوازە یا قەلّەوە یا خەپەیە یا سەر گەورەیە یا مۆنە یا قەرپە ..هتد. هەر جۆریّ بیّ کەمایەی پیّ ناخۆش بوونی براکەی موسلّمانی بیّ ئەوە غەیبەتە بەنیسبەت حەسەب و نەسەبی بلّیّ دۆمە یا قەرەجە یا هندییە یا فاسیقە یا کوڕە دزە یا سەخیفن لەم بارەیەوەش هەرجۆریّ بیّ کەمایەی پیّ ناخۆش بوونی بیّ دەبیّتە غەیبەت.

وەبەنیسبەت خۆرەوشت و ئەخلاقی بیّ : بەوەی کەبلیّ بیّ ئەخلاقی

چروكه و بەدە، ڕەزيله و قرچۆكە رووح گەورەو لووت بەرزە ،تورەو توندە، بێ عەقلە ،بێ عيلمەو تێ ناگا .. هتد.

ئايين و دينى نوەك بلێ ى دزە يا درۆزنە يا عەرەق خۆرە يا خائينه يا زالم و ستەمكارە يا زۆر بەلەش گرانى نوێژەكەى دەكات وە يا زەكات بەباشى نادات يا روكوع و سجدەى باش نابا، يا خۆى لەپيس و چەپەلى ناپارێزى يا لەگەل دايك و باوكى چاك نييە يا رۆژوى خۆى ناپارێزێ يا زۆر بلێ و هەرەپاسەو غەيبەت كەرە يا باسى ناموسى خەلك دەكات ،بە كورتى باس كردنى لاى خەلك عيلاج و چارەسەر نى يە بەلكو عەيب و عارى خەلك بەدەر خستنە گيرو گرفتەكە گەورەتر و ئالۆز تر دەكات، لەبەر ئەوە غەيبەتن بەلكو چارەسەر ئەوەيە لاى خۆى باس بكرێ و دەستى بۆ لاى راستى و دروستى رابكێشرێ، بەشێوەيەكى حەكيمانە .

بەنيسبەت كارو بارى دونياى ،وەك كەبلێ بێ ئەدەبە و خەلك بەسووك تەماشا دەكا و حەقى كەس رەچاو ناكا زۆر بلێ يەو زۆر خۆرەو زۆر خەۆوكە ،لەغەيرى كاتى نوستن دەنوێ لەشوێنى دادەنيشێ شايستەى خۆى نى يە .. هەروەها ئەوانە و هاوێنەى ئەمانە، بەنيسبەت جل و بەرگى :جل و بەرگى لێ نايێ، جل و بەرگى فشەو فراوانە، جل و بەرگى پيسەو مندالانەيە هتد ئەمانەو هاوێنەى ئەمانە هەمووى غەيبەتن و غەيبەتيش هەر ئەوە نيە بەزمان بيكەى بەلكو بەئاماژەو نووسين و جولانەوە و تيلكەى چاو بەهەر شێوەێى بێ كەقەصدو مەبەستێ دەگەيەنێ وە ببێ بە غەيبەت ﴿٢٤﴾ احياء علوم الدين ج٣ل ١٣٤-١٤٦ .

جا هەر يەكێ تووشى غەيبەتى براى موسلمانى بوو لەبەرامبەريا دوعاى

خێری بۆ بكات پەشیمان ببێتەوەو بچێتە لای ئەو كەسەی كە غەیبەتی كردوە، گەردەنی خۆی پێ ئازاد بكات، پێش ئەوەی ئەو رۆژە بێتە پێشەوە، پێغەمبەر ﷺ لەبارەیەوە فەرموویەتی (ئەوەی حەقێكی برای موسلمانێ لەسەرە لەماڵ، لەناموس یا لەهەر شتێ بابچێ ساغی بكاتەوە و خۆی لێ رزگار بكات پێش ئەوەی رۆژێ دابێ و دینارو درهەمی تیا نەبێ، جا لەخێرو حەسەناتی هەلبگرێ بۆ خاوەن هەقەكە وە ئەگەر خێرو حەسەناتی نەبێ ،لەگوناه و تاوانی خاوەن حەقەكە هەل بگرن و بۆسەر خراپەو تاوانەكانی ئەو بەزیادی بكەن) متفق علیه .

### ٥- قسەو وتاری زیادو بێ سوود (اللغو):

لەغوە بریتیە لەقسەو وتاری زیادو بێ نرخ و سوود، غەیبەت یەكجار هاتووە لەقورئانا، بەلام لەغوە نزیكەی یانزە جار هاتووە بە موشتەقەكانیەوە، ئەمەش دیارە نیشانەی ئەوەیە غەیبەت كەمترە لەچاو لەغوە، لەغوە گەلێ زیاترە لەغەیبەت، جا ئەگەر غەیبەت ئاوابێ وەك باسمان كرد، دەبێ لەغوە چۆن بێ؟ خوای گەورە لەوەصف و مەدحی ئیماندارانی سەركەوتوو دەفەرموێ ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ ۝٣﴾ المومنون (بەراستی و بێ گوومان سەركەوتوون ئیمانداران ،ئەوانەی لەنوێژەكانیان بەترس و بیم و مل كەچی یەوە دەكەن وە ئەوانەی بەر هەلستی و لەغوە دەكەن) ، هەروەها لەسورەتی فورقاندا مەدح و رەوشتی ئیمانداران كەناوی ناون بەندەكانی بەخشندە (عباد الرحمن)دەفەرمووێ ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ

وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغْوِ مَرُّواْ كِرَامًا ﴿٧٢﴾ الفرقان ٧٢، واته: (ئه‌وانه‌ی به هیچ شێوه‌یی شایه‌دی به‌درۆو زوڵم ناده‌ن و ئه‌گه‌ر رابووردن به‌لای له‌غوه تێكه‌ڵی نابن و رێزو حورمه‌تی خۆیان ده‌پارێزن).به‌ڵێ له‌غوه رێزو حورمه‌تی ئاده‌میزاد له‌به‌ین ده‌بات و عیززه‌ت و كه‌رامه‌تی تێك ده‌شكێنێ ،به‌ختیاری و ئاسوده‌یی ده‌روون شه‌پرزه ده‌كات، زاكیره ناهێڵێ و دڵ ڕه‌ق ده‌كا و مێشك ماندوو ده‌كاو تووشی ژانه سه‌ری ده‌كات، بۆیه ئه‌م ره‌وشته پیسه شایسته‌ی ئاده‌میزادی خاوه‌ن ئیمان نی یه .

خوای گه‌وره له‌مه‌دحی به‌هه‌شتدا ده‌فه‌رمووێ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّابًا ﴿٣٥﴾ النبا ٣٥ واته: (تیێدا گوێیان لێ نابێ له‌له‌غوه و درۆ).

هه‌روه‌ها خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا ﴿٢٦﴾ الواقیعه ٢٦ (له‌ناو به‌هه‌شتا له‌غوه و قسه‌و قسه‌سه‌رۆك و كاری تاوان و گوناه نابیستن، ته‌نها پێ یان ده‌ووترێ سه‌لام سه‌لام ) له‌و ئایه‌تانه‌دا به‌ده‌رده‌كه‌وێ كه‌له‌غوه و درۆ و تاوان خزمی یه‌كن ئاسووده‌یی و به‌خته‌وه‌ری ده‌روون كه‌م ده‌كه‌نه‌وه.

یه‌كێ خۆی له‌له‌غوه هه‌ل ده‌قورتێنێ كه به‌ته‌واوی ئاگای له بازاری ئیمان نی یه ، وه نرخ و قیمه‌تی كات نازانێ و ناترسێ له دل ره‌قی و بێ زه‌ینی و دووربین نی یه بۆ ئه‌نجامێكی باش و ئاسووده.

له‌فه‌رمووده‌دا هاتووه پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رمووێ (من كان یومن بالله ویوم الاخر فلقیل خیرا او لیصمت ) متفق علیه، واته: (ئه‌وه‌ی باوه‌ری به‌خواو رۆژی دوایی هه‌یه با قسه‌و ووتاری خێر بفه‌رمووێ ده‌نا كرو بێ ده‌نگ بێ) .

له‌ئه‌بی موسا ره‌زای خوای لێ بێ ووتی: وته پێغه‌مبه‌ر ﷺ :باشترین

موسلمان كامه‌یه فه‌رمووی (ئه‌وه‌ی خه‌لك له‌ده‌ست و زمانی ئه‌مین و سه‌لامه‌ت بیّ ) متفق علیه .

وه له كوری عومه‌ره‌وه ڕه‌زای خوای لیّ بیّ ووتی پیّغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی (زۆر قسان نه‌كه‌ن به‌غه‌یری زیكرو یادی خوا ،بزانن به‌راستی زۆر قسه كردن به‌غه‌یری زیكرو یادی خوا دل تووشی قه‌سوه‌ت و ڕه‌قی ده‌كات، وه دوورترین خه‌لك له‌خوای گه‌وره ئه‌وانه‌ن كه دلیان ره‌قه) رواه الترمذي .

هه‌روه‌ها پیّغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رمویّ (كاتیّ كه رۆله‌ی ئاده‌می به‌یانی كرده‌وه، هه‌موو ئه‌ندامه‌كانی له‌شی ده‌سته‌و دامیّنی زمان ده‌بن، ده‌لیّن: له‌خوای گه‌وره بترسیّ كه‌ده‌م راستی ئیّمه‌ی، به هیلاكه‌تمان نه‌ده‌ی ئه‌گه‌ر خۆڕابگری خۆمان ڕاگرتووه و ئه‌گه‌ر خواروو خیّچ بیه‌وه ئیمه‌ش له‌گه‌ل خۆتا ده‌فه‌وتیّنیّ خوارو خیّچ ده‌بینه‌وه) رواه الترمذی.

جا برای موسلمان بزانه ئه‌و یاریه بیّ سوودانه‌ی كات و وه‌ختیّكی زۆرت لیّ به‌فیڕۆ ده‌ده‌ن ئه‌وانه‌ش له‌غودن ،وه‌ك دامه‌و دۆمینه‌و قومار و بلیاردو فیشه‌و گویّ دانه گۆرانی بیّ سوود و سه‌یركردنی صحن و ته‌له‌فزیۆن و فیلمه‌كانی سینه‌ماو ڤیدیۆ له‌وانه كه‌بیّ سوودو قازانجن، هه‌روه‌ها دانیشتن له‌گه‌لّ هاوه‌لاّن و یارانی ئه‌م بازاڕه‌و ده‌نگ و باسیان و قسه‌و قسه‌ڕۆكیان هه‌ر هه‌موویان له‌بابی له‌غوه‌ن و مادام بیّ سوود و قازانج بن .

وه پیّغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویست ﷺ ده‌فه‌رمویّ (پیاو هه‌یه قسه‌یێ ده‌كا به‌بیّ موبالاتی، مایه‌ی ڕه‌زامه‌ندی خوای گه‌وره‌یه و چه‌ند پله‌یێ پیّی به‌رز ده‌بیّته‌وه، وه‌پیاویش هه‌یه قسه‌یێ ده‌كا به‌بیّ موبالاتی مایه‌ی تووڕه‌یی و خه‌شمی خوای گه‌وره‌یه، پیّی ده‌كه‌ویّته ئاگری دۆزه‌خ) رواه البخاری.

ئەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەئادەمیزادەكانی دەوێ، هەرچی ووزەو تاقەتی شاراوەی ناو ئادەمیزاد هەیە بیتەقێنێتەوە و مەیدانی پێشكەوتن و شارستانیەتی(تمدن)ی پێ بەرێتە پێشەوەو بكەوێتە مەیدانی گەڕو خزمەت گوزاری و دووركەوتنەوە لەهەموو دواكەوتویەك و ناتەواویەك، نەك خەریك بوون و كات كوشتن بەشتی پڕوپوچ و بێ سوود وەك لەغوەو كاری بێ سوود هاووێنەیان ﴿٢٥﴾

وەك مامۆستایانی بێدارو ماندونەناس فەرموویانە ئەرك و واجبەكان زۆرترن لەكات و ساتەكان (الواجبت اكثر من الاوقات)

## ٦- جنێو یا جوون دان

جنێو یا جوون دان جۆرە ووتەیەكی ناشیرین و ناخۆش و ڕەقە بۆسووك كردن و ئیهانەو ئازاردانی دەروونی ئادەمیزاد دەووترێ بەردێك و كوچكەیەكە كەڕێزو كەرامەتی پێ دەشكێندرێ، وەكو جۆرە تیخ و چەقۆیەكی پیسە، دلانی پێ زامار دەكرێ ئەم جنێودانەش هی كەسانێكن پەروەردەی شەقام، كۆلانەكانن، ڕێزو حورمەتی هیچ كەس نازانن، هەروەها ڕەوشتی كەسانێكن كەدڵ تەسك و بێ سەبرن وەدڵ ڕەق و بێ شەرمن و زمان پیس و تەبیعەت نەوین، دوورن لەڕەوشتی جوان، دوورن لەئایین، ئەو جۆرە كەسانە واحالی بوونە، ئەگەر جنێو نەدەن ناتوانن دڵە ڕەش و ڕەقەكەیان ڕازی بكەن، جاروایە گیروگرفتی بچووك زۆر گەورە دەكەن، جاری واهەیە ماڵێ یا چەند ماڵێ كاول دەكەن، بەلاّم ئادەمیزادی موسڵمان و خاوەن باوەڕ خوڕەوشتی موسڵمانانە زمانێكی پاراو عەقڵێكی فراوان و دڵێكی ساف و بێ گەردی هەیە، ئاگای

لەفــــەرموودەكانی مامۆســــتاكەیەتی كەپێغەمبــــەری خۆشەویــــستە ﷺ دەفەرمووێ (جون و جنێودانە موسڵمانان فـسقەو لـەدین دەرچـوونە كوشـتنی كوفرو بێ باوەڕییە)(سباب المسلم فـسق وقتالـه كفـر) هـەروەها پێغەمبـەری خۆشەویست ﷺ دەفەرمووێ، لەناو گوناهە گەورەكان، لەهەمووان گـەورەتر، ئەوەیە یەكێ جنێو بە دایك و باوكی خۆی بدات وتیان ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئادەمیزاد چۆن جوون بـەدایك و بـاوكی خـۆی دەدات؟ فـەرمووی ئـەو جنێـو بەدایك و باوكی یەكێ دەدات و ئەو كەسەش لەوەلامدا جنێوی پـێ دەداتـەوە (كەواتە جنێوی بەدایك و باوكی خۆی دا) رواه البخاری .

جنێودان خلتەی پیسی بـوغزو قینـەو حەسـوودی و تـورەیی یـە لـەدلی ئادەمیزادا ،جاری واهەیە لەدەم و زارا دەردەچێ بۆ ئارام كردنەوەو رازی كردنی شەیتانە پیس و چەپەلەكان ، چونكە بوغزو قین و حەسوودی و تـورەیی..هتـد هێلانەی شـەیتانەكانە لـەدل و دەروونـەكان ... پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمووێ :ئەگەر دوو كەس جنێویان بەیەكدا ئەوە گوناه و تاوانی جوونەكان، لەسەر ئەو كەسەیە كەلەسەرەتاوە جوونی داو، بەشەرتێ جوون پێ دراوەكە زیـادە جـوونی لەبەرامبەر نەدابێتـەوە، لەئـەبوو هـورەیرە ڕەزای خـوای لێ بـێ، پیاوێكیـان هێنایە لای پێغەمبەر ﷺ عارەقی خواردبۆوە، فـەرمووی لێ ی دەن، ئـەبوو هورەیرە گووتی : لەئێمە هەبوو بەدەست لێ ی دا، ئەوەی بەنەعلی خۆی لێـی دا ئەوەی بەجل و بەرگی خۆی لێی دا، جا پاش ئەوەی كـابرا رۆیـشت هەنـدێ ووتیان : خودا ریسوات كات، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەمە مەلێن یارمەتی شەیتان مەدەن بەسەریەوە.

هــەروەها لەئــەبوو هــورەیرەوە فــەرمووی بیــستم لــە پێغەمبــەر ﷺ

فەرمووی (ئەوەی زینا بداتە پال مەملوكەی خۆی (وەیا هەر ئافرەتێكی تر وەك پێ ی بلێ قەحپە یا گاندەر لەرۆژی قیامەتدا حەدی لێ دەردەكرێ (كەهەشتا جەلدەیە) مەگەر ئەوەی دەیلێ وابێ) متفق علیە وەلە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی جوون مەدەنە مردووان چونكە ئەوان گەیشتن بەوەی پێشیان خستووە لەكارو كردەوە )رواه البخاري . لەجابرەوە رەزای خوای لێ بێ كە پێغەمبەر ﷺ چووە لای دایكی سائیب یا موسەیب پێ ی فەرموو ئەوە لەبەرچی دەلەرزیت ؟ووتی لەرزو تام لێ یە و خوا موبارەكی نەكات، فەرمووی جنێو مەدە بەلەرزوتا ،چونكە گوناه دەوەرێنێ لەئادەمیزاد وەك چۆن كورە خلتەی ئاسن دەوەرێنێ )رواه مسلم .

لەئەبی مونزیر ئوبەی كوری كەعب رەزای خوای لێ بێ ووتی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (جنێو بەبا مەدەن ،ئەگەر دیتان شتێ و حەزتان لێ ی نەكرد، بلێن پەروەردگارا ئێمە پرسیاری خێری ئەو بایەت لێ دەكەین و ئەو خێرەی كە تێ ی دایە و ئەو خێرەی كە ئەمرت پێ ی كردووە ،خۆمان بەتۆ دەپارێزین لەشەری ئەو بایەو لەو شەڕەی ئەمرت پێ ی كردووە) رواه الترمذي.

لەئەبوو زەرەوە رەزای خوای لێ بی كە گوێی لە پێغەمبەری خوا بووە ﷺ فەرموویەتی: (هەر كەسێ فاسقێتی یا كافرێتی بداتە پال پیاوێ ئەگر وانەبێ بەسەر خۆی دا دەگەرێتەوە) رواه الشیخان.

هەروەها لەئەبوو هوورەیرە رەزای خوای لێ بێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (دوو شت هەیە لەناو خەلك و مەردوومدا كوفرو بێ باوەری پێ وەیە تانەو تەعن دان لەنەسەب (وەك بلێ ی بیژی، یا تۆ كوری باوكت نی.. هتد ) هەروەها گریان و لەخۆدان لەسەر مردوو ﴿٢٦﴾ رواه مسلم .

هەروەها هەر خۆی بۆمان دەگێڕتەوە : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (ئەگەر یەكێ وتی خەڵك و مەردووم هەمووی بەهیلاك چوونە، ئەوە بەخۆی لەهەمووان خراپتر بەهیلاك چووە ﴿٢٧﴾ رواه مسلم .

لەعائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرموویەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (ئەگەر هاورێیەكتان مرد وازی لێ بێنن مەكەونە باسی بەجوون و غەیبەت ﴿٢٨﴾ رواه ابو داود و بخاری.

لەئەبوو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ ووتی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی خوای گەورە فەرموویەتی: (ئازارم پێ دەگەیەنێ رۆڵەی ئادەمی كە دەڵێ ئەی زەمان كاول بێ( یا دەورانت برۆخێ، یا سالی رەشە یا تف لەو زەمانە..هتد) جا قسەی ناڕێك بەزەمان و رۆژگار نەدات، چونكە من زەمانم، منم شەو رۆژ بەدوای یەكا دێنم، هەرچی خواستم لێ بێ ئەی بەمەوە ،یا لەناوی دەبەم )رواه مسلم والامام احمد لەزەیدی كوری خالد جوهنی رەزای خوای لێ بێ ووتی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (جنێو مەدەن بەكەلەشێر چونكە بۆ نوێژ ئاگارتان دەكاتەوە و هەڵتان دەستێنێ )رواه ابو داود باسناد صحیح .

بەڵێ برای شیرینم هەر لەرێگای زمان و گوێچكە و چاوو دلەوەیە ،تووشی غەیبەت و لەغوەو درۆو جوێن و بوختان دێین، بۆیە خوای گەورە یەكێ لەئامۆژگاریەكانی بۆ ئیمە ئەوەیە ئەی ئادەمیزادی خاوەن باوەر ئاگاداری خۆت بەو هۆشیارو ووریا بە وەلەسەر كارو كردارو گوفتارێ مەبە كە عیلم و زانیاریت پێی نیە و بزانە گوێچكە و چاوو دڵ بەسەرتۆوە بەر پرسیارە وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ الاسراء ٣٦.ئەوجا با هەول دەین ئەو ئەمانەتە بەپاكی

به‌په‌روه‌ردگاری بیٚ هاوتا بگه‌ینینه‌وه .

**٧- حسوودی :**

حه‌سوودی له‌و نه‌خۆشیه ده‌رونیانه‌یه، كه هێلانـه‌و میكرۆبـی شـه‌یتانی، خۆی تیا ئاخنیوه خاوه‌نه‌كه‌ی تووشی وێلی و گومڕایی و مایه پووچ و فـه‌وتان ده‌كات، تووشی ده‌ردو به‌لاو غـه‌م و قـه‌هر و سـه‌خله‌تی و پـه‌ژاره‌یی ده‌كـات، به‌راستی حه‌سوودی نه‌خۆشیه‌كی گه‌لیٚ پیسه، بۆنی كوفرو بیٚ بـاوه‌ڕی لیٚ دیٚ، وه مال و عیززه‌ت و ناموس و كه‌رامه‌ت و سه‌عاده‌تی ئاده‌میزاد ده‌روژێنـیٚ و دێنێته هه‌ژان و تیا چوون و فـه‌وتان ،بـه‌لیٚ حه‌سـوودی یـه وا له‌چـاو ده‌كـات كه‌پیس و پۆخل بیٚ، بۆمبای فه‌وتێنه‌ری شاراوه وه‌ك تیر بهاوێژیٚ بـه‌م لاو ئـه‌و لای دا مال و گیانی به‌شه‌رو ئاده‌میزادی به‌هیلاك بدات .

باشه بۆ ده‌بیٚ حه‌سوودی به‌فلان و فسال بیردریٚ؟ خۆ ئه‌و ماله‌ی یـا ئـه‌و پله‌یه‌ی یا ئه‌و نیعمه‌ته‌ی بۆییٚ نه‌دراوه‌تیٚ هه‌تا هه‌تاییٚ پیٚ ی بحه‌سێته‌وه بـه‌لك و بۆییٚ پیٚ ی دراوه تـاكو پـیٚ ی تـاقی بكرێتـه‌وه وه ئیمتحـان بكـریٚ ئـاخۆ شوكرانه‌ی خوا ده‌كات یا نه‌ء ، یا له‌وانه‌یه بۆیه پێیدرابیٚ، تاكو له‌دونیاوه پـیٚ ی مه‌شغول بیٚ و قه‌هرو خه‌فه‌ت بخواو خزمه‌ت كاری بـیٚ پێـوه موشـققه‌ت و ماندوو بیٚ، یا له‌وانه‌یه بۆییٚ پێیدرابیٚ، تـاكو له‌قیامـه‌ت بـیٚ به‌شـی بكـات تووشی مال وێرانی خۆی بكات ،جا به‌هه‌ر جۆریانی درابیتیٚ شایـسته‌ی‌به‌زه‌یی پیٚ هاتنه‌وه‌یه و زگ پیٚ سوتانه له حه‌قیقه‌تدا نه‌ك حه‌ساده‌ت پیٚ بردنی ..

حه‌سوودی كه‌ی مانای ئیمانی تیایه؟ كه‌تۆ چیت بـۆ خـۆت پـیٚ خۆشـه، ئه‌ویشت ده‌بیٚ بۆ براكه‌ت پیٚ خۆش بـیٚ ،نـه‌ك حه‌سـوودی پـیٚ ببـه‌ی، بـه‌لیٚ

حەسوودی یە ئیمان پوچەل دەكاتەوە، پیلان دەگێرێ لەدل و دەروون و مێشكدا بۆ لەبەین بردنی نیعمەتەكانی خوای گەورە، كەبەدەستی پر حیكمەت و دانایی خۆی بەخشیویەتی. هەروەها حەسوودی خۆشەویستی و تەبایی و یەكێتی نایەلێ، هانی خاوەنەكەی بۆ درۆ و غەیبەت و بوختان و جنێوو فیتنە و ئاشوب دەدات، دیارە ئەم حەسوودیەش بەرهەمی داری كوفرو بێ ئاگاییە لەخوا، كەشەیتان لەدڵ و دەروونی لەخوا بێ ئاگایان دەیروێنێ پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: خۆتان بپارێزن لەحەسوودی، چونكە بەڕاستی حەسوودی چاكان دەخوات وەك چۆن ئاگر داری دەخوات )رواه ابو داود وابن ماجه .

زۆر كەس هەیە نوێژ دەكاو بەرۆژو دەبێ، زەكات دەداو ئیتر بەئاپینەوە زۆر خەریكە ، لەو لاشەوە ئاگای لەبەرهەمی ئیمانەكەی نی یە كە شەیتان ئاگری تێ بەرداوە، مایە پووچی هێشتوتەوە، بەلێ زۆر كەس نەفس و گیانی وایە عارەق ناخوات مالی حەرام ناخوات هەرچی گوناهی ماددیاتە بەرچاوە ناكات، لە لۆمەی ئەم و ئەو دەترسێ، كەناو ناتۆرەی خراپی بەدوو بكەوێ، ئیدی عیززەتی نەفسی و حوكمی عادەت قەبولی ناكات، جا شەیتان دەزانێ بەم ڕێگایە ماددیانە پێی بەهیلاك ناچێت پیلانی لێ دادەنێتەوە لەڕێگەی ڕوح و مەعنەویەتەوە بەهیلاكی بدات، هەوڵ دەدا كاری چاكی پێ دەكات بۆ ڕیاو ڕوپامایی، یا حەسودی و ڕق و كینی لەدڵیا دەروێنێ، یا لووت بەرزی ...هتد .چونكە ئاواتی شەیتان هەریەك ئاواتە ئەویش ئەوەیە ئیمانەكەی لێ بچوێنێ و پووچەڵ بكاتەوە، جا بەهەر جۆرێ بێ یا بەهەر شیوەیێ بێ، گرنگ نیە.

لەزوبەیری كوڕی عەووام پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (خەریكە بكەوێتە ناوتان دەردو بەلاّی نەتەوەو ئوممەتەكانی پێش ئێوە كەحەسودی و ڕق و كینە

بەڕاستی تاشەرن، نالێم تا شەری موونە بەلكو تاشەڕی دین و ئیمانن، قەسەم بەوكەسەی گیانی بەدەستە ناچنە بەهەشت هەتا ئیمان نەهێنن ونیمان نـاهێنن تاكو یەكتریتان خۆش نەوێ ئایا هەوالێتان پێ بدەم ئەمە چۆن دەبێ و لـەناوتان دائەمەزرێ سەلام زۆر لەیەكتر بكەن) رواه الترمذي، جـا بـرای موسـلمان ڕق و كینەو حەسودی كەدین و ئیمان دەتاشن، ئایا دەبـێ هـەلگری ئـایین و ئیمـان لەدلی خۆی جێی بۆ بكاتەوە بۆیان، دیـارە كـەس گـورگ لەگـەلْ بەرخـەكانی تێكەلْ ناكات، لەئاییـنی پیرۆزی ئیسلامدا سوننەتە ئینـسان هـەموو بـەیانیان ئەم ڕاستیە وەبیر خۆی بێنێتـەوە هـەروەها ئێـوارەش دووبـارەی بكاتـەوە وەك دەفەرمووێ (اللهم ما اصبح بی مـن نعمـة او باحـد مـن خلقـك فمنـك وحدك لاشريك لك فلك الحمد ولـك الـشكر )﴿٣٠﴾ واتـە: پـەروەردگارا لەگـەلْ هـەر نیعمەتێكی بەیانی پێ كردنەوەما یادیـار دەبـێ بەهـەر بـەدیهێنراوێكی تـرا، لەلای تۆی تاك و تەنهایە، هیچ هاوبەشێكت نیە جاهەر تۆی شایستەی هەموو حەمدو ستایشێك و هەر تۆی شایستەی هەموو شوكرو سوپاسێك..

جا ئەم زیكرو ویردە بیری ئادەمیزاد دەخاتەوە كەدابەش كـاری نیعمـەت خوای گەورەیە بەدەستی پـڕ حیكمـەت و دانـایی دەیبەخـشێتەوە وشایـستەی ڕەخنە لێ گرتن نیە چونكە كەسێ لەخۆی كارزانترو زانـاتر نیـە بـەلكو خـۆی لەهیچ ڕووێكەوە كەم و كوڕی ڕووی تێ ناكـات جـا دەبـێ حەسـودی بەبەشـی خەلك بۆ بردرێ!!چاوپیسیش هەر لەدونیای حەسودانەوەیە (بەنیمچە درێژیـەك لەكتابی شیفای قورئانی نوسیومانە)

# برایەتی

ئادەمیزادەکان بەگشتی بران نەك هەر لەیەك ڕووەوە، بەڵکو لەزۆر لایەنەوە، جا لەڕووەکانی مادیەوە، یا لەڕووەکانی مەعنەویەوە بێ، بۆ نمونە لەڕووی مادیەوە ئادەمیزادەکان گشتیان لەگڵ و خۆڵ دروست کراون و یەك شێوەو پێك هاتوویان هەیە، بەدەنییان پێك هاتووە لەیەك شێوە کانزاکان و کەگشتیان لەگڵ کۆبۆتەوە، دیارە سەرەنجامەکەشیان هەر دەبێتە گڵ وەك کە بۆ ئەم ڕاستیە گۆڕستان شایەدە، هەروەها هاوشێوەی لەشیان، ئەمەش جۆرە برایەتەتێکی ترە، کەیەك شێوە دڵ و کۆئەندامی هەرس و کۆئەندامی هەناسە دان و دەزگای ئەعصاب هتد.یان هەیە. هەروەها لەڕووی نەسەبیەوەش بران، ڕۆڵانی دایك وباوکێکن، جاهەیانە لەباوکەوە دەگەن بەیەك و وەهەیانە لەباپیرەوە هەیانە دەپشت بەولاوە هەیانە بەسەد پشت بەولاوە تادەگاتە باپیرە گەورەمان حەزرەتی نوح یا لەویش گەورەتر باپیرەی ئادەمیزادێتی باوکەئادەم .
هەرودها لەڕووی مەعنەویەتیشەوە ئادەمیزادەکان گشتیان بران بەوەی گشتیان دەستکردی یەك خودان و یەك سەرچاوەن، سەرەتای گشتیان پێك هاتووە لەفوێکی ڕووحە خودایی (کەکراوە بەبەدەنە قوڕی حەزرەتی ئادەم ) هەروەها بران لەچارەنووس و کەیەك ڕێگاو یەك سەرچاوە دەیان گرێتە ئەستۆی خۆی کەگۆڕستان و مەیدانی مەحشەرە،هەروەها ئادەمیزادەکان هاو شێوەن لەپێك هاتووە مەعنەویەکان وەك یەك شێوەو ڕوح و گیانیان هەیە، هەروەها هاوشێوەن لەبنچینەدا لەهەست و نەست و ژیری و بیرو ئەندێشەو سۆزو فیترەو..هتد.هەروەها بران لەهاوشێوەی سوڕی ژیان و خوێن و دەمارو داواکاریان و داوالێکراویان، هەروەها هاو شێوەن و بران لەوەی گشت

تاكه‌كانیان وه‌ك یه‌ك خاوه‌ن به‌شن له‌بنچینه‌دا له‌خاوه‌نێتی ژێری شه‌هوه‌تی جنسی و وه‌سوه‌سه‌ی شه‌یتانی و هێزی قارو قین و تووڕه‌یی...هتد.وه‌هه‌روه‌ها له‌گه‌ڵ ئه‌م هه‌موو برایه‌تیه‌ش، برایه‌تی تر ماوه كه‌تاجی سه‌ری هه‌موو برایه‌تیه‌كانه كه‌برایه‌تی ئیمانداریتیه، بۆیه تاجی سه‌ریانه، چونكه ئیعتراف و دان ده‌نێ به‌هه‌موو به‌شه برایه‌تیه‌كانی تری ئاده‌میزاد، ئاده‌میزاد ده‌گه‌یه‌نێته چڵه پۆپه‌ی برایه‌تی دیاره برایه‌تیش ژیان خۆش ده‌كات و گوزه‌ران ده‌ڕازێنێته‌وه وه‌هه‌موو گیر گرفته كۆمه‌لآیه‌تیه‌كان چاره‌سه‌ر ده‌كات، و هه‌روه‌ها گه‌لێ نه‌خۆشی ده‌روونی ڕیشه‌كه‌ێش ده‌كات، كه‌هیچ ده‌رمانێك چاره‌یان ناكات ته‌نها برایه‌تی نه‌بێت.

ئه‌و برایه‌تیانه‌ی گه‌لێ ماف و حه‌ق ده‌خاته سه‌ر ئاده‌میزاده‌كان له‌ئاست یه‌كا، له‌برایه‌تی ئیمانداریتی دایه،ئیمانداران گه‌لێ ماف و حه‌قیان به‌سه‌ر یه‌كه‌وه هه‌یه پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رمووێ ماف و حه‌قی موسڵمان به‌سه‌ر موسڵمان شه‌ش شته(وه‌ك باسمان كرد له‌باسی سه‌لام كردن ڕه‌وشتی پیاو چاكانه) هه‌روه‌ها له‌حه‌قی برایه‌تیه خاوه‌ن باوه‌ڕه‌كان شه‌وو ڕۆژ تێده‌كۆشن و گیانی خۆیان فیدا ده‌كه‌ن بۆئه‌وه‌ی به‌رنامه‌و په‌یامی خوا بگه‌یه‌نن به‌برایانی تری ئاده‌میزاده‌كان، تاكو ڕه‌گ و ڕیشه‌ی هه‌موو برایه‌تیه‌كان ببوژێته‌وه، كۆمه‌لآنی مه‌ردووم ئاسوده‌و به‌ختیار بن، هه‌روه‌ها له‌تیشكی ئه‌م برایه‌تیانه ده‌دره‌وشێنه‌وه، له‌كاتێكدا كه‌كۆمه‌ڵێ یا گه‌لێ تووشی ئافات و به‌لآیێ دێ باقی ئاده‌میزاده‌كانی سه‌ر زه‌وی ده‌خرۆشێن و سۆزو ڕه‌حمه‌تیان بۆیان ده‌بزوێ و هه‌ست به‌مافیان ده‌كه‌ن له‌سه‌ر خۆیان و هه‌وڵی چاره‌سه‌ری گیروگرفتیان ده‌ده‌ن، هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر ئاده‌میزادێ به‌لآیێكی به‌سه‌ر بێ و خه‌ڵكان له‌ده‌ورو

بەری خۆی ببینێ، پەنایان بۆ دەباو بانگیان لێ دەکات بۆ فریاکەوتنی، خـەڵك و مەردوومەکەش بەسۆزو تەنگە تاوەوە بەهانای دەچن، وەك پێی وترابێ ئەمە برای ئادەمی تۆیە ئەرکی سەرشانتە فریـای بکـەون و ڕزگـاری بکـەن. بـەڵام کوفرو بێ باوەڕی و خۆپەرستی و مەخلوق پەرسـتی و هاوو‌ێنـەیان دان نـانێن، بەهەموو بەشە برایەتیەکان، هەموو کـات و سـات لەهـەموو ڕوو لایەنێکـەوە لەهەوڵی ئەوەدان ڕەگ و ڕیـشەی برایـەتیان بپـچڕێنن تێـك و لێكیـان بـدەن، ئەمــەش دەبێتــە مایــەی بەدبــەختی و ژیــان ســەخڵەتی و نەخۆشــی زۆری کۆمەڵایەتی و نەفسی هتد. بەڕاستی برایەتی ئیمانـداریێتی تـەواو زۆر تونـدو بــەهێزە، چــونکە لەلایــەنی خــوای گــەورەوە بڕیــار دراوەو داواکــراوە وەك دەفەرمووێ (ئیمانداران برای یەکن جا صولح و ئاشـتی بخەنـە نێـوانی برایـانی خۆتان و خۆپارێزی بکەن لەخوای گەورەو ڕەجاو تکاتان وابێ ڕەحمتان پێ بکرێ )سورەتی الحجرات (١٠) جا لەم ئایەتەدا دەردەکەوێ برایەتی مانای تەقوایـەو جێگەی ئەو کەسانەیە بەتەمای ڕەحمەتی خودان.

برایەتی ئیمانداریێتی هەر بۆ چوار پێنج ڕۆژی دونیا نیە، بەڵکو بـۆ ڕۆژی هەمیشەیشە لەعالەمی بەرزەخ و بەهەشتدا، لـە دراوسـێتی خـودای گـەورەدا ئەمــە ئــەنجامی برایــەتی ئیمانداریێتیــە، بــەڵام هــەر برایــەتیێ تــا جەکــەی ئیمانداریێتی نەبێ ئەوا بێ ڕەگ و ڕیشە و بێ ئەنجامەو مایە پووچە وەلـەڕۆژی دواییدا دەبن بەدوژمن و ناحەزی یەکتر، وەك قورئـان لـەزۆر ئایەتەکانـدا ئـەم ڕاستیەمان بـۆ ڕوون دەکاتــەوە یــەکێ لــەم ئایەتانــەدا دەفــەرمووێ ﴿ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ۝٦٧﴾ (الزخرف ٦٧).

واتە:ئەوانەی یەکتریان زۆر خۆش ویستوە وەخۆشەویستی و برایەتیەکەیان

لەسەر بناغەی ئیمان نەبووە ئەوە لەڕۆژی قیامەتدا هەندێکیان دەبنە دوژمنی هەندێکی تریان و بەلاّم خواپەرستان برایەتی و خۆشەویستێتیان پتەو ترو بەردەوام دەبێ. هەروەها پێغەمبەر ﷺ ی خۆشەویستمان لەحەقی برایەتی موسڵمانییێتیدا دەفەرمووێ (موسڵمان شەش ماف و حەقی بەسەر موسڵمان هەیە، بەچاکەکاری و نیەت چاکیەوە :

- سەلامی لێ بکات کاتێ کەپێی دەگات.
- بەوەلاّمی داوەتیەوە بچێ ئەگەر داوەتی کرد.
- ئەگەر پژمی وە وتی الحمدالله پێی بڵێ یرحمك الله.
- وەئەگەر نەخۆش کەوت سەردانی بکات.
- وەبەدوای تەرمەکەی بکەوێ کاتێ کەمرد و بردیان بۆ ناشتن.

وەچیت بۆ گیان و نەفسی خۆت پێ خۆشە ئەویشت بۆ ئەوپێ خۆش بێ (تاج٥ ص١٦).

جا تەندروستی باش بێ یاژن و خانوو ماڵی باش بێ یا زانیاری و ئیمانی باش بێ یا سەروەت و سامانی باش بێ هتد.

سەیر ئەوەیە ئەو برایەتیە لەلای خوای گەورە ڕەش نابێتەوە، بەگژا چوونی ئیمانداران هەندێکیان بۆ هەندێکی تریان، وەك خوای گەورە دەفەرمووێ (ئەگەر دوو تایەفە لەئیمانداران شەڕیان لەگەڵ یەکا کرد، صولح و ئاشتی بخەنە نێوانیان)الحجرات ٩.

بەڵێ هەردوو تایەفەی بەئیماندار ناوهێناون وەهەروەها لەئایەتی پێشوش ئەم ڕاستیە دەردەکەوێ .

ئەگەر بەگژ یەك چوون گەیشتە یەکتر کوشتن هێشتا برایەتیەکەیان لەلای

خوا هه‌رماوه‌دا وه‌ك له دیارده‌ی ئه‌م ئایه‌ته ده‌رده‌كه‌وێ (كه‌باسی حه‌قی كوژراو ده‌كا ) ئه‌وه‌ی ببورێ شتێ له‌برای خۆی به‌نیه‌تی دواكه‌وتنی چاكه‌كاری و به‌جێ گه‌یاندنی ئیحسان له‌گه‌ڵ كردنی .البقره ۱۷۸.

كه‌واته برایه‌تی ئیمانداریه‌تی ره‌گێكی زۆر قوڵی هه‌یه‌و هیچ شتێ هه‌ڵی ناوه‌شێنیته‌وه مادام له‌ئیمانداریه‌تی ده‌رنه‌چێ ئه‌مه‌ش ده‌بێته روونه‌دانی گیروگرفت وه‌ئه‌گه‌ر رووشی دا چاره‌ی ئاسان بێ.

ئیماندار ئه‌و راستیه‌ی له‌بیر نه‌چێ كه‌خوای گه‌وره ئیماندارانی كردووه به‌براو وه‌ئه‌ویشی كردووه به‌برایان ،دیاره له‌م برایه‌تیه‌شدا حه‌ق و حقوقی زۆر هه‌یه، لێره‌دا به‌درێژی ئه‌م باسه جێی نابێته‌وه، به‌ڵام ده‌بێ ئه‌وه بزانین كه‌ئایینی پیرۆزی ئیسلام هه‌ر بۆ ئه‌وه نه‌هاتووه ئاده‌میزاد هاوپه‌یوه‌ند بكات، له‌گه‌ڵ په‌روه‌ردگاری و به‌س ،به‌ڵكو بۆ ئه‌وه هاتووه ئاده‌میزاد هاوپه‌یوه‌ندی بكات، له‌گه‌ڵ خوداو له‌گه‌ڵ ئاده‌میزادو دونیاو ژیان و ژینگه‌و كه‌ون و مه‌خلوقه‌كانی و هتد.هه‌ریه‌كه‌ی به‌حه‌قی خۆی و له سنوری خۆی، كه‌واته ئاده‌میزاد هه‌ر ته‌نها حه‌قی خوای له‌سه‌ر نیه‌و به‌س به‌ڵكو حه‌قی به‌ده‌نی خۆی و خێزانی و دایكی و باوكی و برای ئاده‌می و جیران و ژیان و شارو نیشتمان.. هتد له‌سه‌ره، هه‌ر حه‌قه‌ی به‌پله‌ی خۆی له‌جێی خۆی، وه‌ك له‌به‌رنامه زێرینیه‌كه‌ی خوای گه‌وره‌دا گشتی روون كراوه‌ته‌وه.جا ئاده‌میزادی ئیماندار خودا به‌وه رازی ده‌كات كه‌حه‌ق و مافی هه‌موو خاوه‌ن حه‌ق و مافه‌كان له‌جێگه‌ی خۆی دابنێ.

وصلى الله تعالى على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه وسلم

ربنا لا علم لنا الا ما علمتنا انك انت العليم الحكيم

تەواو بووم بەئیزنی خودا والحمدلله رب العالمین.

٢٩/جماد الاولی ١٤١٤

١٩٩٣/١١/١٣

داوای لێبوردن دەکەین لەکەم و کورپیەکانمان، ئەو راستیەمان لەبیر نەچێت کەتەنها خوای بالآدەست پاکە لەهەموو هەڵەو کەم و کوری.

**والحمد الله وحده....**

# خۆشه‌ویستی

خوای گه‌وره كه ئاده‌میزادی به‌دیهێناوه و كۆمه‌ڵێ غه‌رائیزی له‌گه‌ل سروشت و فیتره‌تی ئاخنیوه و داناوه، یه‌كێ له‌م غه‌رائیزه به‌ندایه‌تی و په‌رستنه و ئاده‌میزاد له‌به‌سه‌ر بردنی ژیانی ده‌بێ شوێنی ئه‌م غه‌ریزه‌یه پر بكاته‌وه، به‌هیچ شێوه‌یی ناتوانێ و بۆی ناكرێ ئه‌م بۆشاییه‌ی له‌سروشت و فیتره‌تی خۆی به‌به‌تالی بهێلێته‌وه ، ئه‌گه‌ر ئاده‌میزاد مانای به‌ندایه‌تیش نه‌زانی هه‌ر به‌نده‌یه، جا ئه‌گه‌ر به‌حه‌قی خۆی به‌نده نه‌بێ بۆ خالق و به‌دی هێنه‌ری، ئه‌وه به‌ناچاری ده‌بێ به‌نده بێ بۆ به‌دیهێنراوو مه‌خلوقه‌كان، یا بۆ هه‌واو ئاره‌زووی خۆی یا كه‌سانی وه‌ك خۆی، جا ئه‌وه‌ی جێگه‌ی سه‌رنج راكێشان و باس كردنه، خۆشه‌ویستی مانای به‌شێكی سه‌ره‌كی ئه‌م به‌ندایه‌تی یه پێك دێنێ، ترس و بیمیش به‌شێكی تری سه‌ركی ئه‌م به‌ندایه‌تیه‌یه، هه‌روه‌ها هیواو ئاوات و ئومێدو ته‌وه‌ككول و پشت به‌ستن و مل كه‌چی، دوعاو نزاو پارانه‌وه و تێكۆشان و دیفاع و پاراستنیش به‌شه‌كانی تری به‌ندایه‌تی و په‌رستنن، جا ئه‌م غه‌ریزه‌ی به‌ندایه‌تی و په‌رستنه سروشتی ئاده‌میزاد بۆش و به‌تاله وه‌هه‌ر ده‌بێ له ماوه‌ی ژیانی دا پری بكاته‌وه، جا واوه‌یلا بۆ ئه‌وه‌ی به‌حه‌قی خۆی پر ناكاته‌وه‌و سه‌ر له‌فیتره‌و سروشتی خۆی ده‌شێوێنێ و له‌گۆشه‌ی گومرایی ووێلی دا ژیانی له‌باوه‌ش ده‌گرێ و رۆژو شه‌وی لێ به‌رێ ده‌كات .

ئه‌وه‌ی مه‌به‌ست و قه‌صدی ئێمه بێ لێره‌دا باسی بكه‌ین، ته‌نها خۆشه‌ویستیه به‌ڵێ ئه‌م خۆشه‌ویستیه سه‌ره‌رای ئه‌وه‌ی كه گیان و رِوحی

به‌ندایه‌تی یه پێوه‌ر ێكیشه له‌كارو كرده‌وه‌كانیدا ،هه‌روه‌ها هانده‌رێك و به‌شه غه‌ریزه‌یه‌كی ئاوایه كار له‌هه‌موو لایه‌كانی ژیانی ده‌كات به‌ماددیات و مه‌عنه‌ویاته‌وه ، جا له‌رووی بیرو باوه‌ری بێ یا له‌رووی خوره‌وشت و ئه‌خلاق بێ یا له‌رووی ئاداب و نه‌ریتی بێ یا له‌رووی هه‌رشتێكدا بێ، پێویسته سه‌یری كیتاب و په‌رتووكی زانای بێ وێنه‌مان بكه‌ین كه‌خوای گه‌وره و میهره‌بانه ،كیتابه‌كه‌ش قورئانی پیرۆزه، بابزانین ئه‌و له‌باره‌ی خۆشه‌ویستیه‌وه چی ده‌فه‌رمووێ ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ﴿١٦٥﴾﴾ ١٦٥. واته: له‌خه‌لكان و مه‌ردوومان كه‌سانی ئاوا هه‌ن بێجگه له‌خودای گه‌وره شه‌ریك و هاوه‌لانی وایان گرتووه، خۆشیان ده‌وێن ودلیان داوه‌تێ وه‌ك خۆشه‌ویستی و دلدانێ به‌خوای گه‌وردو میهره‌بان، ئه‌وانه‌ی كه‌خاوه‌ن ئیمانی ڕاست و دروستن كۆله‌كه‌ی خۆشه‌ویستی و دالدانیان هه‌ر بۆ خوایه‌و به‌و داوه، جا ئه‌وانه‌ی له‌سروشت و فیتره‌ی خۆیان لایان داوه به‌وه‌ی دل و ده‌روونیان به خۆشه‌ویستی خوای گه‌وره پر نه‌كردۆته‌وه كه‌هه‌ر خۆی سه‌رچاوه‌ی هه‌موو خۆشه‌ویستنێكه، ئه‌و جۆره سته‌مكارانه كاتێ كه‌ئه‌شكه‌نجه‌و عه‌زاب و ئازاره‌كانی خودای ده‌بینن تێ ده‌گه‌ن و حالی ده‌بن كه‌سه‌رچاوه‌ی هه‌موو هێزو ده‌سه‌لاتێ هه‌ر هی خودایه، هه‌ر بۆ خوایه، هه‌ر خودای گه‌وره‌یه خاوه‌ن ئه‌شكه‌نجه‌و عه‌زابی توندو سه‌خته، هه‌روه‌ها خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێ ﴿قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ

وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّىٰ يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ﴿٢٤﴾ سورەتی التوبه ئایەتی ٢٤ واته : ئەی پێغەمبەری خودا بفەرموو بلێ ئەگەر ئێوه باوان و كوڕەكانتان و برایانی خۆتان و خێزانەكان و تیره و عەشیرەتی خۆتان و ئەو ماڵ و موڵكانەی كۆتان كردۆتەوەو كردووه بەسەریەكەوه و ئەو بازرگانیەی كەدەترسێن شكەست بێنێ و ئەو شوێن و باڵەخانەی تیا دەژیین، ئەمانەو هاووێنەیان ئەگەر لاتان خۆشەویستره و خۆشترتان دەوێ لەخوداو پێغەمبەری خوداو تێ كۆشان و جیهاد لەپێناو خوادا، ئەوه چاوەروانی قەهرو غەزەبی خودا بكەن، چونكه ئێوه بەلەبەین بردنی خۆشەویستی خوداو پێغەمبەرەكەی لەدڵتانا، وەپڕ كردنەوەی خۆشەویستی شتانێ كه شایستەنین، بەمەوه دەردەچن لەدین و فاسق دەبن وەبش زانن بێ گومان خوای گەوره هیدایەت و رینوومایی گەل و قەومی فاسق و لەدین دەرچوو ناكات، هەروەها خوای گەوره دەفەرموێ ﴿...﴾ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ (سورەتی ال عمران) ئایەتی ٣١ واته : ئەی پێغەمبەری خودا بفەرموو بلێ، ئەگەر ئێوه لەسەر رێگەی راست و دروستن و خواتان خۆش دەوێ و قەصدو مەبەستان خودایه و راستی و دروستییه، فەرموون بەدوای رێگەكەی من بكەون، دەكەونه دونیای خۆشەویستی خودایی، خوا خۆشتانی دەوێ و وەگوناه و تاوانەكانتان دەبووریّ، دەتان خاته ژێر رەحمەتی خۆیا، خوای گەوره

لێبووردووی میهرەبانە.

دونیای خۆشەویستی خودایی ئادەمیزاد دەگرێتەوە لەزولم و ستەم و بەدکاری و وێرانکاری و هەم و گوناه و خراپی و تاوانکارییێ، بەڵام بێ ئاگایی لەدونیای خۆشەویستی خودایی ئادومیزاد بێ ئاگا دەکات لەحەقیقەت و ڕاستی و دەکەوێتە دونیای زولم و ستەم گوناه و تاوانکاری.

خوای گەورە ئادەمیزادی دەست درێژیکەری خۆش ناوێ، وەك دەفەرمووێ ﴿وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ﴾ المائده٨٧، پیاوی بەدکارو وێرانکاری خۆش ناوێ وەك دەفەرمووێ ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾ (المائده٦٤) هەروەها خوای گەورە پیاوی موسریف و خائینی خۆش ناوێ وەك دەفەرمووێ ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ﴾ الاعراف ٣١، هەروەها دەفەرمووێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡخَآئِنِينَ﴾ الانفال ٥٨، خوای گەورە کافرو بێ باوەڕانی خۆش ناوێ وەك دەفەرمووێ ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ الروم٤٥، خوای گەورە پیاوی لووت بەرزو روح گەورەی خۆش ناوێ، هەروەها دەفەرمووێ ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٍ﴾ الحدید٢٣، واش مەزانن ئەوەی خوای گەورە خۆشی نەوێ، ئیدی هیچی بۆ نیەو زیانی پێ ناگا نەخێر بەڵکو تووشی نەوپەڕی ڕووڕەشی و خەجالەتی و بەدبەختی دەبێ، خوای گەورە لەڕەحمەتی خۆی بێ بەشی دەکا لەدونیاو لەقیامەت بەهەشتی پێ نابەخشێ، بەڵکو تووشی جۆرەها نەخۆشی دەروونی دەکات لەژیانی دونیا، کەمایەی بێ ئارامی و دڵتەنگی و سەخڵەتی یە، لەدوا ڕۆژیشدا تووشی ئەشکەنجەو عەزابی خۆی

دەكات، جەهەننەم و دۆزەخ دەبێ بە شوێنی هەتا هەتایی.

خوای گەورە ئادەمیزادی خواپەرستی خۆش دەوێ پیاوی دادپەروەرو پاك و خاوێن و چاكە خوازی خۆش دەوێ، خوای گەورە پیاوی خاوەن سەبرو ئارام و ئەوەی پشتی پێ ببەستێ و تەوەككولی لەسەر بكات خۆشیانی دەوێ، وەك لەم ئایەتانەدا دەردەكەوێ خوای گەورە دەفەرمووێ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾ التوبە/٤ ، وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ التوبة/١٠٨، وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ ال عمران/١٣٤، إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٤٢﴾ مائدة/٤٢، وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ ال عمران/١٤٦

جا وەنەبێ ئەوەی خوای گەورە خۆشی بوێ هیچی بۆنەبێ و هیچ سوودو قازانجێكی پێ ناگا، بەڵكو بەرێژەو ئەندازەی خۆشەویستیەكەی بۆ هەر كەسێ بێ پلەو پایەی بەرز دەكاتەوەو بەختیاری دەكات، لەناو ڕەحمەتی خۆیا دای دەپۆشێ، لەسەرەنجامدا بەهەشتی پێ دەبەخشێ، لەئاگری جەهەننەم و دۆزەخ دەیپارێزێ.

هەروەها خوای گەورە سەرزەنشتی نەفسی تەزكیەنەكراوە دەكاو دەفەرمووێ وَتُحِبُّونَ ٱلْمَالَ حُبًّا جَمًّا ﴿٢٠﴾ (الفجر ٢٠) واتە :ماڵی خۆش دەوێ بەخۆشەویستنێكی زۆر لەڕادەبەدەر، هەروەها دەفەرمووێ (انه لحب الخير لشديد) واتە: ئادەمیزادی لەخوا بێ ئاگا خۆشەویستێتی ماڵ و سەروەتی زۆر بەهێزو بەرزە.

هەروەها لەسورەتی (ابراهيم)خوای گەورە دەفەرمووێ ... وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ

وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا ۚ أُوْلَـٰٓئِكَ فِى ضَلَـٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٣﴾ ابراهيم /٢-٣، لەم ئایەتەشدا خوای گەورە هەڕەشە لـەبێ بـاوەڕان و كـافران دەكـات كەتێیدا دەفەرمووێ وا وەیلاو هەلاكەت بۆ بێ بـاوەڕان و كـافران لەعـەزاب و ئەشكەنجەی توندو بەهێز ئەو كافرانـە حالیـان وایـە ژیـانی دونیایـان خۆشـتر ویستووە لەخۆشویستنی خوداو ڕۆژی دوایی، بەم خۆشەویستیانەوە كەوتونەتـە بەرگری كردن لەڕێگەی ئایین و بەرنامەی خودای گـەورە خواسـت و ئـارەزووی ئـەوە دەكـەن كـەئایین و بەرنامـەی خـودای گـەورە بگـۆڕن و چـەوت و لاری بكەنەوە، بەڕاستی ئەم جۆرە كەسانە لەناو گومڕایی و وێڵی دان ودوورن لەحەق و ڕاستی.

ئێستاش دێینە سەرباسی فەرموودەكانی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بزانین ئەو چی دەفەرمووێ لەبارەی خۆشەویستی (عن انس عن نبی قـال ثـلاث من كن فیه وجد حلاوة الإیمان ان یكون الله ورسوله احب الیـه ممـا سـواهما وان یحب المرء لایحبه الا لله وان یكره یعود في الكفر كما یكره ان یقذف في النار)رواه البخـاری، واتە: لەئەنەسەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی هەركەسێ ئـەم سـێ خاڵەی تیـا بـێ، ئـەوە شـیرینی و حـەلاوەی ئیمـانی لەلایـەو چەشـتویەتی و دەیچێژێ :

**یەكەم**/خواو پێغەمبەری خوا لای، لەهەموو شتێ خۆشەویستر بێت.

**دووەم**/ئەگەر یەكێكی خۆش ویست تەنها لەبەر خوا بێ و هیچی تر.

**سێ یەم**/پێی ناخۆش بێ و بیكەرهێنێ بەوەی كەبگەڕێتەوە سەر كـوفر، وەك چۆن پێی ناخۆشەو دەیكەرهێنێ بیهاوێنە ناو ئاگر.

دیارە خۆشەویستێتی خواو پێغەمبەر ﷺ حاڵی بوونە لەكرۆكەو نـاوكی

حه‌ق و ڕاستی، هه‌روه‌ها نیشانه‌ی پاكی و زاڵ بوونه به‌سه‌ر نه‌فس و شه‌یتان، بۆیه به‌رهه‌می خۆشه‌ویستیه‌كه‌ش نوری هیدایه‌ت و شیرینی و حه‌لاوه‌ی ئیمانه، هه‌روه‌ها پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویست ﷺ ده‌فه‌رمووێ (من احب لله وابغض لله واعطی لله ومنع لله فقد استكمل ایمانه) واته: ئه‌وه‌ی خۆش، وویستنی له‌به‌ر خوا بێ و تووڕه‌یی و قینی هه‌رله‌به‌ر خوابێ، به‌خشین و عه‌تای هه‌رله‌به‌ر خوابێ، قه‌ده‌غه‌كردن و یاساغ كردنی هه‌ر قه‌صدو مه‌به‌ستی خوا بێ، به‌ڕاستی ئه‌و كه‌سه ئیمانی ته‌واوه به‌چڵه پۆپه‌ی ئیمان گه‌یشتووه، به‌ڵێ له‌و نه‌فسه‌یدا كه‌ته‌نها ئیمان حاكمه كه‌نوورو هیدایه‌ت و به‌هره‌و نیعمه‌تی خوایه، ئه‌وه ئیمانداره له‌دونیا له‌ناو بازنه‌ی ئیمانداریتی ده‌ژی، به‌پێچه‌وانه‌ی ئه‌وه‌ی كه‌نه‌فس و هه‌واو ئاره‌زووی خۆی پایه‌كێكی وه‌ك خۆی به‌سه‌ری زاڵه‌و فه‌رمان ڕه‌وایه‌تی..

جارێكیان باس هاته سه‌ر باسی خۆشه‌ویستی خوداو پێغه‌مبه‌ر ﷺ بۆیه حه‌زره‌تی ئیمامی عومه‌ر ووتی یا رسول الله به‌ڕاستی تۆم له‌هه‌موو كه‌سێ خۆشتر ده‌وێ ته‌نها له‌نه‌فس و گیانی خۆم نه‌بێ، جا پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی هیچ كه‌سێ ئیمانی ته‌واو نابێ تامنی له‌نه‌فس و گیانی خۆی خۆشتر نه‌وێ ، ئه‌وسا ئیمامی عومه‌ر فه‌رمووی وه‌الله یا رسول الله ئێستانه‌كه من تۆم له‌گیانی خۆشم خۆشتر ده‌وێ، جا پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی ئێستا ئه‌ی عومه‌ر ئیمانت له‌جێگه‌ی خۆیه‌تی .

هه‌ر له‌م باره‌یه‌وه پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی (لایؤمن احدكم حتی اكون احب الیه من والده وولده والناس اجمعین)رواه البخاری واته: هیچ كه‌سێكتان ئیمانی ته‌واو نابێ حه‌قیقه‌تی ئیمان به‌جێ ناگه‌یه‌نێ تاوه‌كو منی

له‌باوك و ڕۆڵه‌ی خۆی و وه‌له‌هه‌موو خه‌ڵك و مه‌ردوومانی خۆشتر نه‌وێت .

هه‌روه‌ها پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رمووێ (والذی نفسی بیده لاتدخلوا الجنة حتی تؤمنوا ولاتؤمنوا حتی تحابوا أو لا ادلکم علی شیء إذا فعلتموة تحاببتم ..افشوا السلام بینکم ) رواه مسلم .

قه‌سه‌م و سوێند به‌و زاته‌ی كه‌نه‌فس و گیانی منی به‌ده‌سته‌، ناچنه به‌هه‌شتیێ تاكو ئیمان نه‌هێنن، ئیمان ناهێن و ئیمانتان ته‌واو نابێ تاكو یه‌كترتان خۆش نه‌وێ، ئایا پێتان نیشان بده‌م كارو كرده‌وه‌یێ ببێ به‌مایه‌ی یه‌كتر خۆشویستنتان سه‌لام زۆر له‌یه‌كتر بكه‌ن ..

ئاده‌میزادی ئیماندار له‌ززه‌ت له‌خۆشه‌ویستی خواو پێغه‌مبه‌ری خواو ئیمانداران ده‌كات، به‌پێ ی پله‌و ئه‌ندازه‌ی ئیمانه‌كه‌ی

یه‌كێ هاته لای مامۆستا وتی به‌خوا من پێغه‌مبه‌رم هێنده خۆش ده‌وێ، ته‌نانه‌ت له‌خواشم خۆشتر ده‌وێ، مامۆستا لێ ی هاته وه‌لام و پێ ی وت وریا به ئاگاداری خۆت به ،نه‌زانین و شه‌یتان، وێل و گومرات نه‌كات و بزانه خۆشه‌ویستێتی خوای گه‌وره له‌پێشه‌وه‌ی هه‌موو شتێكه‌، ئه‌گه‌ر خۆشه‌ویستی پێغه‌مبه‌ری ئازیزت لا ڕووباره ئاوێ بێ، ئه‌وه ده‌بێ خۆشه‌ویستێتی خوای گه‌وره‌ت لای به‌قه‌د ده‌ریایه‌كان بێ، بزانه خۆشه‌ویستێتی خوای گه‌وره نابێ هیچ سنورێكی بۆ ببێ، چونكه نیعمه‌ته‌كانی زۆری خودا هیچ سنورێكیان بۆ نی یه‌، له‌به‌ر زۆری هه‌رناژمێردرێن ،خۆ باسی پاك و بێ گه‌ردێتی خوای گه‌وره هه‌ر ناكرێ، كه‌له‌هه‌موو سیفه‌ته جوان و به‌رزه‌كان بێ سنووره وبێ وێنه‌یه .

بزانه سه‌رچاوه‌ی هه‌موو خۆشه‌ویستیه‌كه‌مان هه‌ر خوایه و هه‌ر بۆ خوایه.

پێغه‌مبه‌ری خۆمان ﷺ بۆیێ خۆش ده‌وێ چونكه خوای گه‌وره خۆشی

دەوێ و هەلیبژاردووە بە پێغەمبەر ﷺ ، داوای ئەوەمان لێ دەکات کە ڕێبازی ئەو بگرین و خۆشمان بوێ، هەروەها ئیماندارانمان بۆیێ خۆش دەوێ، ئەویش هەر لەبەر خودا، چونکە خوداو پێغەمبەرەکەی داوامان لێ دەکەن کە ئیماندارانمان خۆش بووێ و بەبراو کەسانی خۆمان دایان بنێین، جا پرسیارکەرەکە وتی ماموٚستا گیان خودا پاداشتی خێرت بداتەوە لەسەر ڕاست کردنەوەی ئەو بۆچوونەم ...هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (خوای گەورە ئەگەر ئادەمیزادێکی خۆش بوێ بانگی حەزرەتی جوبرائیل دەکات و پێ ی دەلێ: من فلان کەسم خۆش دەوێ و تۆش خۆشت بوێ، پاشان حەزرەتی جوبرائیل بانگ دەکا لەئاسمان، دەلێ خوای گەورە فلانی خۆش دەوێ، خۆشتان بوێ، جا فریشتە و مەلائیکەتەکانی ئاسمانیش خۆشیان دەوێ پاشان خوای گەورە ئاسوودەیی، کامەرانی بەسەر گیانیدا دەبارێنێ، خۆشەویستانی تێکەلی سروشت و فیترەتی بەدیهێنراوەکان دەکات لەسەر زەویدا، هەروەها خوای گەروە ئەگەر رق و قینی لەیەکێ بێتەوە بانگی جوبرائیل دەکاو پێ ی دەلێ من رق و قینم لەفلان کەسە، تۆش رق و قینت لێ بێ، جا ئەویش رق و قینی لێ دەبێتەوە پاشان جوبرائیل بانگ دەکا لەناو ئەهلی ئاسمانا، دەلێ خوا رق و قینی لەفلان کەسە ئێوەش رق و قینتان لێ ی ببێتەوە، پاشان خوای گەورە ڕق و قین لەو کەسە، تێکەلی سروشت و فیترەتی بەدیهێنراوەکان دەکات لەسەر زەویدا) رواه مسلم .

جارێکیان پیاوێکی ئەعرابی هاتەلای پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ پێ ی وت: ئەی پێغەمبەری خوا، کەی ڕۆژی قیامەت دێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چیت ئامادە کردوە بۆ ڕۆژی قیامەت، پیاوە ئەعرابیەکە ووتی:

هیچم ئامادە نەكردووە لەنوێژو رۆژی زۆر تەنها ئەوەنـدە نـەبێ، كـەمن خـواو پێغەمبەری خوام زۆر خۆش دەوێ ،جا پێغەمبـەر ﷺ پـێ ی فـەرموو هـەر كەس لەرۆژی قیامەتا لەگەل ئەو كەسـە كۆدەبێتـەوە كەخۆشـی دەوێـت، جـا ئەنەس وتی نەمدیت موسلمانان بەهیچ شتێ پێ ی وە دلخـۆش وكامـەران بـبن لەپاش موسلمان بونیان، هەندێ بەو فەرموودەیـە دلخـۆش بووینـە كـە تێیـدا دەفەرمووێ: رەزای خوای لێ بێ تـۆش لەگـەل خۆشەویـستەكەتا كۆدەبیتـەوە لەقیامەت ومەحشەردا) متفق علیه.

دیارە خۆشەویستی خوای گەورەو پێغەمبەری خۆشەویـست، بـەرووبومی گرتنی رێی هەقو راستی یە، دەنا پۆشاكێ نی یە ئادەمیزاد بیكاتە بـەری یـا خواردەمەنێ نی یە بیخوات ،بەلكو دۆزینەوە و گەیشتنە بە چلە پۆپەی راستی و دروستی یەكان، رزگار بوونە لەوێلی و گومرایی یـەكان، لەراسـتیدا ئـەوەی هۆو هۆكارن بۆ خۆشەویستیی لەرووی عەقل و سروشـت و فیترەتـەوە لـەرووی ویژدان و ئینسافەوە و لـەرووی حـەق و راسـتی یـەوە، هـەر خـوای گەورەیـە كەسەرچاوەی هەموو خۆشەویستێ كە لەهـەموو روو و لایەنەكانـەوە، ئـەوەی خوای گەورە نەكات بەسەرچـاوەی خۆشەویـستی و مەحبەتـەوە، ئـەوە لەبـەر ئەوەیە چونكە خوای نەناسیوە وەكو پێویست لە گیـان و نەفـسی خۆشـی بـێ ئاگایە، وەك مامۆستا حەسەنی بەصری رەزای خوای لێ بێ دەفـەرمووێ: بـێ گومان ئەوەی خوای خۆی بناسێ خۆشی دەوێ، ئەوەی دونیـا بناسـێ زاهیـدو خواناس دەبێ لەژیانی دونیایدا.

گەورەو بەرزی پلەوپایەكانی عەبدو بەندە، لەخۆشەویستی خـوای گـەورە چەنگ دەكەوێ، دیارە خۆشەویـستێتی خـوای گـەورەش سـەرەتاییەكی هەیـە

لەبەندایەتی و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی.

عن ابي هريرة ( قال رسول الله ﷺ ان الله تعالى قال من عادى لي وليا اذنته بالحرب، وما تقرب إلي عبدي بشيء احب الي مما افترضته عليه ومايزال عبدي يتقرب الي بالنوافل حتى احبه فاذا احببته كنت سمعه الذي يسمع به وبصره الذي يبصربه ويده التي يبطش بها ورجله التي يمشي بها وان سألني اعطيته ولئن استعاذني لاعيذنه)رواه البخاري، لەئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (خوای گەورە جل جلالە، فەرموویەتی ئەوەی دژایەتی دۆست و خۆشەویستی من بکات بانگی دەکەم بێتە مەیدانی شەڕی من، بەندەو عەبدی من بەهیچ شتێ زیاترو باشتر و خۆشەویستر لێم نزیك نابێتەوە، هەندێ بەوەی کەلەسەرم واجب و فەرز کردووە، بەردەوام عەبدو بەندەکانم لێم نزیك دەبێتەوە بەهۆی سوونەتە زیادە خێرو حەسەناتەکانیانەوە، تادەگاتە ئاستی ئەوەی خۆشم بوێ، جاکە خۆشم وویست دەبمە ئەو گوێچکەیەی کەپێی دەبیستێ واتە هەرچی مایەی خێرو نوری هیدایەتە لەڕێگای گوێچکەوە بەهرەمەندی دەکەم کەببێ بەمایەی خۆشی و هەست کردنی بەهیدایەت و ڕێنومایی خواییەوە دەبم بەوچاوەی کەپێی دەبینێ (ئەوەش بەمانای بەهرەمەندی دەکەم لەڕێگەی چاویەوە، چاوی لەدونیای خواناسین و خواپەرستیدا لەگەڕدا دەبێ) هەروەها ئابەم شێوەیە دەست و قاچەکانی لەمەیدانی خواناسیدا دەکەونە کارو دەبنە هۆو هۆکارێ بۆ بەخش کردنی نورو هیدایەتی خودایی جا ئەگەر ئەو بەندەو عەبدەی من لەبەرم پاڕایەوە داوای شتێکی لێ کردم ئەوە پێی دەبەخشم، وەئەگەر پەنای بۆ هێنام پەنای دەدەم .

دونیای خۆشەویستی خودایی پڕ بەهرەو نیعمەت و بەختەوەرییە شیفاو

چاره‌سه‌ره بۆ نه‌خۆشیانی ده‌روون و ده‌ردانـی نـه‌زانین ،مایـه‌ی دوارۆژێكـی پـڕ شادومانی و شانازییه، دیاره ئه‌وه‌ی خواشی خۆش بوێ، یه‌ك پارچـه ڕه‌حمه‌تـه بۆ باقی ئاده‌میزاده‌كـانی تـر، كـاروكرده‌وه‌ی ئـاوا ده‌كـات كه‌جێگـه‌ی خـۆش ویستنی خوداییه و مایه‌ی ڕازی بوونیه‌تی تاكو زیـاترو باشـتر خـۆی ئاسـووده بكات له‌دونیای خۆشه‌ویستی خوداییدا.

وه پێغه‌مبـــه‌ری خۆشه‌ویـــست ﷺ بۆمـــانی ڕوون كردۆتـــه‌وه كـــه‌چ كاروكرده‌وه‌یێ مایه‌ی خۆش وویتنی خودایـه وه‌ك كه‌ده‌فـه‌رمووێ (ان الله يحب اذا عمل احدكم عملا ان يتقنه) واته: خـوای گـه‌وره كـاروكرده‌وه‌یێكی خـۆش ده‌وێ، كاتێ ئه‌و كه‌سه‌ی كارێك ئه‌نجام ده‌دا به‌وپه‌ڕی ڕێك و پێكـی ئیتقانـه‌وه ئه‌نجامی بدات ،هه‌روه‌ها ده‌فه‌رمووێ (ان الله يحب اغاثة اللهفان) واته : خـوای گه‌وره كه‌سانی وای خۆش ده‌وێ، كه به‌كارانی كارگوزاری هه‌ڵده‌ستن وه‌بـه‌هانای داماوو لێ قه‌وماوو سته‌م لێكراوان ده‌چن، هه‌روه‌ها ده‌فـه‌رمووێ (ان الله يحب الرفق في الامركله) واته:خوای گه‌وره نه‌رم و نیانی خۆش ده‌وێ، له‌هه‌موو كـارو ئه‌مرو فه‌رمانه‌كاندا.

پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رمووێ (ان الله يحب ان يحمد) واته: خوای گه‌وره ئه‌و كه‌سانه‌ی خۆش ده‌وێ كه‌حه‌مدو ستایشی ده‌كه‌ن و سفڵه‌و به‌دنمه‌ك نین .

پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رمووێ (ان الله يحب ان تعدلوا بين اولادوكم حتى في القبل) واته: خوای گه‌وره دادپه‌روه‌ری و عه‌داله‌تی خۆش ده‌وێ له‌به‌ینی منـداڵ و ئه‌ولاده‌كانتان، هه‌تا ئه‌گه‌ر لـه‌ماچ كردنیـشیاندا بێـت، هـه‌روه‌ها لـه‌مانای هه‌ندێ فه‌رمووده‌ی تری پێغه‌مبه‌ر ﷺ كه‌خوای گه‌وره جوانه‌و جـوانی خـۆش ده‌وێ، ئازاو به‌غیره‌ته ئازایی و بـه‌غیره‌تی خـۆش ده‌وێ وه‌خوڕه‌وشـتی پـاك و

بەرزی خۆش دەویٚ و قین و ڕقی لەخوڕەوشتی ناشیرینە وەك دەفەرمووێ (ان الله جميل يحب جمال، جواد يحب الجود،يحب معالي الاخلاق ويكره سفسافها).

هەروەها پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرمووێ (المؤمن القوى خير واحب الى الله من المؤمن الضعيف وفي كل خير ) واتە: ئیمانداری بەهێزو بەقووەت باشترەو خۆشەویسترە، لەلای خوا لەئیماندرای بێ هێز، و لەهەموو کارو خێرێکا ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ (إنَّ الله عفو يحب العفو) واتە: خوای گەورە لێ بوردەیەو لێبوردنیشی خۆش دەوێ، هەروەها پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرمووێ (احب الاعمال الى الله ادومها وان قل) واتە: خۆشەوویسترین کاروکردەوە لەلای خوای گەورە ئەوەیە، کەبەردەوام بێ ئەگەر کەم کەمیش بێ، جائادەمیزادی خواناس و خواپەرست لەم کارانە دەکۆڵێتەوە تاکو ئەنجامیان بدات و بگات بەو پلەیە کە پێغەمبەر ﷺ لەئاستیا دەفەرمووێ جارێکیان ئافرەتێ منداڵەکەی خۆی بزر کردبوو و لەدوای دەگەڕا زۆر بەپەرۆشەوە لەهەنگاوێکدا دۆزیەوە توند بەباوەشی خۆی گرت و ماچی دەکرد، ئالەوکاتە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ یارەکانی لەوێ وەستا بوون، فەرمووی قەسەم بەخوا خوای گەورە، بەندو عەبدەی خۆی خۆشتر دەوێ لەخۆشەوویستنی ئەودایکەی بۆ ئەو منداڵەی، موسلیم و بوخاری ریوایەتیان کردووە.

جابا ببینە عەبدو بەندەی خوا، تاکو خۆشمانی بوێ دیارە ئەوەی نێتە دونیای خۆشەوویستی خودایی پشت لەڕێگەو بەرنامەکەی بکات، خوای گەورە خۆشی ناوێت و پشتیوانی لێ ناکات وەك خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَأَنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ لَا مَوۡلَىٰ لَهُمۡ ۝١١﴾ (محمد ١١)

پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویستمان ﷺ ده‌فه‌رمووێ : (اللهم ارزقنی حبك وحب من احبك وحب ما یقربنی الی حبك واجعل حبك احب الي من الماء البارد) احیاء علوم الدین ج٤ ص ٢٧٢ واته: (خوایه گیان خۆشه‌ویستاتی خۆتم پێ ببه‌خشی و خۆشه‌ویستاتی ئه‌و كه‌سه‌ش كه‌تۆی خۆش ده‌وێ و خۆشه‌ویستاتی ئه‌و كارو كرده‌وه‌ش كه‌پێی نزیك ده‌بمه‌وه له‌خۆشه‌ویستاتیت، خۆشه‌ویستاتیت بگێڕه له‌لام خۆشه‌ویستر له‌ئاوی سارد بۆ ئاده‌میزادی تینوو)جا ئه‌وه‌ی ده‌یه‌وێ باشترو زیاتر بۆ ئه‌م باسه بكۆڵێته‌وه‌و لێی باشتر حالی ببێ، باسه‌یری كتێبی(احیاء العلوم الدین) بكات جزئی چواره‌م لاپه‌ڕه ٢٧٠-٢٨٠.

له‌ئه‌نجامی ئایه‌ت و فه‌رمووده‌كانی پێغه‌مبه‌ردا ﷺ واده‌رده‌كه‌وێ، كه‌حه‌قیقه‌تی ئیمان وا له‌ئاده‌میزاد ده‌كات هه‌موو خۆشه‌ویستی و مه‌یل و سۆزو عاتیفه‌و هه‌موو دڵ و بیرو هۆش هه‌ر بۆ خوای گه‌وره‌بێ هه‌ر بۆ پێغه‌مبه‌ری خود اﷺ بێ، هه‌ر بۆ ئیماندارانی خواپه‌رست و ڕاست و دروست بێ، دیاره مێژووی سه‌حابه‌كان و تابعینه‌كان ئه‌م ڕاستیه ڕه‌وشه‌نترو ئاشكراتر كه‌ن.

# دۆستایه‌تی و براده‌رایه‌تی :

هــه‌موو ئـاده‌میزادێ چـه‌ندین بـراده‌ری هه‌یـه‌، چـه‌ند كـات و سـاتێ له‌ژیانیاندا له‌هاورێ یاتیاندا به‌سه‌ر ده‌بارێ ئه‌و هاورێیانه‌ یا هـاورێی ئـیش و كارو كه‌سابه‌تن، یا هاورێی بیرو باوه‌رو مه‌بده‌ئن یا هاورێی جـیران و هاوسـێی گه‌ره‌كن، یا به‌هۆی خزمایه‌تی و كه‌سایه‌تیه‌وه‌ هاورێیه‌تیان بۆ دروسـت بـووه‌ و گه‌لێ هۆو ئه‌سبابی تـر هـه‌ن بـۆ دۆسـتایه‌تی، كـه‌وه‌ك لای هـه‌مووان ڕوون و ئاشـكرایه‌ ،لێـره‌دا سـه‌یرو مـوعجزه‌ ئه‌وه‌یـه‌ هـه‌رئاده‌میزادێ جـۆره‌ تـه‌بع و خوره‌ووشت و نه‌فسیاتی تایبه‌تی خۆی هه‌یه‌، ئه‌مه‌ش واڕاده‌گه‌یـه‌نێ هه‌نـدێك لێك نزیك بن له‌ته‌بع و نه‌فسیاتیانا و هه‌ندێكی تر لێك دوور بن.

هه‌رچۆنی بێ مرۆڤ له‌ژیانیدا بێ دۆست و براده‌ر نیه‌، هه‌ر نـاتوانێ بـه‌بێ دۆست و براده‌ر ژیانێكی چاك و له‌بار به‌جێ بگه‌یه‌نێ، ژیانه‌ كۆمه‌لآیه‌تیه‌كـه‌ی كـورده‌واری خۆشـان لـه‌دێرین زه‌مانــه‌وه‌، هـاوه‌ڵێتی و دۆسـتایه‌تیه‌كتریان كردووه‌، له‌و ڕووه‌وه‌ كۆمه‌ڵگاكه‌مان پێـشكه‌وتووه‌ هه‌رتاكـه‌ی هـه‌رگیز حـه‌زی به‌دووره‌ په‌رێزی نه‌بووه‌، به‌ڵكو هه‌رده‌م ئاره‌زوو خواستی ئـه‌وه‌بووه‌، تێكـه‌ڵی و هاوده‌می كه‌سانی تـر بكـات، تـاكو سـوودیان پـێ بگه‌یـه‌نێ و سـوودیان لێ وه‌ربگرێ، وه‌له‌ئاست یه‌كا حه‌زیان لـه‌پیاوه‌تی و چـاكه‌خوازی بـووه‌، هـه‌روه‌ها شانازییان به‌ به‌وه‌فایی و ڕاست گۆیی و ده‌ست پاكی گیانی كۆمـه‌كی و خێـرو حه‌سه‌نات كردووه‌ ئه‌وه‌ی شایانی باس بێ ئایین و به‌رنامه‌كـه‌یان له‌وخوره‌وشـته‌ جوانانه‌ی ناو كۆمه‌ڵ ده‌ورێكی سـه‌ره‌كی بـووه‌، بۆیـه‌ ده‌بیـنین خوره‌وشـتێكی خواناسـانه‌و زانایانه‌ داب و نه‌ریت و عاده‌تیان بووه‌، هه‌رده‌م نه‌فره‌تیان لـه‌درۆو

ناپاكی و خیانه‌ت و جاسوسی و غه‌یبه‌ت و داوێن پیسی كردووه‌، وه‌هه‌رده‌م سفڵه‌یی و بێ وه‌فایی و ڕه‌زیلی و ده‌ست پیسی و داوێن پیسی به‌رنه‌فره‌ت و نه‌عله‌ت بووه‌.

جا له‌كاتێ كه‌ئایین ده‌سه‌لاتی به‌ره‌و كزی و نه‌مان هات، له‌پاش سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی بیسته‌مدا، ئه‌وكاته‌ شه‌یتان و شه‌یتانیه‌كان و هاوه‌ڵه‌كانیان هاتنه‌وه‌ ناو كۆمه‌ڵ و به‌بارێ جه‌هل و نه‌فامیه‌وه‌، دایان كوتا له‌سه‌رو گێلاكی گه‌لانی هه‌ژارانی ڕۆژهه‌لات، له‌مانه‌ش گه‌لی چه‌وساوه‌و داماوی هه‌ژاری ئێمه‌ش تیاكه‌وت، له‌ئه‌نجامی هه‌زاره‌ها پیلان و كاری گلاودا، توانیان هه‌ندێ له‌ پێوه‌ره‌كان له‌كۆمه‌لان لێل بكه‌ن و شیرازه‌ی ژیانی به‌خته‌وه‌ریان ئالۆز بكه‌ن، به‌لێ یه‌كێ له‌ومیزان و پێوه‌رانه‌ی لێل وئالۆزیان كردووه‌ براده‌رایه‌تیه‌ یا هاوڕێیه‌تیه‌، تام و چێژی كه‌م ماوه‌ متمانه‌و پیمان و خۆشه‌ویستی كه‌م بووه‌، به‌لكو براده‌ر، یا هاوڕێ تابلێی نا مه‌حبویه‌ له‌دلی دایكان و باوكان بۆڕۆله‌و كوڕه‌كانیان ڕاسته‌وخۆ ده‌لێن براده‌رد یا ئه‌وه‌ی براده‌ری نه‌بێ تووشی هیچ به‌لایێ نایێ، وه‌حه‌زو ئاره‌زوویان له‌وه‌یه‌ كه‌ڕۆله‌كانیان به‌دووره‌ په‌رێزیه‌وه‌ ژیان به‌رنه‌ سه‌ر، هاوده‌می و هاوه‌لێتی كه‌س نه‌كه‌ن، دیاره‌ بێ گومان ئه‌وه‌ش هه‌مووی له‌به‌ر نه‌بوونی متمانه‌یه‌ له‌به‌ر خراپی و به‌دخویی زۆر له‌براده‌ره‌ ناله‌جێیه‌كانه‌ هه‌رچۆنی بێ لای ئه‌وان باش و خراپ. چۆته‌ یه‌ك لای تا ته‌رازووه‌وه‌، جابۆ پێشه‌وه‌ بردنی باری كۆمه‌لایه‌تی و ڕاستكردنه‌وه‌ی میزانه‌كان و ڕێكخستنی باری ده‌روون، پته‌و كردنی یه‌كێتی كۆمه‌ڵ و ڕوه‌و پێشكه‌وتنێكی پڕ له‌شارستانی و چاندنی گیانی برایه‌تی و كۆمه‌كی پێویسته‌، بزانین براده‌ر گشتیان وه‌ك یه‌ك نین به‌لكو باش و خراپیان هه‌یه‌، دیاره‌ باش و

خراپیش هەرگیز وەك یەك نین، ئیدی هەڵوێستێکی نالەجێیە گەر بخرێتە یەك لای تەرازووەوە دیارە ڕاستی و ناڕاستی چاك و خراپی و ڕەش و سپی و ڕووناکی و تاریکی زاناو نەزان ئیمان و کوفر پاکی و خاوێنی ئاشتی و شەڕ هیچ کامیان لەم جووتانە وەك یەك نین و وەك یەکیش نابن، دەی کەواتە یەکێ زانا بێ ڕاست گۆو چاك بێ خاوەن ئیمان و ڕووسپی و پاك بێ وەئاشتی خوازو بەوەفابێ، لەسەر ڕێچکەو ڕێبازی یەزدان بێ، دواڕۆژو مەئوای جەنەت بێ، هەرگیز وەکو ئەو کەسە نیە کەنەزان و درۆزن و خراپ کرداربێ، دوورە باوەڕو ڕووڕەش و پیس بێ لەسەر ڕێچکەو ڕێبازی شەیتان بێ دواڕۆژو مەئوای دۆزەخ بێ .

با بگەڕێینەوە سەربیروهۆشی خۆمان و لەزانای بێ وێنەمان بپرسین کەباری تعالایە بلێین ئەی خوایە گیان، بەڕای تۆ کێ بکەین بەخۆشەویست و دۆست و هاوەڵمان؟

لەوکاتەی (عبداللە ی کوڕی سەلام)موسڵمان بوو، لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵەکانی جوولەکە، وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی گەلەکەمان لەبەنی قوڕەیزە و بەنی نەزیر پشتیان تێ کردووین، وەسوێندیان خواردووە لەگەڵماندا دانەنیشن و هاوەلایەتیمان نەکەن، ئێمەش ناتوانین هاودەمێتی و هاوڕێیەتی یارو ئەصحابەکانی تۆ بکەین، لەبەر ماڵ دووریمان ئالەپاش ئەم قسانە ئەم ئایەتانە دابەزین لەلای خودای گەورەوە بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ کەتیایاندا دەفەرمووێ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمۡ هُزُوٗا وَلَعِبٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَٱلۡكُفَّارَ أَوۡلِيَآءَۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن

كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ المائده/ ٥٧، واتە: ئەی ئەوکەسانەی خۆتان بەئیمانداردەزانن و ئیمانتان هێناوە، ئەوکەسانە مەگرن و مەیانکەن بە دۆست و خۆشەویست و کەسانی خۆتان، لەوانەی ئایین و بەرنامەکەتان دەکەنە جێگەی فشقیات و گاڵتەو گەپ و یاری لە کەسانەی کەلەپێش ئێوە کتێبیان پێدراوە، جا هەڵساون بەگۆڕینی و دەست تێ وەردانی تاوایان لە هاتووە هەموو ڕاستی و هەقە کانیان لێ چەواشە بووەو بەسەر بێ باوەڕی هەڵگەڕاون، بێ باوەڕانی تریش مەکەن بەدۆست و ئەولیای خۆتان و تەقوای خوا بکەن لەخوا بترسێن و بەپێی فەرمانەکانی خوا ڕەفتار بکەن، ئەگەر ئێوە ئیماندارن و خۆتان بەئیماندار دەزانن ،هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُوا۟ مِنْهُمْ تُقَىٰةً ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾ سورەتی ال عمران ٢٨، واتە: بۆ خاوەن باوەڕان نیە، کافرو بێ باوەڕەکان بکەنە دۆست و برا گەورەی خۆیان زیادە ڕێزو فەزڵێکیان پێ بدەن بەسەر برایانی تری ئیماندار، دۆستایەتیەکەیان سەربکێشێ بۆ دابەزینتان لەڕووی بیرو باوەڕو بەرنامەکەتانەوە، ئەوەی کاری وابکات بەش و باری لای خوای گەورە لەڕووی ماددی و مەعنەویەوە نامینێ، مەگەر دۆستایەتی و برادەرایەتیەکەیان بۆ پاراستنی ماڵ و گیان و بیروباوەڕەکەتان بێ، وەخوای گەورە دەتان ترسێنێ بەتووڕەیی و قاڕو غەزەبی خۆی بزانن گەڕانەوەو چارەنووس هەربۆلای خوای گەورەیە.

بەڵێ دۆستایەتی بێ باوەڕو کافران دروست نیە، ئەگەر بەزەرەرو زیانی موسڵمانان تەواوبێ، بەڵام ئەگەر بەسوودو قازانجی موسڵمانان تەواوبێ وبەو مەرجەی لەڕووی ئایین و بەرنامە تەنازوولی تیانەبێ، وەك لەم ئایەتانەدا ئەم مەسەلە باشتر ڕوون دەبێتەوە، خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَجۡعَلَ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَ ٱلَّذِينَ عَادَيۡتُم مِّنۡهُم مَّوَدَّةٗۚ وَٱللَّهُ قَدِيرٞۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٧ لَّا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَلَمۡ يُخۡرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ أَن تَبَرُّوهُمۡ وَتُقۡسِطُوٓاْ إِلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ٨﴾ المتحنه/٨ ، واتە: خوای گەورە مەنعتان ناکات، لەگەڵ ئەو کەسانەی شەڕتان لەگەڵا ناکەن لەسەر بیروباوەڕەکەتان و دەرتان ناکەن لەسەر جێ و ڕێ و شوێنتان، بەوەی کەلەگەڵیاندا چاك بن و چاکە بکەن و دادپەروەرو عەدالەت بن لەگەڵیاندا، بێ گومان خودای گەورە ئادەمیزادی دادپەروەرو عادلی خۆش دەوێ، ئەو ئایەتانەش ئەوکاتە دابەزین کاتێ دایکی ئەسمای کچی ئەبوبەکر ئیمانی نەهێنابوو هاتبووە سەردانی و هەندێ دیاری و هەدیەی لەگەڵ خۆیا هێنا بوو، بەڵام ئەسماء ڕازی نەبوو دایکی بچێتە لای و هەدیەو دیاریەکانی لێ وەرنەگرت، تاکو خوشکی حەزرەتی عائشە (کەئەوکاتە خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو) ناردیە لای پێغەمبەر ﷺ و پرسیاری لێ کرد ئایا پێشوازی لەدایکی بکات، کەئەوکاتە ئەبووبەکر طلاقی دابوو، یائاخۆ چۆن ڕەفتاری لەگەڵدا بکات، تا ئەوکاتە ئەوئایەتانە هاتنە خوارەوە .

وەخوای گەورە بۆمانی ڕوون کردەوە، کەکێیە هاوەڵێتی نەکەین و لەگەڵیاندا دۆست و برادەر نەبین، وەك دەفەرمووێ ﴿إِنَّمَا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ

قَـٰتَلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ وَظَـٰهَرُوا۟ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٩﴾ (الممتحنه ٩٠) واته: بەڕاستی خوای گەورە قەدەغەو مەنعی كردووە كەدۆستایەتی و هاوەڵێتی و هاوكاری ئەو كەسانە بكەن كەشەڕیان پێ فرۆشتون لەسەر بیروباوەڕ، دەریان كردوون لەسەر جێگەو ڕێگەی خۆتان، هەروەها ئەو كەسانەی كەهاوكاری و كۆمەكی ئەوانیان كردووە جابەڕاستی ئەوەی هەرەوەزی و كۆمەكی و دۆستایەتی ئەوكەسانە بكات ئەوانە خۆیان زاڵم و ستەم كارن.

هەروەها خوای گەورە لەئاخیر ئایەتی سوڕەتی (المجادلة)دا دەفەرمووێ لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَـٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ حِزْبُ ٱللَّهِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٢٢﴾ (سورەتی المجادلة ٢٢) واتە: گەل و قەومێكت بەرچاو نەكەوێ و نابینیەوەو نیە كەئیمانیان بەخوداو ڕۆژی دوایی هەبێ و لەهەمان كاتیشدا سۆزو مەحەببەت و خۆشەویستی و هاودەمیتی ئەوكەسانە بكەن كەدوژمنی خودا و بەرنامەكەینە، دوژمنی پێغەمبەر ﷺ و فەرموودەكانی نە ،جابا ئەوكەسانەش باب و باپیرانیان بێ وەیا ڕۆڵەو نەوەكانیان بێ وەیا براو خێرو عەشیرەتیان بێ .

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟

ءَابَآءَكُمْ وَإِخْوَٰنَكُمْ أَوْلِيَآءَ إِنِ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْكُفْرَ عَلَى ٱلْإِيمَٰنِ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ (سورەتی التوبه ٢٣) خوای گەورە بانگەواز دەکاو دەفەرمووێ ئەی ئەوکەسانەی ئیمانتان هێناوە، باوان و برایانی خۆتان مەگرن بەدۆست و خۆشەویست، ئەگەر ئەوان بێ باوەڕی کوفریان خۆشتر بوێ لەئیمان و باوەڕ، جائەوەی دۆستایەتی ئەو جۆرە باوو برایانە بکا کەدوژمنی دینی خودان ئەوانە بەسەر ستەم کاری و زوڵمدا دەکەون و بەزاڵم دادەنرێن .

مامۆستایێ لەناو کۆڕو کۆمەڵێکدا خەریکی ئەم باسانە بوو لەپڕێکا یەکێ لەبیسەران ووتی وە الله ی دەنا مامۆستا گیان من وام پێ باش بوو کەدۆستایەتی کەس نەکەم، تێکەڵی کەس نەبم تۆ چی دەفەرمووی لەم بارەیەوە.جا مامۆستا هاتە وەلاّم و پێی ووت :باشە تۆ ئیسلام نیت و نوێژ ناکەیت و بەرۆژو نیت و بەهیواو ئومێدی بەهەشت نیت؟ پرسیارکارەکە ووتی بەڵێ وەالله مامۆستا گیان موسڵمانیشم نوێژیش دەکەم بەرۆژووشم بەهیواو ئومێدی ناوەندی بەهەشتیشم!! مامۆستا ووتی: هەی رەحمەت لەدایك و باوکت :هەر ئەو خودایەی کەدەفەرمووێ تۆ موسلمان بە بە ئایەتی (یا ایها الذین امنوا اتقوا الله) وەبە ئایەتی (یا ایها الناس اتقوا ربکم ) وە لەگەل ئایەتی تر هەر ئەو زاتیشە دەفەرمووێ (یا ایها الذین امنوا کتب علیکم الصیام) واتە: ڕۆژومان لەسەر واجب کروون، هەرئەو زاتەش دەفەرمووێ (یا ایهالذین امنوا کونوا انصار الله) واتە: ئەی ئەوکەسانەی کەئیمانتان هێناوە ببنە سەربازی خوداو سەرهێخەری دینی خوا هەر ئەو زاتیشە دەفەرمووێ (یا ایها الذین امنوا اتقوا الله وکونوا مع الصادقین) واتە: ئەی ئەوکەسانەی کەئیمانتان

هێناوه ته‌قوای خوا بكه‌ن و له‌گه‌ڵ ڕاستگۆیاندا بن، به‌ڵێ ئه‌م بانه‌گه‌وازانه‌و گه‌لێكی تر له‌ئه‌مرو نه‌هی گشتیان له‌قورئاندا فه‌رمووده‌و كه‌لامی خودان، پێویسته له‌فه‌رمووده‌ی ئه‌م خودایه وه هه‌ڵوێست وه‌ربگرین و به‌بێ زانیاری به‌دوای هه‌واو ئاره‌زوو یا بۆچوون و ره‌ئی خۆمان نه‌كه‌وین به‌ڵێ خوای گه‌وره نه‌ی فه‌رموو ئێوه بێ لایه‌ن بن، خوای گه‌وره بۆیه تۆی خه‌ڵق كردووه تاكو ببی به‌به‌نده‌و سه‌ربازی خوداو پیاوی به‌رنامه‌ی و په‌یامه‌كه‌ی، هه‌رچی ووزه‌و تاقه‌تت تیایه بخه‌یته مه‌یدانی خزمه‌ت، بۆ خۆش به‌ختی خۆت و كۆمه‌ڵه‌كه‌ت و ئایا تۆ خۆت به‌دواكه‌وتوی ئه‌و زاته نازانی كه (رحمة للعالمين)ه ئه‌ی چۆن ده‌بێ تۆش ڕه‌حمه‌ت نه‌بی ئه‌ی چۆن ده‌بێ هه‌ڵوێستێك به‌بێ زانیاری وه‌ربگریت وزه‌و تواناو تاقه‌تت بمرێنی و بێ خێری بكه‌یت و ئه‌ی چۆن ده‌بێ هه‌ندێ فه‌رمانی خودا گوێڕایه‌ڵی بكه‌یت و هه‌ندێكی تر گوێ پێ نه‌ده‌یت ، ئایا نازانی خودای گه‌وره هه‌ڕه‌شه له‌و جۆره كه‌سانه ده‌كات كه‌ئیمان به‌هه‌ندێ ئایه‌ت دێنن و هه‌ندێكی تر پشت گوێ ده‌خه‌ن وه‌ك ده‌فه‌رمووێ ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَـٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْىٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٨٥﴾﴾ (البقره ٨٥) واته: ئایا ئێوه ئیمان به‌هه‌ندێ ئایه‌ته‌كانی كتابی خوای گه‌وره دێنن و بێ باوه‌ڕی به‌هه‌ندێكی تر ده‌رده‌بڕن به‌ڕاستی ئه‌وه‌ی وابێ له‌ئێوه ئه‌وه پاداشته‌كه‌ی سوكی و ڕیسوایی یه له‌ژیانی دونیایی و له‌ڕۆژی قیامه‌تیشدا ده‌بردرێنه ناو توندترین ئه‌شكه‌نجه‌و عه‌زاب واته جێگه‌یان له‌كافرو بێ باوه‌ڕانی تر گه‌لێ خراپترو ناخۆشتر ده‌بێ، بزانن خوای گه‌وره بێ ئاگاو غافل نیه‌و نه‌بووه، له‌كاروكرده‌وه‌ی كه‌ئێوه ده‌ی كه‌ن، جاكابرای خوان پرسیار وتی به‌ڵێ

مامۆستا تێ گەیشتم، خودا جەزای خێرت بداتەوە بەراستی وەك پێویست ئێمەی لێ حالی نەبوو نەبووین، هەر لەئیستاکەوە بریار دەدەم کەیەکەم سەربازی دینی خودا بم، لەهەموو لایەنەکی ژیانەوە، مامۆستاکە ووتی :خوا جەزای خێری ئێوەش بداتەوە کەگوێ لەراستی و دروستی دەگرن، مزگێنی و موژدەتان بدەمێ، کەخوای گەورە خێروسوودی ئیوەی دەوێ، وەك لەم فەرموودەدا دەردەکەوێ کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : (من یرد الله به خیرا یفقهه فی الدین ) رواه البخاری .

واتە: ئەگەر خوای گەورە خێرو سوودێکی یەکێکی بوێ ئەوە شارەزای دەکا لەئایین و بەرنامەکەی .

با لەڕابەرو پێشەوایی مرۆڤایەتی کە پێغەمبەری خۆشەویستمانە بپریسن و بزانین ئەو لەئاست دۆستایەتی و برادەرایەتی چی دەفەرمووێ ..

یەکێ لەفەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ لەبارەی دۆستایەتی و خۆشەویستایەتی یەوە دەفەرمووێ لە ئەبی هورەیرە رەزای خوای لێ بێ عن النبی ﷺ قال احبب حبیبك هونامـا عسی ان یکون بغیضك یوما ما، وابغض بغیضك هونا ما عسی ان یکون حبیبك یوما ما .. رواه الترمذی .

لەئەبوو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ئەگەر دۆست و خۆشەویستێکت بوو، ئاگاداری خۆشەویستەکەت بە، هەموو هەست و نەستت و نهێنیت لای هەل مەرێژە ، چونکە احتمال هەلدەگرێ رۆژێ ئەو خۆشەویست و دۆستەت ببێتەوە دوژمن، هەروەها ئەگەر دوژمن و ناحەزێکت بوو لەدوژمنایەتی و ناحەزێیتیدا حیسابی ئەوە بکە ئیحتمال هەلدەگرێ ڕۆژێ بێ ئەو ناحەزو دوژمنەت ببێتە دۆست و

خۆشه‌ویستیت، كارێكی وامه‌كه كه‌ببێ به‌مایه‌ی ناره‌حه‌تیت و په‌شیمانی و شه‌رمه‌زاریت.

له‌م فه‌رمووده‌دا پێغه‌مبه‌ر ﷺ وا له‌ئاده‌میزاد ده‌كات له‌گشت لایه‌نێكه‌وه زیاده‌ره‌وی نه‌كات له‌هیچ روو لایه‌نه‌وه، وای لێ ده‌كات،ووردو دوور بروانێ و دوا رۆژ به‌رچاو بگرێ .

وعن معاذ( رضی الله عنه ) قال : سمعت رسول الله يقول : قال الله عز وجل المتحابون في جلالي لهم منابر من نور يغبطهم النبيون والشهداء. رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح.

له‌مه‌عازه‌وه ره‌زای خوای لێ بێ ووتی گوێم لێ بوو پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌یفه‌رموو: خوای گه‌وره (جل جلاله) فه‌رموویه‌تی ئه‌وانه‌ی یه‌كتریان خۆش ویستوه له‌پێناو شكۆمه‌ندی و جه‌لاله‌تی منه‌وه مینبه‌رێكی نورینی له‌بۆوانه به‌شێوه‌یه‌كی وا به‌هره‌داره ،پێغه‌مبه‌ران و شه‌هیدان ته‌مه‌ننا ده‌خوازن بۆ شوێن و مینبه‌ره‌كه‌یان ..

عن بردة بن ابی موسا عن ابية رضی الله عنهم قال: قال رسول الله (مثل الجليس الصالح و الجليس السوء كمثل صاحب المسك وكير الحداد لايعدمك من صاحب المسك اما ان تشتريه اوتجد ريحه وكير الحداد يحرق بدنك او تجد منه ريحا خبيثة ) رواه البخاري .

له‌بوورده‌ی كوری باكی مووسا له‌باوكی یه‌وه ره‌زای خوای لێ بێ ووتی پێغه‌مبه‌ر فه‌رموویه‌تی نوێنه‌ی دانیشتن له‌لای پیاوی چاك وه‌له‌لای پیاوی خراپ وه‌ك وێنه‌ی خاوه‌نی گولاو خاوه‌نی كووره‌ی ئاسنی یه، جاله‌لای گولاو و بۆن فرۆشه‌كه‌یا گولاوی بۆن خۆشی لێ ده‌كری یانیش بۆنی خۆشت به‌هۆی

دانيشتن له‌گه‌ليه‌وه بۆ دێ ،وه‌لەلای خاوه‌نی كووره‌ی ئاسنه‌كه‌وه، تووشی سوتانی لاشه دێیت یاتووشی جل و به‌رگ سوتان دێیت، یا هه‌ر چ نه‌بێ بۆن دوو كه‌لی پیس و ناخۆشت بۆ دێت .

بێ گومان دۆستایه‌تی و هاوده‌مێتی به‌رهه‌می خۆره‌وشتی جوان و به‌رزه، هه‌روه‌ها جیاوازی و ته‌فره‌قه به‌رهه‌م و ثه مه‌ره‌ی خوره‌وشتی ناشیرین و به‌رزو په‌سه‌ند مایه‌ی خۆشه‌ویستی و هۆگری و ته‌بایی یه، له‌هه‌مان كاتدا مایه‌ی ئاسوده‌یی، ده‌روون و رووخۆشی و جوانییه، هه‌روه‌ها مایه‌ی لێك حالی بوون و لێ بووردەیی یه‌و، به‌پیچه‌وانه‌شه‌وه خۆره‌وشتی نارێك و ناشیرین مایه‌ی پشت تێك كردنه مایه‌ی بێ رێزی و لێك تووره‌یی و حه‌سوودی و ناته‌بایی و لێك حالی نه‌بوون و لێ نه‌بوورده‌ی یه هه‌روه‌ها مایه‌ی رووگرژی و ناشیرینه مایه‌ی نه‌خۆشیه‌كانی ده‌روونی‌یه‌و حالی نه‌بوونه له‌كرۆكه‌ی حه‌ق و بێ وه‌فاییه له‌ئاستی یه‌وه ..

جێگه‌ی وه‌بیر هێنانه‌وه‌یه كه‌ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئه‌و په‌ری گرینگی داوه به خۆره‌وشتی جوان و په‌سه‌ند ،وه‌خوای گه‌وره مه‌دحی پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی كردووه به‌به‌رزی خووره‌وشتی جوانی وه‌ك ده‌فه‌رمووێ (وإنك لعلى خلق عظيم)

هه‌روه‌ها پێویسته بزانین كه ئه‌و پێغه‌مبه‌ره خۆشه‌ویسته له‌هه‌موو روو لایه‌نێكه‌وه پێشه‌وایه وه‌چاو لێكردنی پێویستیه‌كی ئیمانی یه ،وه‌ك خوای گه‌وره ده‌فه‌رمووێ ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾ (٢١ الاحزاب ) هه‌روه‌ها پێغه‌مبه‌ری ئازیز ﷺ ده‌فه‌رمووێ (اكثر ما يدخل الناس الجنة تقوى الله وحسن الخلق) اخرجه الترمذي من حديث ابي هريرة واته: ئه‌وه‌ی زۆرینه‌ی خه‌ڵك ده‌باته به‌هه‌شت

ته‌قوای خواكردن و خوره‌وشتی جوانه، هه‌روه‌ها ئوسامه‌ی كوڕی شه‌ریك ده‌ڵێ: گوتمان ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ چ شتێ باشترین خێرێكه و به‌هره‌یه‌كه درابێ به‌ئاده‌میزاد، فه‌رمووی خوره‌وشتی جوان و باش، كه‌ئیبن ماجه ڕیوایه‌تی كردووه پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رمووێ (أنما بعثت لاتمم محاسن الاخلاق ) رواه احمد والبيهقى واته: من نێردراوم بۆ ته‌واوكردنی خوره‌وشته جوان و چاكه‌كان، له‌وانه‌یه یه‌كێ لێره پرسیار بكات بڵێ باشه خۆڕه‌ووشتی جوان و باش چیه و چۆنه؟ ئه‌مه‌ش وه‌ك پرسیاره‌كه‌ی ئه‌بو هوره‌یره كاتێ كه له پێغه‌مبه‌ر ﷺ كرد پێی فه‌رموو ئه‌ی ئه‌بو هوره‌یره، له‌سه‌رته خوره‌وشتت جوان و چاك بێ، ئه‌بو هوره‌یره ڕه‌زای خوای لێ بێ ووتی ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ خوره‌وشتی جوان و چاك كامه‌یه؟ فه‌رمووی سیله‌ی ڕه‌حم به‌جێ بگه‌ینی له‌گه‌ڵ ئه‌وكه‌سه‌ی كه‌سیله‌ی ڕه‌حمت له‌گه‌ڵ به‌جێ ناگه‌ینێ، لێ بووورده‌و عه‌فووت هه‌بێ له‌به‌رامبه‌ر كه‌سێ كه‌سته‌می لێت كردووه، به‌خشش و دیاری بده‌ی به‌كه‌سێ كه‌ئه‌و نایدا به‌تۆ، احياء ج٥ص١٤٤.

به‌ڵێ بۆیه باسی خوره‌وشتی جوان ده‌كه‌ین چونكه ڕوح و گیانی برایه‌تی و هاوده‌مێتی و دۆستایه‌تی و هۆگرێتیه، ئه‌وه‌ی ڕه‌گی خوره‌وشتی جوان و چاك بێ ئیمان و ته‌قوای به‌جێیه، كه‌پێیه‌وه دڵه‌كان هۆگر ده‌بن و جیاوازی و ته‌فره‌قه له‌نێوانیاندا نامێنێ، وه‌ك خوای گه‌وره ده‌فه‌رمووێ (لو انفقت مافي الارض جميعا ما الفت بين قلوبهم ولكن الله الف بينهم) واته: ئه‌گه‌ر هه‌رچی موڵك و سامانی دونیا هه‌یه سه‌رفی بكه‌ی (ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا)بۆ هۆگریه‌تی و ته‌بایی دڵیان بۆت نه‌ئه‌كرا به‌ڵام خوای گه‌وره دڵیانی كرد به‌یه‌ك، به‌ڵێ به‌یه‌ك ئاوات یه‌ك بیروباوه‌ڕ یه‌ك ئامانج، خوای گه‌وره ئه‌و دۆستایه‌تی و

هاوده‌میێتیه‌ی له‌پاڵ ئیمان و ته‌قوا داناوه به‌فه‌زڵ و نیعمه‌تی خۆی ناو بردووه وه‌ك ده‌فه‌رمووێ (فاصبحتم بنعمته اخوانا) واته: ئێوه له‌سایه‌ی نیعمه‌ت و به‌خششی خواوه بوون به‌براو دۆستی یه‌كتر ،هه‌روه‌ها پێغه‌مبه‌ری ئازیز ﷺ ده‌فه‌رمووێ (من اراد الله به خيرا رزقه خليلا صالحا إن نسي ذكره وان ذكر اعانه)رواه ابوداود من حديث عائيشة..واته: ئه‌گه‌ر خوا گه‌وره یه‌كێكی خۆش بوێ وه دۆستێكی چاك و خۆشه‌ویست و صالحی پێ ده‌به‌خشێ جا كاتێ كه‌وته غه‌فله‌ت و بێ ئاگاییه‌وه دۆسته‌كه‌ی فریای ده‌كه‌وێ خودای بیر ده‌خاته‌وه، وه‌كاتێكیش یادو زیكری خوای كرد ئه‌وه دێت به‌كۆمه‌كیه‌وه‌و یارمه‌تی ده‌دات و پشتی ده‌گرێ.

له‌عاله‌می به‌رزه‌خدا واته (له‌وكاته‌ی كه‌ڕوح و گیان له‌به‌ده‌نا ده‌رده‌چێ تا ئه‌وكاته‌ی ڕۆژی زیندوو بوونه‌وه دێ )له‌وێنده‌رێش ئه‌وكه‌سانه‌ی كه‌له‌دونیادا یه‌كتریان خۆش وویستوه دۆستایه‌تی یه‌كتریان كردووه گیان و ڕوحیان به‌یه‌كه‌وه كۆده‌بێته‌وه، یه‌ك مه‌صیرو چاره‌نووس ده‌یانگرێته خۆی، كه شیا و شایسته‌ی هاوشان و بیروباوه‌ڕو خۆشه‌ویستایه‌تیان بێ، هه‌روه‌ها له‌دوا ڕۆژوو قیامه‌تیشدا خۆشه‌ویستان به‌یه‌كه‌وه كۆده‌كرێنه‌وه و یه‌ك مه‌صیر و چاره‌نووس پێشوازیان لێ ده‌كات.

ئه‌بو ئیدریس خه‌ولانی ووتی به مه‌عاز: من تۆم خۆش ده‌وێ له‌به‌ر خوداو له‌ڕێگه‌ی خوادا له‌به‌ر هیچی ترنا ،جا مه‌عاز پێی فه‌رمووبه‌شاره‌ت بێ مـوژده بێ پاشان دیسان مزگێنی و به‌شاره‌ت بێ لێت، كه‌من گوێم له‌پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بووه، ده‌ی فه‌رموو: بۆهه‌ندێك له‌خه‌ڵك و مه‌ردوومان كورسی و قه‌نه‌فه‌ی به‌ها دانه‌مه‌زرێنن له‌ده‌ووروبه‌ری عه‌رشی خودا له‌ڕۆژی قیامه‌تدا ڕه‌نگ و

ڕووخساریان وه‌ك مانگی چوارده‌ ده‌دره‌وشێته‌وه‌، له‌وكاته‌ی كه‌خه‌ڵكان له‌ترس بیم دان ئه‌وان له‌ئاسایش و بێ ترسین، ئه‌وكاته‌ی خه‌ڵكان له‌ناڕه‌حه‌تی دان و غه‌مگینن، ئه‌وان ئاسوده‌و بێ غه‌من ئه‌وان دۆست و ئه‌ولیای خودان ترس و بیمیان نیه‌ وه‌غه‌مگین و زویریش نابن، ووترا ئه‌وانه‌ كێن ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ ؟ فه‌رمووی: ئه‌وانه‌ن كه‌خۆشه‌ویستی خودا كۆی كردونه‌ته‌وه‌ له‌به‌ر خوا یه‌كتریان خۆش وویستووه‌، احیاء ج٢ ص١٤٤.

طبرانی له‌عائیشه‌ (ڕه‌زای خوای لێ بێ ) گێڕاویه‌تیه‌وه‌ پیاوێ هاته‌ لای پێغه‌مبه‌ر ﷺ ووتی ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ من تۆم له‌گیان و نه‌فسی خۆم و له‌ئه‌ولاده‌كانی خۆمم خۆشتر ده‌وێی، كه‌له‌ماڵه‌وه‌ یادت ده‌كه‌م ناحه‌وێمه‌وه‌ ئۆقره‌ ناگرم تاكو نه‌یه‌م نه‌ت بینم و بۆت نه‌ ڕوانم و كاتێ بیر له‌مردنیشم ده‌كه‌مه‌وه‌ له‌گه‌ڵ مردنی تۆ، تۆ چوویته‌ به‌هه‌شته‌وه‌ شوێن و مه‌ئوات به‌رزو بالآیه‌و به‌رز ده‌كرێیه‌وه‌ له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌رانا ده‌بیت (علیهم الصلاه والسلام) ئه‌گه‌ر خوای گه‌وره‌ لێم خۆش بێ، ئه‌وكاته‌ ده‌ترسێم و غه‌م ده‌خۆم كه‌نه‌ت بینمه‌وه‌، پێغه‌مبه‌ر ﷺ هیچ وه‌لآمێكی نه‌دایه‌و بێ ده‌نگ بوو حه‌زره‌تی جوبرائیل ئه‌و ئایه‌تانه‌ی هێنا له‌لایان په‌روه‌ردگاریه‌وه‌، كه‌تێیدا ده‌فه‌رمووێ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ﴿٦٩﴾ (النساء ٦٩) واته‌: ئه‌وه‌ی گوێڕایه‌ڵی خوداو پێغه‌مبه‌ر ﷺ بكات ئه‌وانه‌ له‌ڕۆژی دواییدا، له‌گه‌ڵ ئه‌وكه‌سانه‌ ده‌بن كه‌خودای گه‌وره‌ ڕێزو به‌هره‌و نیعمه‌تی به‌سه‌ردا دارشتون له‌ پێغه‌مبه‌ران ڕاستگۆیان و شه‌هیدان و پیاوچاكان، كه‌باشترین و چاكترین دۆستانێك ده‌بن له‌ناو باغ و باغاتی به‌هه‌شتا...

دۆستی چاك وەك كانیاوی ئاوی شیرینە، وەك بەهاری هەمیشە ڕەنگینە لەتام و بۆ وەك هەنگوینە، لـەتاریکا هـەر ڕێ بینـە لەپـەژارەوفرە بـەلاّ غـەم ڕەوینە، خاوەن بەهرەیە و بەخیل نیە لای گەرەکە تۆش هەروەك ئـەو لـەڕێگای ئەو، بکەویتە خۆشی ژینە، وەك ڕووناکی تاریك کوژە وەکو ئـاوی تێنـوو بـڕە وەك خواناسیّ لەم زەمینە بەخۆی پاکەو پاکی دەویّ و هەرپاك بینە.

بەلاّم دۆستی خراپ وەك کێڵگەی بیّ پیت و فەڕە پـڕ لـەمارو دوپـشك و گێچەڵ و قیڕە و شەڕە، بەلاّ فرۆشە بیّ بەشت ناکات لەنەگبەتی سروشتی پاکت چەواشە دەکات ئاسۆی دەرونت پڕ میکرۆب دەکـات، مـاڵ و خێزانـت شـپڕزە دەکات،بەختیاری و شادیت گـشت لیّ تێـك دەدات ڕەنـج و کۆشـشت بـەفیڕۆ دەدات ئەنجام خراپ و مایەی پووچ و بەدبەختت دەکات.

لەدوارۆژوو قیامەتیشدا دۆستایەتییّ بناغـەکەی لەسەر عیلم و خواناسـین بیّ، بەردەوام دەبیّ پڕ بەهرەو شکۆمەند دەبیّ و، خاوەن پیرۆز شوێن پیّ زانینی خودای میهرەبان و گشت پێغەمبەران و سەرجەم فریشتەکان و خواناسان دەبیّ.

بەلاّم دۆستایەتی کەبنەماکانی لەسـەر هـەواو ئـارەزوو دونیـا پەرسـتی دامەزرابیّ مایەی هەرمەقت و پەشیمانی و چارەڕەشی دەبیّ ، هەر نـەفرەت و قـین و ئـازار و ئەشـکەنجە دەبـیّ، فـەرموون بـزانن خـودای شـکۆمەند چـی دەفـــــەرمویّ ﴿ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾﴾

(الزخرف ٦٧) واتە: هاودۆستانی خۆشەویست لـەڕۆژی قیامـەتـدا هەنـدێکیان دەبنەوە دوژمن و ناحەزانی هەندێکی تر، تەنها خواناسان و خواپەرستان نـەبیّ کەدۆستایەتی و خۆشەویستیان بەهرەدار دەبیّ .

خوێنەری ئازیز ئەگەر تـۆش دەتـەویّ چـارەنووس و سـەرەنجام و پایـە و

سایەی خۆت بزانی، چی یە و چۆن دەبـیٚ ،دەبـیٚ بـۆ هـاوریٚ ی خۆشەویـستت بروانی ئەو چۆنە تۆش هـەر ئـەوهای، ئـەو چـی بـیٚ تـۆش هـەر ئـەوی ،وەك پیٚغەمبەری خۆشەویست دەفەرمووێ (المرء على دين خليله فلينظر احدكم مـن يخالـل ) اخرجـه ابـوداود، هەركـەس لەسـەر ديـن و ئـايينى خۆشەويـست و دۆستەكەيەتی جاهەر يەكیٚ لەئیٚوە بڕوانی كیٚیە دۆست و خۆشەويستەكەی جـا پیٚويستەئەم دوعايە فەرمۆش نەكەين (اللهم رزقنا خليلاً صـالحا وعلمـا نافعـا وقلبـاً خاشـعا ولـسانا ذاكـرا) خوايـە گيـان دۆسـتانیٚكی صـالح و خواناسـان بەقسمەت كە، لەگـەل زانيـاریٚكی بەسـوود، دليٚكـی پـر تـرس لـەتۆ لەگـەل زوبانیٚكی تەرو پاراو بەزيكرو يادی تۆ.

پاش ئەم روون كردنەوەيە ئەوسا باشتر ریٚزی مانای ئـەم فەرموودەيـەمان بۆ ڕوون دەبیٚتەوە كە پیٚغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : (لا تأكل مـن طعامـك الا التقي ولا تأكل الا من طعام التقي ولاتصاحب الا مؤمنا) واتە: خواردنت بـدە ئادەميزادی لەخواترس وە لەخواردنی ئادەميزادی لەخواترس بخۆ، برادەرايـەتی و هاودەمیٚتی خواناس و ئيماندار بكەو بەس.

# گوێ ڕایەڵی

ئادەمیزادی موسڵمان پێویستە بزانێ کێ شایستەی گوێڕایەڵیەو سنورو مەودای گوێڕایەڵی و مەرج و شەرتەکانی ئاگادار بێ، چونکە ئادەمیزاد لەژیانیدا لەزۆر لاوە سەرنجی ڕادەکێشرێ، هەواو ئارەزووەکانی خۆشی لەگەڵ وەسوەسەکانی شەیتانەکان داوای لێ دەکەن گوێ رایەلیان بێ، دایك و باوك برادەرو پاشاو ئافرەت و بەهەمان شێوە، گشتیان بەزمانی حال یا راستەوخۆ یا ناراستەوخۆ سەرنج راکێشەرن و داوای گوێ رایەلیت لێ دەکەن ئەگەر ئادەمیزاد بەرنامەیەکی چەسپاو، راست و رەوانی نەبێت لەژیانیدا توشی سەرسورمان دەبێ و سەری لێ دەشێوێ، بەگوێڕایەلێتی کەسانێکدا دەکەوێ لەوانەیە بەختیاری و ئاسودەیی لێ وێڵ و ببێ و سەرەنجام پەشیمان ببێتەوە، جا زۆر پێویستە ئادەمیزاد لەسەرەتاوە مەرج و شەرتەکانی گوێڕایەڵێتی فێر ببێ تاکو لەئەنجامی گوێ گرتنەکانی و گوێ ڕایەڵیەکانی پەشیمانی بەرۆکی نەگرێت.

گوێ ڕایەڵی گەلێ گرنگە لەژیانی ئادەمیزاددا چونکە کرۆکەی پەرستنە، خوای گەورە ئێمەی بۆیە بەدیهێناوە تاکو گوێڕایەڵێتی ئەو بکەین و گوێڕایەڵێتی کەسێکی تر نەکەین وەك دەفەرمووێ (وما خلقت الجن والانس الا ليعبدون)واتە: جنۆکەو ئادەمیزادم بەدی نەهێناوە تەنها بۆ پەرستن و گوێڕایەڵێتی خۆم نەبێ .خوای گەورە گوێڕایەڵێتی بەمانای پەرستنی لەقورئاندا هێناوەتەوە، وەك لەسورەتی (یس) دا دەفەرمووێ ﴿ أَلَمْ أَعْهَدْ

إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾

((سوره‌تی یس ٦٠) واتـه : ئـه‌ی ڕۆلآنـی ئـاده‌می، ئـه‌ی واده‌م پـێ نـه‌داوون كه‌شه‌یتانی مه‌په‌رستن (واته گوێ ڕایـه‌ڵی مه‌كـه‌ن)ئـه‌و بـۆ ئێـوه دوژمنێكـی ئاشكرایه.

نابێ واحاڵی بین واتێ بگه‌ین عیباده‌ت و په‌رستن، ته‌نها بریتیـه له‌نوێـژو ڕۆژیێكی بێ گیان و بێ ناوه‌ڕۆك، ئه‌وه‌ی شایه‌نی باس بێ په‌رستن هه‌ر به‌مانای نوێژو ڕۆژوو نه‌هاتووه له‌قورئاندا به‌ڵكو به‌مانای گوێڕایه‌ڵێتی و خۆشه‌ویستی و ترس و بـیم و مـل كه‌چـی و، هتـد هـاتووه، ئه‌مـه‌ش وه‌ك حـه‌ق و تـه‌كلیف داوالێكراوێكی خوداییه، پێویسته هه‌ر بۆ خوا بێ ده‌نا مانای په‌رستنی تـه‌واو نـابێ، بـابزانین خـوای گـه‌وره (جـل جلالـه)چـی ده‌فـه‌رمووێ لـه‌باره‌ی گـوێ ڕایه‌ڵێتیـه‌وه خـوای گـه‌وره ده‌فـه‌مووێ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَأُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِى شَىْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٥٩﴾ (سـوره‌تی النـساء ٥٩) خوای گه‌وره بانگه‌وازی ده‌كات، بۆ خاوه‌ن باوه‌ران ده‌فه‌رمووێ: ئه‌ی ئـه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ئیمانتان هێناوه و خۆتان به‌ئیماندار ده‌زانـن، گوێڕایـه‌ڵی خـودای گـه‌وره و پێغه‌مبـه‌ر ﷺ بكـه‌ن، هـه‌روه‌ها گوێرایه‌ڵێـی ئـه‌میر و فـه‌رمان ڕه‌واكانی خۆتان بكه‌ن له‌ئیمانداران، وه ئه‌گه‌ر له‌شتێكا ناكۆك بـوون نیزاعتـان هه‌بوو یا دروست بوو، یه‌كسه‌ر بگه‌ڕێنـه‌وه لای خـودای گـه‌وره و پێغه‌مبـه‌ری ئه‌گه‌ر ئیوه ئیمانتان به‌خوداو به‌رۆژی دوایـی هه‌یـه، ئه‌مـه بۆتـان باشـترین و خێرترین چاره‌سه‌رێك و سه‌ره‌نجامێكه كه‌پر له‌خێرو به‌هره‌و مانای ئیمانی یه ..

گوێڕایەڵێتی پێغەمبەر واجبەو فەرمانی خودایە، گوێڕایەڵی پێغەمبەر واتە گوێڕایەڵێتی خوای گەورە وەك خوای گەورە دەفەرمووێ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ ۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ﴿٨٠﴾ (النساء ٨٠) واتە ئەوەی گوێڕایەڵێتی پێغەمبەر ﷺ بكات، ئەوە گوێڕایەڵێتی خودای گەورەی كردووە، وە ئەوەی پشت هەلبكات پشتی هەل كردووە لەگوێڕایەڵێتی خودا ،جا ئەی پێغەمبەری خودا تۆمان نەناردووە بەپارێزەر، بەلكو تۆ تەنها بێداركەرەوەی، ئیدی هەر كەس تاوانی خۆی والە ئەستۆی خۆیەتی گوێڕایەڵێتیت بكات یا نەیكات.

گوێ ڕایەڵێتی فەرمان ڕەوای موسلمانان واجبە چونكە ئەمرو فەرمانی خودایە ئەوەی لەگوێڕایەڵێتی فەرمان ڕەوای موسلمانان دەربچێ، ئەوە لەئەمرو فەرمانی خوای گەورە دەرچووە، (عن ابی هريرة رضی الله عنه عن النبی ﷺ (من اطاعنی فقد اطاع الله ومن عصانی فقد عصی الله ومن يطع الامير فقد اطاعنی ومن يعصی الامير فقد عصانی) متفق عليه، واتە: لەئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ئەوەی گوێ ڕایەلی من بكات، بێ شك و گومان ئەوە گوێ ڕایەڵێتی خوای گەورەی كردووە، وەئەوەی گوێڕایەڵێتی من نەكات ئەوە لەخودا عاصیٚ بووە و ئەمرو فەرمانی خودای شكاندوە، وەئەوەی گوێڕایەڵێتی ئەمیرو فەرمان ڕەوای موسلمانان بكات ئەوە بێ شك و گومان گوێڕایەڵێتی منی كردووە و ئەوەی گوێ ڕایەڵێتی ئەمیرو فەرمان ڕەوای موسلمانان نەكات، ئەوە لەمن عاصیٚ بووە لەئەمرو فەرمانی من و خودای گەورە دەرچووە.

هەروەها خوای گەورە (سبحانه وتعالی) لەسورەتی التغابن ئایەتی ١٦ دا

دەفەرمویێ ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٦﴾﴾ واتە: هەتا دەتوانن لەخودا بترسین و گویێ رایەلی فەرمانەکانی بن، گوێگرو گویێ رایەل بن وەمال ببەخشن لەپێناوی رێگەی خودا، ئەمانە باشترین و چاکترین شتانێکن بۆ نەفس وگیانی خۆتان ئەوەی خۆی پاك بکاتەوە لەرەزیلی و رژدی و پیسی ،ئەوە بەختیار و سەرکەوتووە .

ئاینی پیرۆزی ئیسلام داوای لێك حالی بوون و تێك گەیشتن دەكات پێش گوێرایەلی ،ئەگەر هات و ئەمرو فەرمانەکە حوکمی ئیمان نەبوو لە بۆ خودا نەبوو، واتە پێچەوانەی فەرمان و ئەمری خوا بوو ئەو کاتە گوێرایەلێتی نی یەو نابێ، چونکە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام گوێرایەلێتی بۆ خودایە و لەبەر خودایە، بەجێ گەیاندنی ئەمرو فەرمانی ئەو هەر کاتێ پێچەوانە بووەوە، ئەو کاتە نابێ گوێرایەلێتی بکرێ جا هەرکێ بێ ،وەگوێ رایەلێتی بەدیهێنراو لەبێ فەرمانی خودادا نابێ و دروست نی یە، وەك پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمووێ (لاطاعة لمخلوق فى معصية الخالق) هەروەها عن ابن عمر (رەزای خوای لێ بێ)عن النبى ﷺ قال : (على المرء المسلم السمع والطاعة فيما احبه وكره الا ان يؤمر بمعصية فاذا امر بمعصية فلا سمع ولا طاعة) متفق عليه، واتە لە عەبدوللای کوری عومەرەوە (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی لەسەر هەموو ئادەمیزادێکی موسلمان واجبە گوێ بگرێ و گوێرایەلی بکات لەوەی پێ ی خۆشە و لەوەی پێ ی ناخۆشە، ئیللا ئەگەر فەرمانی پێ کرابێ بەشتێ کەمایەی لەخودا عاصێ بوون و دەرچوون لە ئەمری خوای تیا بوو، ئەو کاتە نابێ گوێ ی بۆ بگرێ و وەناشبێ گوێرایەلی

بكات، مسلم و بوخاری ریوایەتیان كردووە.

لەئیمامی عەلی رەزای خوای لێ بێ وتی پێغەمبەر ﷺ سریەكی واتە كۆمەلە كەسانێكی نارد بەلای كارێكا و یەكێكی ئەنصاری واتە صەحابەیەكی مەدینەی لەسەر كردنە ئەمیرو براگەورە و ئەمرو فەرمانی پێ كردن كەوا گوێ لەئەمرەكانی بگرن و گوێ رایەلێتی بكەن، پاش ئەوەی لەپێغەمبەری خوا ﷺ جیا بوونەوە، ئەمیرەكەیان لێیان تووڕە بوو لەشتێكا وتی دارم بۆ كۆبكەنەوە، داریان بۆ كۆكردەوە، پاشان ووتی ئاگری تێ بەردەن، ئەوانیش ئاگریان تێ بەردا پاشان ووتی ئایا ئەدی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمری پێ نەكردن كەگوێرایەلیم بكەن و بەگوێم بكەن وتیان بەلێ وابوو، وتی برۆنە ناو ئەو ئاگرەوە؟ ئەوانیش ووتیان ئیمانمان هێناوە بە پێغەمبەر ﷺ (تاكو لەئاگر دووربین ) جا هەندێكیان دەیان روانیە هەندێكی تریان وەلەدلّدا نیگەران و سەرسورماو ببوون، جا بەو شێوەیە مایەوە تاكو ئەمیرەكەیان تووڕەییەكەی رۆیی و ئاگرەكە كوژایەوە، پاش ئەوەی گەڕانەوە لای پێغەمبەر ﷺ سەر گوزشتەی خۆیان بۆ باس كرد ئەویش فەرمووی چووبانایە ناو ئاگرەكە، هەر لەناوی دەمانەوە هەتا هەتایی، واتە بەبەجێ گەیاندنی فەرمانەكەی، تووشی جەهەننەمی هەتا هەتایێ دەبوون فەرمووی گوێرایەلێتی نی یە لەبێ ئەمرو فەرمانی خودا، بەلكو گوێرایەلێتی بۆ خودایە لەچاكە كاری چاكە خوازی (انما الطاعة فی معروف ولیست الطاعة فی المعصیة) (مشكلات الدعوة الداعیة) ل٩٥، هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ لەفەرمایشتێكا دەفەرمووێ (من خلع یدا من طاعة لقی الله یوم القیامة ولا حجة له ومن مات ولیس فی عنقه بیعة مات میتة جاهلیة) رواه مسلم، واتە: ئەوەی دەست بكێشێتەوە لەگوێ رایەلی

بەم حالەشیەوە بەلیقای خودای بگات لەرۆژی قیامەتـدا ئـەوە هـیچ بەهانـەو حوججەیەكی نامێنێ، بۆ ئەوەی بیكات بەمایەی لێ خۆش بوونی. ئەوەی بمرێ و دونیا بەجێ بێلێ و بەیعەت و بەلێنێكیشی لەمل دانـەبێ كـە دایبێتـی بـۆ سەرخستنی دین و بەرنامەی خوا، ئەوە بەمردنێكی جاهیلی و نـەفامی و بـێ ئاگایی لەحەقیقەت مردووە..ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی كردووە.

هـەروەها پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمووێ (مـن رای مـن امـیره مـا یكـره فلیصبر علیه فانه من فارق الجماعة شبرا فمات الا مـات میتـة جاهلیـة ) رواه الشیخان، واتە ئەوەی شتێكی لەئەمیرەكەی دیت مایـەی پـێ نـاخۆش بـوونی بوو، نەكات جیا ببێتەوە لەكۆرو كۆمەلی موسلمانان بـەلكو صـەبرو ئـارامی لەسەر بگرێ و بزانێ بەڕاستی ئەوەی جیا بێتەوە لەكۆرو كۆمـەلی موسـلمانان بەقەد بستێ، پاشان بمرێ ئیللا مردوە بەمردنێكی جاهیلانەو نەفامانە..

لەم ئایات و فەرموودانەدا بۆمان ڕوون بووەوە كەوا گوێڕایەلێتی واجبـەو ئەركی سەرشانی نادەمیزادە و مانای عیبادەت پەرستن و تـەواو دەكـات، زۆر لەئایەتەكانی قورئانی پیرۆز ئەم ڕاستیەمان بۆ چەند بارەدەكەنەوە.

هەروەها لەفەرمایشتەكانی پێغەمبەری خۆشەویست تیایاندا حالیمان دەكەن كە پیرۆزی و بەرزی و ڕەحمەت و هیدایەت بەختیاری و ئاسوودەیی و دوور لەبەلایی، ڕووسپێتی قیامەت و بەهەشتی پر نیعمەت و شكۆمەندێتی گشتی لەگوێڕایەلێتی خودای گەورە ..لەكۆتاییدا لەخوای گەورەیە دەپارێنەوە دەلێن (اللهم ربنا انا نعوذبك من قلب لاتخشع ومن عین لاتدمع ومن دعاء لایستجاب لها ) با بێینە سەر باسی ئەوانەی كە گوێڕایەلێتیان قەدەغە كراوە ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ، گوێڕایەلێتان دەبێ بەمایەی لەدین و بەرنامەی

خودا دەرچوون..بەراستی ئەگەر ئادەمیزاد لەکرۆکەو مانای پەرستن حالی ببێ و تێ بگات کە گوێرایەلێتی واتە پەرستن، بۆیە هەر دەبێ بۆ خودا بێ و لەبەر خودابێ و بەئەمرو فەرمانی خودا بێ، ئەو کاتە ئامادەیی تیا نابێ لەگوێ ڕایەلێتی هەواو ئارەزووی خۆی یا یەکێکی وەکو خۆی، یا بۆ هەر بەدیهێنراوو مەخلوقێکی تر، وەك شەیاتینەکانی ئینس و جن دیار و نادیار گەورەو بچوك .جێگەی خۆیەتی لێرەدا بزانین پەروەردگاری زیندوومان چی دەفەرمووێ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٧﴾ فَلَا تُطِعِ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ وَدُّوا۟ لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴿٩﴾ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّآءٍۭ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ عُتُلٍّۭ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ ﴿١٤﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَـٰتُنَا قَالَ أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٥﴾ (سورەی القلم/٧-١٥)، واتە: گوێرایەلی درۆزنان مەکەن ،ئاواتیانە نەرمی بکێشی، ئەوانیش مەکرو سیاسەتی نەرمی دەنوێنن بۆ تەنازوول کردنت لەسەر خوا پەرستی و بەرنامەکەت، هەروەها گوێرایەلی هەموو ئەو کەسانە مەکە کەهەمیشە سوێند و قەسەم بەدرۆ دەخۆن، ئادەمیزادی نزم و سوکن، کە سیفەت و داب و نەریتیان بریتی یە لەقسەو قسەرۆك و تانەوەشێنی، هات و چوونی غەیبەت و نەمیمی یە، هەمیشە دەرگای خێر دادەخا، دەست درێژی دەکا و لەتاوان کردندا ناپەنگێتەوە، سەرەڕای لوت بەرزی ئێسك گران و باوك نادیارن، کاتێك خۆی بەخاوەن ماڵ و منداڵ زانی وەئایاتانی خودای پێ گەیشتوو بۆی خودێندرایەوە دەڵێ ئەفسانەیە، هەرچەندە ئایەتەکان تەوجیهی پێغەمبەر ﷺ کراون، بەلاّم فەرمانەکەی گشتیەو عامە، لەسەر موسڵمانانە

گوێڕایه‌ڵێتی ئه‌و جۆره كه‌سانه نه‌كه‌ن كه‌پۆشاك و كاڵاو باڵایان به‌سیفه‌تانی ناوبراو دیارن و مه‌شهورن .

هه‌روه‌ها خوای گه‌وره ده‌فه‌رمووێ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ بَلِ ٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلنَّٰصِرِينَ ﴿١٥٠﴾ (ال عمران ١٤٩-١٥٠) واته: ئه‌ی ئه‌وكاسانه‌ی ئیمانتان هێناوه گوێڕایه‌ڵێتی كافرو بێ باوه‌ڕان مه‌كه‌ن، ئه‌گه‌ر گوێڕایه‌ڵیان بكه‌ن ئه‌وا به‌ره‌و پشته‌وه هه‌ڵتان ده‌گێڕێنه‌وه، له‌ئایینه‌كه‌تان پاشگه‌زتان ده‌كه‌نه‌وه، سه‌ره‌نجام وه‌رده‌گه‌ڕێن و خه‌ساره‌ت مه‌ند ده‌بن، به‌ڵكو هه‌رله‌گوێڕایه‌ڵی خودا بن فه‌رزه، خودای گه‌وره هه‌رخۆی و دۆست و گه‌وره‌تانه و هه‌رخۆی باشترین پشتیوان و یاریده‌ده‌رتانه.

هه‌ر له‌و ئامۆژگاریانه خوای گه‌وره بۆ پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی و موسڵمانان ده‌فه‌رمووێ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴿٢٨﴾ (سوره‌تی الكهف ٢٨) واته: گوێڕایه‌ڵی كه‌سانێ مه‌كه‌ن بێ ئاگاو غافڵمان كردووه، له‌ڕاست و یادو به‌رنامه‌ی خۆمانه‌وه، دڵ و بیرو هۆشی به‌دوای هه‌واو ئاره‌زووی كه‌وتووه ئه‌مرو فه‌رمانه‌كانی زیاده‌ڕه‌وی و به‌هیلاك چوونه.

هه‌روه‌ها خوای گه‌وره ده‌فه‌رمووێ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١﴾ (سوره‌تی الاحزاب ١)

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر خواپەرستی و فەرمانەكانی بەردەوام بە، گوێڕایەڵی بێ باوەڕو دووڕوان و مونافقان مەكە .

هەروەها لەسورەتی الانعام دەفەرمووێ وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿١١٦﴾ (سورەتی الانعام ١١٦) واتە: ئەگەر گوێڕایەڵی زۆربەی خەڵك و مەردومان بكەی لەسەر زەوی، ئەوە گومڕات دەكەن لەڕێگەی هیدایەتی خودای لات دەبەن .

هەروەها خوای گەورە لەبارەی ئەوانەی پەنجەی پەشیمانی دەگەزن لەڕۆژی دواییدا، دەفەرمووێ وَقَالُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ (سورەتی الاحزاب ٦٧) واتە: ووتیان پەروەردگارا ئێمە گوێڕایەڵی گەورەو سەرۆكەكانی خۆمان بووین جا ئەوان گومڕاو وێڵیان كردین، وەلەڕێگەی خودای گەورە ئێمەیان ترازاند هەروەها هەرلەم بارەیەوە دەفەرمووێ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ (سورەتی الاحزاب ٦٦) واتە : ڕۆژی قیامەت لەناو ئاگر دەم و چاوی ستەم كارو گومڕاوان هەرگێڕو وەرگێڕ دەكرێن هاواریان لێ بەرز دەبێتەوەو دەڵێن ئای خۆزیاگە گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرمان بكردبایە .

هەروەها خوای گەورە لەبارەی گوێڕایەڵی دایك و باوك دەفەرمووێ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَآ ۚ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ (سورەتی العنكبوت ٨) ئەگەر باوك و دایكت كۆششیان كرد بەوەی و هاوبەشی بۆخودا

بڕیار بدەیت، تۆش زانیاری و علمت پێیەوە نیە گوێڕایەڵیان مەکە .. بەڵێ نەك هەردایك و باوك، بەڵكو هەر كەسێكی تر بێ، دروست نیە لەبچوكترین بێ شەرعیدا گوێڕایەڵی بكرێ.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێ إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٥٢﴾ (سورەتی النور ٥١-٥٢) واتە: گوفتارو وتاری ئیمانداران كاتێك بانگ بكرێن بۆلای خوای گەورە و پێغەمبەرەكەی بۆ ئەوەی حوكم و فەرمانڕەوایی بكات لەنێوایاندا،بەدڵ و بەگیانەوە دەڵێن بیستمان و گوێڕایەڵین، ئائەوانە سەكەوتوو سەرفرازن، جا ئەوەی گوێڕایەڵ بێ، لەخوا بترسێ و فەرمانەكانی بەرقەرار بكات، ئائەوانە سەركەوتوو دەبن، ئەوەی ئەمڕۆ زۆربەی خەڵك گیرۆدەی ببێ بەدەستیەوە بەدواكەوتنی هەواو ئارەزووە خۆ ڕازی كردنی لێ بۆتە خوو ڕازی كردن، لەبیریان چۆتەوە خوا ڕازی كردن گەلێ جیاوازی هەیە لەگەڵ خۆڕازی كردن و كەوتنە دوای هەواو ئارەزووەوە كەپرپەتی لەوێلی و مەینەت و حەسرەت و پەشیمانی، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرمویٚ أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَـٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَـٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾ (الجاثية/٢٣) واتە: (ئایا ئەو جۆرە كەسەت دیوە كەهەواو ئارەزووی خۆی كردۆتە پەرستراو و خوای خۆی، كەوتوتە گوێڕایەڵی نەفس و هەوای خۆی، جا خودای گەورە گومڕاو وێڵی كردووە لەسەر ئەو زانیاریەی هەیە و گوێ و دڵی مۆركردەوەو پەردەو

غیشاوه‌ی به‌سه‌ر چاویا داهێناوه، جاكێ هیدایه‌تی ده‌دات له‌پاش خوای گه‌وره ئایا بیرناكه‌نه‌وه ووردنابنه‌وه، جابه‌دواكه‌وتنی هه‌واو ئاره‌زوو گوێڕایه‌ڵ كردنی ده‌بێته مایه‌ی گومڕایی و وێڵی، جا هه‌ركه‌سێ بێ له‌چ پله‌یه‌كی زانیاری دابێ، ئه‌وه‌تا خوای گه‌وره ڕوه‌وو حه‌زره‌تی داود چی ده‌فه‌رمووێ ﴿يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾﴾ (سوره‌تی ص٢٦) واته: ئه‌ی داود ئێمه تۆمان گێڕاوه به‌جێنشین له‌سه‌ر زه‌وی، حوكم و فه‌رمان ڕه‌وای به‌حه‌ق بكه و به‌داوای هه‌واو ئاره‌زوو نه‌كه‌ویت، چونكه ده‌بێ به‌مایه‌ی گومڕابوونت له‌ڕێگه‌ی خودای گه‌وره، به‌ڕاستی ئه‌وانه‌ی گومڕا ده‌بن له‌ڕێگه‌ی هیدایه‌تی خوا عه‌زاب و ئه‌شكه‌نجه‌یه‌كی توندو به‌هێزیان له‌بۆ هه‌یه، له‌به‌رامبه‌ر ئه‌وه‌ی ڕۆژی قیامه‌ت و لێپرسینه‌وه‌یان فه‌رامۆش كردوه‌و به‌دوای هه‌واو ئاره‌زوو كه‌وتونه .به‌ڕاستی ئاده‌میزاد ئه‌گه‌ر وه‌زیفه‌و كاری خۆی پێ شێل بكات تووشی خه‌ساره‌ت مه‌ندی دێت، كه‌بریتیه له‌گوێڕایه‌ڵی خوای گه‌وره‌و میهره‌بان به‌دوای هه‌واو ئاره‌زووی خۆی یا یه‌كێكی وه‌ك خۆی بكه‌وێ به‌بێ زانیاری و هیدایه‌ت له‌خوایه‌وه بۆی هاتبێ .

پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویست ده‌فه‌رمووێ (لايجمع الله هذه الامة على الضلالة ابدا) ( يد الله مع الجماعة فاتبعوا السواد الاعظم فانه من شذ شذ في النار) واته: خوای گه‌وره ئه‌وئوممه‌ته‌ی هه‌رگیز كۆناكاته‌وه له‌سه‌ر گومڕایی ووێڵی و فه‌رمووی ده‌ستی خوای گه‌وره له‌گه‌ڵ كۆڕو كۆمه‌ڵی موسڵمانانیه جا به‌دوایی ڕه‌شایی هه‌ره گه‌وره بكه‌ون وه‌ئه‌وه‌ی شازو نادربێ و ته‌نها بێ، له‌ئاگری جه‌هه‌نه‌میشا هه‌روه‌ها ده‌بێ، پێغه‌مبه‌ری ئازیز ﷺ ده‌فه‌رمووێ (عليكم

بالجماعة اياكم والفرقة فان الشيطان مع الواحد وهو من الاثنين ابعد ومن اراد بحبوحة الجنة فعليه بالجماعة) اخرجه امام احمد في المسند )٢٧٨/٣٧٥ واته: لەسەرتان ئەرك و واجبە لەگەڵ كۆڕو كۆمەڵی موسڵمانان بن، خۆ بپارێزن لەجیایی و تەفرەقە، بزانن بەڕاستی شەیتان لەگەڵ یەكێكایە كەبەتەنها بێ و لەدوو كەسان بەدوورترە، هەروەها ئەوەی ناوەڕاستی بەهەشتی دەوێ بالەگەڵ كۆڕو كۆمەلا بێ دوورە پەرێزوو تەنها نەبێ لەخواپەرستی و موسڵمانێتیەكەی.

لەنـەعمانی كـوڕی بەشـیر ڕەزای خـوای لێ بـێ پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی كۆمەڵی و جەماعەت، و ڕەحمەتە وەجیا جیایی و فیرقە فیرقە و ئەشـكەنجەیە. هـەروەها لەحوزەیفـەی كـوڕی یەمانـەوە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی (تلزم الجماعة المسلمين وامامهم قلت فان لم يكن لهم جماعة ولا امام قال فاعتزل الفرق كلها ولو ان تعض باصل الشجرة حتى يدركك الموت وانت على ذلك) رواه البخاري، دەست بەكۆمەڵی موسولمانان و ئیمامەكایانەوە بگرن، ووتم ئەگەر هاتوو موسڵمانەكان كۆمەڵ و ئیمامیان نەبوو ؟فەرمووی خۆت دوور بگرە لەهەموو كۆمەڵە جیاجیاكان و ئەگەر لەبەر هەژاریشت گەززەو قەمپار بدەیت لەڕەگی دار هەتاكو مردن پێت دەگاو تۆش هەر بەم شێوەیەوە بمێنیتەوە.

لەم ئایەت و فەرموودانەدا بۆمان ڕوون بوەوە، گوێڕایەڵی و بەدواكەوتن گەلێ گرینگە لەئایین و بەرنامەی خوادا، دەبێ هەر بۆخوا بێ و بەفەرمانی خوابێ، لەبەر خوابێ، بەنیەت بۆ خوا بێ ئەوسا مانای بەندایەتی ڕاست دەبێتەوەو ئەوسا دەتوانی و توانیوتە خوا ڕازی بكەیت، ئەمەش بەڕەحابەتی سینەوە بەعیشق و مەبەستەوە بەعەقل و نیەتەوە بەهۆش و حاڵی بوونەوە، جالەدوا دێرەكاندا ڕووەو خودای میهرەبان دەڵێین.

(اللهم ربنا علمنا بما ينفعنا ونعوذ بك من علم لاينفع)

# لەگەڵ گیانی ئاییندا

ئاییینی پیرۆزی ئیسلام وەکو چۆن بیروباوەڕێکی سەربەخۆو ڕێك و پێك و دیاری هەیە، کەکۆکراوەو دروشمەکەی خۆی دەنوێنێ (لا اله الا الله محمد رسول الله ) ئاوەهاش خوڕەوشت و دابونەریتی تایبەتی خۆی هەیە، ئادەمیزاد هان دەدات کەخۆی پێ برازێنێتەوە وەخۆی پێ بەهرەمەند بکات، وەلەڕاستیدا هەموو بەش و پارچەکانی ئیسلام بەیەکەوە هاوپەیوەندن و بێی یەك هەڵناکەن و یەك ئاست و پلە دەگرنە یەك، بۆ نمونە ئادەمیزاد ناتوانێ بیروباوەڕی بەهێزو تەواو بێ، لەهەمان کاتیشدا بەندایەتی و خواپەرستیەکەی شلۆق و نارێك بێ، یاخوت ڕەوشت و دابونەریتەکەی ناشرین و ناپەسند بێ، یا گوێ نەدا بەهەندێ لەفەرمان و ئەمرەکانی خودای گەروە ، یا بەمانایەکی تر ئادەمیزاد تاکو بیروباوەڕی بەتین و دروست بێ، خوا پەرستی و بەندایەتیەکەشی بەرەو باشترو ڕێك و پێك تر دەبێ و خورەوشتیشی ئاسۆی چاك و باش و فراوان دەبێ وەباشترو چاکتر بەسینەی فراوانەوە، پێشوازی لەئەمرو فەرمانەکانی خودای گەورە دەکات ، بیروباوەڕی بەتین ئادەمیزاد بەرەو ئەو خوڕەوشتانەی کە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بەکارو کردەوە سەلماندویەتی دەبات، کەبووە بەمایەی ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە بۆ خۆی و بۆ دەوروبەرەکەی و بۆ سەرجەم جیهانیەکان، خوڕەوشت و داب و نەریت و کاری بەپێزو پیرۆز هەر لەئیسلامدایە ،هەر لەئیسلامدا ڕەگ و ڕیشەی داکوتاوەو بەروبومی هەیەو ئەنجامی باش سەرەنجامیەتی، جائەم ئاییینە پیرۆزە وا لەمرۆڤ دەکات کەگیانی لێبوردن و عەفو کردنی لەلا دروست ببێ و لەئاست ئادەمیزادەکان و باقی

گیاندارانی تریش خوای پەروەردگار دەفەرمووێ ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٣٤﴾﴾ (ال عمران ١٣٣-١٣٤) واتە: کێ بەرکێ بکەن بۆلای مەغفیرەت و لێ بوردەیێ کەلەپەروەردگاتانەوەیە هەروەها بۆ بەهەشتێ کەپانایییەکەی بەقەد ئاسمانەکان و زەویە، ئامادە کراوە بۆ خواناسان و خواپەرستان، ئەوانەی ڕژدی و ڕەزیلیان ژێر پێ خستوەو ماڵی خۆیان لەڕێگای خوادا دەبەخشن لەکاتانی خۆشی و ناخۆشیدا بەنهێنی و بەئاشکرا، هەروەها هەڵچوون و توڕەیی خۆیان دەخۆنەوە دەری ناخەن و خەڵکانی پێ زامار ناکەن، هەردەم لێ بووردەن لەئاست خەڵك و مەردووما، لەوکەسانە دەبوورن کەهەلەو تاوانیان لەئاستدا ئەنجام دەدەن، خوای گەورە پیاوچاکانی خورەوشت جوانی خۆش دەوێ، لەناوەڕۆك و ڕوح گیانی ئەم ئایەتانە، ئادەمیزادی هۆشیارو خاوەن ئیمانی پاك و پوختە هان دەدات، هەردەم لەبیری ئەوەدا بێ چۆن کارو ڕەفتارێ وابکات ببێ بەمایەی چوونە بەهەشت، هەروەها هانی دەدات لەنێوان خواپەرست و موسوڵمانان خۆی ببینێتەوە، زاڵی دەکات بەسەر ڕژدی و ڕەزیلی و هەڵچوون و توڕەییەوە، ئامۆژگاری دەکات کەهەردەم لێ بوورده بێ و خۆی بگەیەنێ بەدونیای چاکەکاری و چاکەخوازی و خۆشەویستانی خوداییەوە، کەئەم خورەوشتە جوانانە ڕەگی داکوتا لەدڵ و دەروونی ئادەمیزاد و، دەبێ بەمایەی ئاسوودەیی و بەختیاری تاك و کۆمەڵ و لەنێو چوون و بنەبڕ کردنی چەندین نەخۆشی و دەرونی و کۆمەلایەتی و ئابووری و ڕوحی و عەقلی و بەدەنی ....هتد.

هەروەها ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئادەمیزاد هانمان دەدات بۆ ئازادی و ئازادکردنی مرۆڤ و بەخشندەیی و ماڵ بەخشین و بەدەمەوە چوونی هەژاران و هەتیوان و بێ نەوایان لەڕوانگەی ئەم ئایەتانەدا دەردەکەوێ فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ أَوْ إِطْعَـٰمٌ فِى يَوْمٍ ذِى مَسْغَبَةٍ ﴿١٤﴾ يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ ﴿١٥﴾ أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ ﴿١٦﴾ (سورەتی البلد١١-١٦)واتە ئەی ئادەمیزادی خاوە ن ئیمان و باوەر قۆل و باسکی لێ هەلکەو تەنگ و چەلەمە و ناخۆشی و تەگەرە لەرێگەی ژیانا لابەرەو کۆت و پێوەندی بەندایەتی و ژێر چەپۆکی بپچرێنەوە ژیان بەرەو، ئازادی و سەربەستی بەر هەژارانی چەوساوەو برسی لەرۆژانی سەخت و نەدامەتیان فەرامۆش مەکەو خۆراك و خواردنیان پێ ببەخشە و بۆیان دابین بکە، هەروەها دەست گیرۆیی هەتیوانی دەورو بەرت بکەو بەدەمیانەوە بچۆ و کارگوزاریان بکە و فریای کەسانێ بکەوە چیان نی یە و داماو، بێ مال و پارەو پول ماونەتەوە.

ئازیزان تا ئیسلام ئیسلام بوو هەژارو داماو لەگلێنەی چاودەژیان، بەلام کاتێ کە ئیسلام پشت گوێ خرا، خەریکە ژیانی ژێر چەپۆك و نینۆکیشیان دەست ناکەوێ ...

هەروەها ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئادەمیزاد رووەو چاکە کاری و چاکە خوازی دەبات لەگەل هەموو کەسێکا، وەفێرە دادپەروەری و یامەتی دان و کەسایەتی دەکات ،وە فێرە بەزەیی و دیاری و سەخاوەتی دەکات، فێرە نان دان و جولانەوەی شیرین و دلسۆزی و خۆشەویستی و سۆزی دەکات وەك لەروانگەی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە دەردەکەوێ کەخوای گەورە تێیدا دەفەرمووێ : لَّا يَنْهَىٰكُمُ

ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ (المتحنه ٨) ..

واته : خواى گه‌وره قه‌ده‌غه‌تان ناكا له‌گه‌ل موشریك و كافران چاك بن چاكه‌یان له‌گه‌لا بكه‌ن و له‌گه‌لیانا دادپه‌روه‌ر بن، مادام ئه‌وان گێچه‌ل و شه‌ڕتان پێ نافرۆشن له‌سه‌ر ئاینه‌كه‌تان و ده‌رتان ناكه‌ن له‌سه‌ر جێگه‌و رێگه‌ى خۆتانا ،به‌لكو له‌گه‌لیانا چاك بن و دادپه‌روه‌ر بن بزانن به‌راستى خواى گه‌وره و دادپه‌روه‌رانى خۆش ده‌وێ ..

هه‌روه‌ها خواى په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رمووێ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ سوره‌تى الاحزاب ٧٠ واته : ئه‌ى خاوه‌ن باوه‌ران ئه‌ى كه‌سانى خۆتان به‌ئیماندار ده‌زانن، گوێڕایه‌لى فه‌رمانه‌كانى خواو پێغه‌مبه‌ر بن ،له‌قسه‌و ووتارا راست بێژوو شیرین ووتاربن ..

گه‌لێ ئایه‌ت و فه‌رمووده‌ى پێغه‌مبه‌رى خۆشه‌ویست هه‌ن، داوا له‌ئاده‌میزادى ئیماندار ده‌كه‌ن، له‌كارو كرده‌وه حه‌كیم و دانا بن و رووخۆش و نه‌رم و نیان بن ،سه‌ردانى خزم و كه‌س و كارو دراوسێ و دۆست و براده‌ر بكه‌ن و بێ فیزو هه‌وا بن، ئامۆژگارى و خه‌لك و مه‌ردووم ده‌كه‌ن له‌پیسى و پۆخلى و خراپه خۆتان لابده‌ن و سه‌ردانى لێ قه‌وماوان و نه‌خۆشان بكه‌ن و دلنه‌وایى دلشكاوان بكه‌ن و له‌گه‌ل مردوو دا رووه‌و گۆڕستان به‌رێ كه‌ون، رێزو ئیحترامى گه‌وره‌و زانایان بگرن و له‌هه‌لس و كه‌وت و كارو بارا به‌مه‌رحه‌مه‌ت بن، تا بۆتان ده‌كرێ ئیش و كار بۆ خه‌لك ساكارو ئاسان بكه‌ن كارو بارى خه‌لك و مه‌ردووم رێك بخه‌ن، به‌ده‌م هه‌ژاران و داماوان برۆن دوعاى خێر

بۆخۆتان و کەس و کارتان و موسلمانان بکەن، نیـەت و دلتـان چـاك بکـەن و دەست و دامێنتان پاك راگرن و و رق و قینە تورەیتان بخۆنـەوەو رووخـۆش بـن سۆزو رەحم و بەزەیتان هەبێ بەرامبەر یـەکترو بـەدیهێنراوانی خـودا، لەگـەل هاوسەری ژیانتانا چاك بن و ئەمانەت بپارێزن، خاوەن عەهدو بەلێن بن، راست گۆو بەوەفابن، خۆتان دوور خەنەوە لە لەغوەو شتی بێ سوودو قیزەون، تابۆتان دەکرێ کەسایەتی و کەرامەت و عیززەتی خۆتان بپارێزن.

هەروەها موسلمان پێویستە رێك و پێك بێ، گـورج و گـۆل بـێ و ئـازاو چاپوك بێ، لەجل و بەرگ لەبەرکردنا، لەکارو کـردەوەو جولانـا لەهەلـستان و دانیشتنا لەرۆیشتن و هاتووچووندا، مایەی رێزو هۆشیاری بێ، هـەروەها خـۆی دوور بگرێ لەشرو شەپرێووی و تەمبەلی و تەوەزەلی و بێ کاری، سـەرو قـژی پاك رابگرێ ئەگەر نایتاشێ و دەیهێلێتەوە شـانەی بکـا، سـوننەتە فیترپـەکان جێ بەجێ بکـات، کەبـەر سمێـل کردنـەو هەلکەنـدنی مـووی بـن هـەنگرو و باڵەکانی هەروەها پاك و خاوێن کردنی دامەنـە..هتـد. وە ریـش و ردێنێکـی جـوان و رێـك و پێـك وجـوان بهێلتـەوە، خـۆی لەشـوێنی نابـەجێ و تـاوان دووربگرێ، خـواردن و خواردنـەوە زۆر نـەخوا، بـەلکو تـابۆی دەکـرێ گـەدەو مەعیدەکەی بکات بەسێ بەش بەشێکی خواردن و بەشێکی ئاوو بەشەکەی تـر بۆ هەوا بێ، تا بـۆی دەکـرێ کـاتی بـەفیرۆ نەچـووێنێ خـۆی رابێنـێ لەسـەر خوێندنەوەو سەردانی زانایان و داواکردنی زانیاری ،گوێ گرتن لێ یانەوە.

هەروەها موسلمان پێویـستە دەم و زاری خـۆی پـاك رابگـرێ و زوو زوو بیشواو سیواك بەکاربێنێ و خۆی لەخواردنی حـەرام و بەشـوبهە دوور بگـرێ، هەروەها خۆی لەرەزیلی و ئیسراف بپارێزێ، مانگانە لای کـەم سـێ رۆژان بـە

ڕۆژو بێ یا هەفتەی دوو ڕۆژ بەڕۆژوو بێ کەدوو شەممەو پێنج شەممە تیایاندا سوننەتە..

ڕۆژانە نوێژەکانی لەکاتی خۆیا بکات و نوێژە سوننەتەکانیش ئەنجام بدات، تا بۆی دەکرێ شەو نوێژ لەنیوەی شەو بەولاوە یا لە (١ لەسەر ٣ی) شەو بەولاوە فەرامۆش نەکات، وەسوننەت و ویردەکانی بەکاتەکانەوە بەندە بەکاریان بهێنی، هەمیشە زمانی تەڕو پاراو بێ بەزیکرو یادی خوای گەورە، هەروەها تابۆی دەکرێ نوێژەکان بەجەماعەت بکات و هاوەڵێتی پیاوی چاك و خواناس بکات وەبەدوای هەواو ئارەزووەکانی نەکەوێ لەبێ شەرعیدا، دوعاو نزا فەرامۆش نەکات، هەردەم و هەرکات لەهەموو کارەکاندا ناوی خوای بێنێ و پەنا بەخوای بگرێ لەشەیتان و سەربازەکانی، هەردەم پشت بەستن و تەوەککولی لەسەر خوابێ هتد.

بەڕێزان ئەوانەی کەباسمان کرد، گشتی خوڕەوشت و کاری پێغەمبەرمان ﷺ بووە، کەپێویست و واجبە ئێمەش چاوی لێ بکەین و بیکەینە پێشەوا پێشڕەوی خۆمان، وەك خوای گەورە دەرفەرموێ ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾﴾ (سورەتی الاحزاب ٢١) واتە: بەڕاستی و بێ گومان بۆ ئێوە هەیە، لەپێغەمبەری خواوە ﷺ قودوەو پێشڕەوێکی چاك و باش بۆ کەسانی تکاو ئومێدیان خودای گەورەو ڕۆژی دوایی بێ و زۆر یادی خوای گەورە بکاتەوە.

( سەعدی کوڕی هیشام )دەڵێ چوومە لای عائیشەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ لەخوورەوشتی پێغەمبەرم پرسی، وەلامی دامەوە فەرمووی قورئانت خوێندووە ؟ووتم بەڵێ خوێندومە، ووتی ڕەوشتی بریتی بووە لەقورئانی

پیرۆز،ئیمامی موسلم ڕیوایەتی كردووە .

جارێكی تر خاتوو عائیشە (ڕەزای خـوای لیٚ بـیٚ )لـەوەلاٚمی ڕەوشـت و ئەخلاقی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت:ئەگەر هەموو ڕەوشـتە جوانـەكان كۆببێتـەوە وەلاشەیەكی نادەمیزادی لیٚ پەیدا ببیٚ ئەوا پێغەمبەری خودا دەبێت ﷺ .

پێغەمبەر ﷺ دەی فەموو پەروەردگارم پـەروەردەی كـردوم بەچـاكترین شێوە پەروەردەی كردوم، وەئەی فەمـوو (بۆ ئـەوە نێـردراوم كەڕەوشـتی بـەرزو جوان تەواو بكەم)خوای گەورە ڕق و كینی لەخورەوشـتی ناشـرین و ناپەسـندە وەڕەوشتی جوان و پاكی پیٚ خۆشە.

ئەنەس (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ )دەڵیٚ (هیچ كردەوەو ڕەوشـت و شـێوەیەكی پەسندو جوان نیە كە پێغەمبەری خوای گەورە ﷺ بانگی بۆ نەكردبیٚ و هانی خەڵكی بۆ نەدابێت و هیچ شتێكی خراپ و نەنگ و ناشـیرین نیـە كەخـەڵك و مەردوومی لیٚ دوورنەخستبێتەوەو قەدەغەی نەكردبیٚ ).

بەڵیٚ ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ پێـشەواو قـودوەی موسـڵمانانە ڕەحمەت و بەندەی خوای میهرەبانە، فەرموویەتی:بەهەشت بـۆ ئـەو كەسـەیە كەبەدوای ڕێگەو شوێنی من دەكەویٚ با عەبدێكی حەبەشیش بیٚ جەهەنـدەم و دۆزەخ بۆ ئەو كەسەیە پشت لیمان دەكات با شەریفێكی قورەیشیش بیٚ .

وەلەكۆتاییدا دەڵـێین (اللـهم احـسنت خلقنـا، فاحـسن خلقنـا واغفـر لنـا وارحمنا وانت خیر الراحمین)

# حەرام

ئەوەی شایانی باس بێ، ئادەمیزاد لەدووبەشی سەرەكی پێك هاتووە، لایەنێكیان بریتیە لەبەشە ماددیەكەی، كەپێك هاتووە لەچەندین كۆئەندامی جۆراو جۆری هاوپەیوەندو هاوپەیوەست بەیەكەوە، بەشێوەیەكی ئاوا ڕێك و پێك لاشەیەكی تەواوی پێك هێناوە. لایەنەكەی تریش بریتیە لەلایەنە ڕوحی و مەعنەویەكەی كەپێك هاتووە لەڕوح و گیان و نەفس و هەست و شعورو عەقل و ژیری و ویژدان سۆزو عاتیفە وهتد.ئەم دولایەنەی ئادەمیزاد هاوپەیوەندن بەیەكەوە بەهەردوو لایەنیانەوە، ئادەمیزادێكی تەواویان پێك هێناوە ، هەركەسێ بۆ قولایی ئەم دوولایەنەی ئادەمیزاد بڕوانێ دەزانێ هەرلایەنەی، پێویست بەپێداویستیەكانی خۆی دەكات، وەئەگەر كەم و كوڕی و ناتەواوی ڕووی كردە پێداویستیەكانی هەرلایەنێ ئەوا ئەو لایەنە بەپێی پلەی كەم و كوڕی ڕوولەناتەواوی نەخۆشی و سستی دەكات، بۆ نمونە ئەگەر ئادەمیزاد ژەمە خۆراكە ماددیەكانی تەواو نەبوون و یا پیس و نابەجێ بوون و یا بەدو نارێك بوو، ئەوا لاشەكەشی ڕوو لەناتەواوی دەكات بەپێی كەم و كوڕی خراپی خواردنەكەی.

هەروەها لایەنە ڕوحی و مەعنەویەكەی ئادەمیزادیش پێویستی بەخۆراك و تەغزیەی مەعنەوی و ڕوحی خۆی هەیە، جا ئەگەر كەم و كوڕی و ناتەواوی كەوتە خۆراكی ئەم روح و گیانە، ئەوا كەم و كوڕی و ناتەواویش دەكەوێتە لایەنە مەعنەوی و ڕوحانیەتەكەی بەپێی پلەی كەم و كوڕیەكەی، خۆراك و تەغزیە مەعنەویەكەی.

جا ئەوەی ئێمە مەبەستمان بێ باسی بکەین کارو بۆچوون و خۆراکی حەرامە کەمایەی چەندین گیروگرفت و ناتەواوێتی و نەخۆشییە جۆراو جۆری هەردوولایەنی (ماددی و مەعنەوی)یە لەئادەمیزاددا، هەرچەندی ئەم باسە زۆر دوورودرێژو قوڵە کەسێ ناتوانێ بەتەواوی حەقی باسەکە بدات بەڵام هەرچۆنێ بێ ڕوون کردنەوەی هەندێ لایەن و باسی باشترە لەوەی کەهەر باسی لێ نەکرێ.

بەڵێ ئەم حەرامە نەهەر کاریگەری سەلبی و خراپی هەیە بەسەر بەدەنەوە بەڵکو کارگەریشی گەلێ زۆرە بەسەر ڕوح و گیان و نەفسەوە، بێ هودە نیە کەخوای گەورە داوامان لێ دەکات پشت لەحەرام بکەین و ڕووەو ڕزق و ڕۆزی حەلاڵ و پاك بین وەلەم ئایەتانەدا ڕوون و ئاشکرایە. یَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُوا۟ مِمَّا فِى ٱلْأَرْضِ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾ إِنَّمَا يَأْمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلْفَحْشَآءِ وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٦٩﴾ (البقرە ١٦٨-١٦٩)لەم ئایەتەدا خوای گەورە بانگەوازی خەڵك و مەردوومان دەکات کەپەیڕەوی لەبەرنامەی خوای پەروەردگار بکەن وەهەرچی خواردەمەنی و خۆراکی حەلاڵە کەمایەی ڕوح پاکیە وەهەرچی خواردەمەنی پاك و پوختەیە کەمایەی ساغی لاشەو بەدەنە بەدەستی بێنن و بیخۆن، هەر لەروح و گیانی ئایەتەکەیا خوای گەورە نیعمەتانی خۆیان بەبیردێنێتەوە و ئەو هەموو هۆکارانەی کەمایەی پەیداکردنی ڕزق و رۆزین خۆیان ڕۆزیێ ترن لەبازنەی نیعمەتەکانی زۆری بێ ژمارەی خوای پەروەردگارن هەرلەگەڵیا خوای میهرەبان داوا لەخەڵك و مەردووم دەکات کەبەدوای ڕێچکەو ڕیبازو

خەتەواتەکانی شەیتان نەکەوین و پێی هەڵنەخەڵەتێین ئەم شەیتانە نەفرەت لێکراوە دوژمنێکی سەخت و ئاشکرای ئادەمیزادەکانە بەتێکرا ،هەواڵ و بڕیارو فەرمانەکای بۆ ئێوە تەنها بریتیە بەخەراپەکاری و تاوانکاری و فاحیشە و درۆو حەرام خواردن و بێ دینی و بێ بەرنامەیی و گومان و زەنی خراپ و قسەووتار بەستن بەزمان خواوە بەبێ ئەوەی بیزانن.

هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرمووێ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ٨٧ وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ٨٨﴾

(المائدە ٨٧-٨٨) لەم ئایەتانەشدا خوای گەورە ڕوو لەم کەسانە دەکات کەئیمانیان هێناوە بڕایاریان بۆ دەردەکاو تەرازووی ڕاستی و دادپەروەریان لەگەڵ ڕەحم و بەزەییا پێش کەش دەکا، تێیان دەگەیەنێ کەئاگاداری بەرنامەی خوای خۆیان بن و حەلاڵ و حەرام بناسن وتێکەڵ و پێکەڵی نەکەن و، وەشتێ خوای گەورە بەحەلاڵی داناوە ئێوەش بەحەلاڵی دابنێن و بەحەلاڵی تێبگەن،هەروەها شتێ کەبەحەرامی داناوە بەحەرامی تێبگەن و بەحەرامی دابنێن چونکە خوای گەورە خۆی بەهەموو شتێ زانایەو ماهیەتی هەموو کارو هەڵوێست و ماددییات و مەعنەویان دەزانێ لێیانەوە شارەزایە، وەئەگەر ئێوە ئەو سنورەو یاسایەی خوای ببەزێنن ئەوا تووشی کاری نارەواو دەست درێژی دێن، وەناش بێ زیادەڕەوی و دەست درێژی بکەن چونکەبەڕاستی خوای گەورە دەست درێژ کەرانی حەرام خۆری خۆش ناوێ، چونکە ئەمرو فەرمانی خوای گەورە ئاوایە ،ڕزق و ڕۆزی حەلاڵ و پاکبخۆن کەمایەی پاکی و ساغی ڕوح و

لاشەتانە،خوای پەروەردگار ڕێگەی پاك و بەرنامــەی پــاك و خــواردنی بــاش و خاوێنی پیّ بەخشیون ئێوەش گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بکەن و لێــی بترســێن و سنور مەبەزێنن، سنورو بەرنامەی ئەو خوایەی کەئێوەی خەڵق کـردووە دەتــان ژیێنیّ و دەتان مرێنیّ و بەڕێوەتان دەبات، وەهــەموو کــەون و بوونــەوەری بــۆ ئێوە مایەسەرو موسەخخەر کردووە وەئێوە ئیمانتان پێیوە هەیەو خاوەن باوەڕن پێیەوە .

هەروەها خــوای گــەورە دەفــەرمووێ فَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلاً طَيِّبًا وَٱشْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١١٤﴾ (النحل ١١٤) خوای گــەورە ئەمرو فەرمانتان پیّ دەکات لەو ڕزق و ڕۆزیە حەلاڵ و پاکــەی بخــۆن کــە پێــی بەخشیوون شوکرانەو حەمدی خوای گەورەی لەسەر بکەن، هەروەها ســوپاس و ستایشی بکــە لەســەر نیعمەتــەکانی زۆری بــیّ ژمــار، نەکــەن پــشت بکەنــە بەرنامەو یاسای خودا ئەگەر ئێوە خۆتان بەعەبدو بەندەی ئــەو دەزانــن، واتــیّ دەگەن کەتــەنها هــەر ئــەو دەپەرســتن، هــەروەها لەفــەرموودەدا هــاتووە کــە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرمووێ (ان الحلال بين وان الحرام بين وبينهمـا امور مشتبهات لايعلمهن كثير مـن النـاس فمـن اتقـى الـشبهات فقـد اسـتبرا لدينه وعرضه ومن وقع في الشبهات وقع فى الحرام كالراعى يرعى حـول الحمـى يوشك ان يرتع فيـه الا وان لكـل ملـك حمـا الا وان حمـى الله محارمـه الا وان في الجسد مضغة اذاصلحت صلح الجسد كله واذا فسدت فسد الجسد كلـه الا وهـى القلب) رواه البخاری ومسلم بیّ گومان حەلاڵ دیارە جێگــەی ڕەزامەنــدی دڵ و خەڵك و مــەردوومان و خوایــە وەحــەڕامیش دیــارە جێگــەی ناڕەحــەتی دڵ و دەروونە و ناڕەزایی خەڵك و خوایە و لەبەینی حــەڕام و حەلاڵــە، هەنــدیّ بــەر

شوبهه‌ن تێكه‌ڵاون له‌باری ئاڵۆزو، له‌حه‌ڵاڵ و حه‌راما (زۆربه‌ی خه‌ڵكان نـایزانن )جا ئه‌وه‌ی خۆی بپارێزێ له‌شوبهات ئه‌وه ئایین و حورمـه‌تی خـۆی پاراسـتووه له‌گه‌ڵ ناموس و ڕێـزی خـۆی، بـه‌ڵام ئـه‌وه‌ی بكه‌وێتـه نـاو كـارو فـه‌رمانانی به‌رشوبهات ئـه‌و كه‌وتۆتـه نـاو حـه‌ڕام و بـێ دینـی، وه‌ك شـوانێ مـه‌ڕه‌كانی بله‌وه‌ڕێنێ له‌سنورو قه‌راغ باغ و باغـاتێ كه‌هی خۆی نه‌بێ نزیك بێ له‌وه‌ی هه‌ر سنور ببه‌زێنێ، ده‌به‌زێنێ بێدار بنـه‌وه لـه‌وه‌ی كه‌هـه‌موو مـه‌لیك و پادشـایێ سـنورو تخـوبێكی هه‌یـه تێپه‌ڕانـدن و به‌زانـدنی جێگـه‌ی ناڕه‌زامه‌ندیه‌تییـه ئاوه‌هاش خوای په‌روه‌ردگار سنورو مه‌وداییێكی له‌ئه‌مرو فه‌رمانه‌كانیـدا هه‌یـه كه‌بازنه‌ی ڕه‌زامه‌ندی خۆی ده‌گرێته‌وه، ده‌رچوون له‌مـه سـنوره كه‌وتنـه بـه‌ناو حه‌ڕام و گوناهه، بێداربنـه‌وه لـه‌وه‌ی له‌لاشـه‌و بـه‌ده‌ن پارچـه گۆشـتێ هه‌یـه، جانه‌گه‌ر چاك وصالح بـوو، ئـه‌وا هـه‌موو لاشـه‌و بـه‌ده‌ن چـاك و صـالح ده‌بـێ وه‌ئه‌گه‌رفاسیدوتێك بچێ، ئه‌وه هه‌موو لاشه‌و به‌ده‌ن فاسیدو تێك ده‌چێ، بـزانن ئه‌و پارچه گۆشته دڵه، له‌م فه‌رمووده‌دا دیارو ڕوونه كه‌حه‌ڕام سه‌ره‌ڕای ئـه‌وه‌ی كه‌زیان و زه‌ره‌ری هه‌یه بۆ لاشه‌و بـه‌ده‌ن، زیـان و زه‌ره‌ریـشی بـۆ دڵ و ده‌روون هه‌یه ، هه‌روه‌ها ئه‌وه‌ش ده‌سه‌لمێنێ ڕوح و لاشـه په‌یوه‌نـدو په‌یوه‌سـتیه‌كی زۆر به‌هێزو تونـدیان هه‌یـه ،ڕووه‌و فـه‌وتان و ڕوخـان و ناتـه‌واوی ده‌چـێ به‌حـه‌ڕام خواردن و به‌زاندنی سنوره‌كانی خوای په‌روه‌ردگار پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رموێ ( ان الله طیب لا یقبل الا طیبا وان الله امر المؤمنین بما امـر بـه المرسلین، فقـال تعالی یا ایها الذین امنوا كلوا من الطیبات واعلموا صـالحا) وقـال تعـالی یـا ایها الذین كل من طیبات ما رزقناكم ) ثـم ذكـر الرجـل یطیـل الـسفر اشعث اغبر یمد یدیه الی السماء یا رب یا رب ومطعمه حرام ومـشربه حرام وملبـسه

حرام وغذي بالحرام فانى يستجاب له )رواه المسلم واته : خوای گه‌وره پاك و بیٚ گه‌رده كارو كرده‌وه‌ی پاك و بیٚ گه‌ردیش نه‌بیٚ وه‌رناگریٚ و ئه‌مرو فه‌رمانیٚ به‌ئیمانداران ده‌كات به‌و ئه‌مرو فه‌رمانانه‌ی كه‌به پێغه‌مبه‌رانی كردووه‌.

ده‌فه‌رموویٚ ئه‌ی ئیمانداران خوارده‌مه‌نی پاك و بیٚ گه‌رد بخۆن، كاری پاك و كاری باش ئه‌نجام بده‌ن (واته كارباشی و چاكه‌كاری به‌كه‌سانیٚ ده‌كریٚ له‌ڕزق و ڕۆزی پاكو بیٚ گه‌رد و حه‌لاڵ ده‌خۆن) هه‌روه‌ها خوای گه‌وره ده‌فه‌رموویٚ ئه‌ی كه‌سانێك كه‌ئیمانتان هێناوه له ڕزق و ڕۆزیه پاكه‌كانی به‌ئێوه‌م داوه بخۆن، مانای ئیمان و پاكێتیه‌كه‌ی له‌شوێنی خۆیا ده‌ترازیٚ ئه‌گه‌ر ڕزق و ڕۆزیانی چاك و خاوێن و حه‌لاڵ نه‌خۆن، پاشان پێغه‌مبه‌ری خودا باسی پیاوێكی كرد، له‌برینی ڕێگه‌یه‌كی دوورودرێژدا له‌پێناو ڕازی كردنی خوادا سه‌رقرژناوی و به‌غوبارو تۆزاوی و جا ده‌سته‌كان به‌ره‌و ئاسمان به‌رز ده‌كاته‌وه به‌دوعاو نزاو لالانه‌وه ده‌لیٚ په‌روه‌ردگارم :له‌كاتێكیشدا جێگای خواردن و خواردنه‌وه‌ی حه‌رامه‌و وه‌جێگه‌ی پۆشاك و جل و به‌رگی حه‌رامه به‌حه‌رام گه‌شه‌و نمای كردووه، جا چۆن خوای گه‌وره دوعاو نزاكانی قبولٚ بكاو وه‌رگریٚ ،نه‌خێر وه‌رناگریٚ به‌وه‌لاٚمی نایێته‌وه .

له‌به‌ر ئه‌وه‌ی خۆی پیس و پۆخل و بیٚ ڕێزو مه‌هتوك كردوه به‌حه‌ڕام.

عن ابی عبدالله جابر بن عبدالله الأنصاری رضی الله عنهما(ان رجلا سأل رسول الله فقال:ارایت اذا صليت المكتوبات وصمت رمضان واحللت الحلال وحرمت الحرام ولم ازد على ذلك شيئا اادخل الجنة ؟ قال نعم ) رواه مسلم، واته: له ئه‌بو عه‌بدوللاوه جابری كوڕی عبدالله ی ئه‌نصاری، ره‌زای خوایان لیٚ بیٚ پیاویٚ له‌پێغه‌مبه‌ری ﷺ پرسی ووتی ئایا ئه‌گه‌ر واجبه‌كان بكه‌م و

وه‌ڕه‌مه‌زان به‌ڕۆژوو بم و وه‌حه‌لاڵ به‌حه‌لاڵ دابنێم و وه‌حه‌ڕام به‌حه‌ڕام دابنێم و پشتی تێ بكه‌م و تخونی نه‌كه‌وم و زیاد له‌مه‌ش شتی تر نه‌كه‌م ئایا ده‌چمه به‌هه‌شته‌وه ؟ پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی به‌ڵێ له‌م فه‌رموده‌یه‌ش ڕوون و ئاشكرایه كه‌به‌هه‌شت جێگه‌ی كه‌سانێكه كه‌حه‌لاڵ و حه‌ڕام بناسێ لێكیان جیابكاته‌وه، به‌پێی ئه‌مرو فه‌رمانی خودای په‌روه‌ردگار.

ئێمه وه‌كو موسڵمان پێویسته له‌ڕاستی ئاگادار بین و بزانین كه‌ته‌نها خوای گه‌وره شایسته‌ی دیاركردنی حه‌لاڵ و حه‌ڕامه ئه‌مه حه‌قێكی په‌روه‌ردگاره وكه‌سێك بۆی نیه ده‌ست كاری یا گۆڕانكاری بخاته بڕیاره‌كانی، حه‌لاڵێ حه‌ڕام بكات یا حه‌ڕامێ حه‌لاڵ بكات، ئه‌وه‌ی كاری وابكات ئه‌وا ده‌ست درێژی كردووه به‌سه‌ر مافێكی خوادا ،له‌دانانی به‌رنامه بۆ به‌دیهێنراوه‌كانی و ئه‌وه‌ی پێی ڕازی بێ و به‌دوای بكه‌وێ وه‌ك ئه‌وه وایه كه‌ئه‌وكه‌سه‌ی كردبێته هاوبه‌ش و شه‌ریك بۆ خوای گه‌وره له‌ڕووی حوكم و فه‌رمانه‌وه ،خوای گه‌وره به‌رپه‌رچی جوله‌كه‌و گاوره‌كان ده‌داته‌وه له‌وه‌ی به‌كه‌یف و خواستی خۆیان ده‌ست كاری حه‌لاڵ و حه‌ڕامیان كردووه، گۆڕانكاریان تێ خستووه وه‌ك خوای گه‌وره ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ (التوبه ٣١)، جوله‌كه‌و گاوره‌كان بێجگه له‌خودای گه‌وره قه‌شه‌و ماڵه‌كانی خۆیان كردۆته په‌روه‌ردگارو خوای خۆیان، كه‌چی فه‌رمانیان پێ نه‌كراوه ته‌نها به‌په‌رستنی یه‌ك په‌رستراو ئه‌ویش تاكه په‌رستراوه وه‌ك به‌غه‌یری خوا هیچ په‌رستراوێ نیه پاكی و بێ گه‌ردێ بۆ زاتی خودایه له‌و هاوبه‌شه‌ی بۆ بڕیار ده‌ده‌ن .

عودەی کوڕی حاتەم هاتە لای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی موسڵمان بێ پێشتر چووبوە سەر ئاینی مەسیحی و گاوران جا لەوکاتەی ئەو ئایەتەی لەپێغەمبەری خودای ﷺ گوێ لێ بوو، وتی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ جولەکەو گاورەکان قەشەو مالمەکانی خۆیان نەدەپەرست! پێغەمبەر ﷺفەرمووێ بەڵێ دەیان پەرستن لەبەر ئەوەی حەلاڵیان لێ حەرام کردن و حەرامیان لێ حەلاڵ کردون ئەوانیش گوێڕایەڵیان کردوون و بەدوایان کەوتون ئەوەیە بەندایەتیەکەیان بۆیان، هەروەها خوای گەورە سەرکۆنەی موشریکان دەکات وەصفیان دەکات حەڕام و حەلاڵ یان داناوە لەخۆیانەوە بێ ئەوەی لەخواوە ئیزن و مۆڵەتیان وەرگتبێت، وەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێ ﴿أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾﴾ (سورەتی یونس ٥٩) واتە: ئەی موشریکانی خوانەناسی لەخوا بێ ئاگا لەورزق و ڕۆزیەی کەخوای گەورە بۆی دابەزاندوون ئێوە بەئارەزووی خۆتان گێڕاوتانن بەحەلاڵ و حەڕام، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ پێیان بفەرموو ئایا خوای پەروەردگار ئیزن و مۆڵەتی داون، یا درۆو ئیفترا دەدەنە پاڵ خودا ،دیارە خوای گەورە یاسای بۆ ڕەوان کردوون و ئەوانیش پشتیان تێ کردووەو کەوتونەتە دوای هەواو ئارەزووی خۆیان بەخواست و کەیفی خۆیان بڕیاری حەلاڵ و حەرامیان داوە، هەروەها لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ

ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ (النحل ١١٦) هەر قسەکردنی زمانی خۆتـان بـەبێ دەلیل و و بەڵگە مەڵێن ئەم شتە حەلاڵەو ئەو شتە حەرامە، نیسبەتیشی بدەن بۆ لای خـودا نـەبادا ببـێ بـەدرۆ هەڵبەسـتن لەسـەر خـودای پـەروەردگارەوە بەنەزانین، چونکە ئەو کەسانەی کەدرۆ هەڵدەبەستن بەدەمی خواوە، ڕزگار نـابن لەسزای خودای ئازیزو شکۆمەند لـەڕۆژی قیامەتـدا وەلەدونیاشـدا بەختـەوەر نابن.

لەم ئایـەت و فەرموودانـە ڕوون و ئاشـکرایە هـەموو زانـاو فەقیهـەکان بەیەقینی دەزانن و لەسەر ئەو ڕەئیەن کەخوای پەروەردگار تەنها حەقی ئـەوەی هەیە یاساو بەرنامە داڕێژی بکات و سنورەکانی حەلاڵ و حـەرام دیـار بکـات لەڕێگەی کیتاب و پێغەمبەرەکەی وەك لەسورەتی الانعام دا لەئایـەتی ١١٩دا دەفـــەرمووێ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَآئِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١١٩﴾ (سورەتی الانعـام ١١٩)واتـە بەراسـتی بـۆ ئێوەمان ڕوون کردەوە لەوەی کەبەسەر ئێوەمان حەرام کردووە بەتەواوی.

هەروەها دەبێ ئەو ڕاستیەش بـزانین کـەئایینی پـیرۆزی ئیـسلام هـەموو لایەن و بوارەکانی ژیانی داگرتوەو دادەگرێ، وەلەهەر بوارێ سـنوری حـەلاڵ و حەرامی دیار کردووە هیچ لایەن و کەلێنێکی بەخاڵی و بەبەتاڵی نەهێشتۆتەوە ئیللا سنورە حەلاڵی و حەرامیەکەی تێدا ڕوون کردۆتەوە، جا لەڕووی خواردن و خواردنەوە بێ یا لەڕووی کەسـابەت و کـارو ئیـشەوە بـێ یـا لـەڕووی مـاڵ و خێزانداری بەینی ژن و پیاوەوە بێ، وەیا لەڕووی جل و بەرگ و پۆشاکەوە بـێ،

وه‌یا له‌ڕووی غه‌ریزه‌كانی سروشتی ئاده‌میزاده‌وه بێ وه‌یا له‌ڕووی دایك و باوك و ڕۆڵه‌و ئه‌و لاده‌وه بێ، یا له‌ڕووی بیرو باوه‌ڕ و عیباده‌ت و په‌رستش و خوره‌وشت و ئه‌خلاقه‌وه بێ، وه‌یا له‌ڕووی كۆمه‌لایه‌تی ئابووری و ته‌ندروستیه‌وه بێ، وه‌یا له‌ڕووی ڕامیاری و په‌یوه‌ندی موسڵمانان و موسڵمان و غه‌یری موسڵمانه‌وه بێ... هتد به‌كورتی سنووره‌كانی حه‌لاڵ و حه‌رام هه‌موو لایه‌نه‌كانی ماددی و مه‌عنه‌وی دیارونادیاره‌كانی گرتۆته‌وه له‌گۆڕه‌پانی ژیاندا.

ده‌ردو به‌لاكانی ڕووكردنه حه‌رام ناژمێردرێن یه‌ك جار زۆرن هه‌ر حه‌ڕامه ئاده‌میزاد له‌سروشتی خۆی ده‌ترازێنێ و نه‌فس و گیانی لێ پیس و نه‌خۆش و ده‌كاو بێ ڕێزی و حورمه‌تی ده‌كات، له‌لای خوای په‌روه‌ردگارو فریشته‌كان و خه‌ڵك و مه‌ردوومانه‌وه .

- هه‌ر حه‌رامه ریشه‌ی كۆمه‌لایه‌تی پچر پچر ده‌كات و ته‌بایی و خۆشه‌ویستی له‌نێوانیان هه‌ڵده‌گرێ، رق و قین و ناته‌بایی داده‌چێنێ و گه‌شه‌ی پێ ده‌دات

-هه‌ر حه‌رامه چه‌وساوه‌و مه‌زولم ده‌تلێته‌وه هه‌ژاری و داماوی ده‌بارێنێته سه‌ریان و ڕۆژی ڕووناكیان لێ تاریك ده‌كات .

-هه‌ر حه‌رامه سروشتی شیرازه‌ی خێزان ده‌شێوێنێ كاریگه‌ری خراپ و به‌د بۆ ڕۆله پاكه‌كانی داهاتوو به‌جێ دێلێ و سروشتی پاكیان خلتاوی و تۆزاوی ده‌كات .

هه‌ر به‌رهه‌می حه‌رامه سه‌رتاپای خه‌ڵك و مه‌ردوومان سه‌ریان لێ ده‌شێوێنێ و موسته‌حه‌قی قارو غه‌زه‌بی خوای په‌روه‌ردگاریان ده‌كا .

-هه‌ر حه‌رامه وێلی و گومراوی سه‌ر لێشێواوی و بێ به‌رنامه‌یی و ڕێگا

بزركردن له‌ده‌ست دانی به‌ختیاری و ئاسووده‌یی یه .

-هه‌ر حه‌رامه پیس و پۆخله و كار پیس ده‌كا سروشت تێك ده‌ره‌و زاهیری و باتیلی ئاده‌میزاد ده‌خاته مه‌ترسیه‌وه .

-هه‌ر حه‌رامه به‌ره‌كه‌ت ناهێلێ له‌رزق و رۆزی له‌عه‌قل و ژیری و له‌زانست و زانیاری له‌عومرو ته‌مه‌ن له‌دیه‌ن و جوانی له‌دۆستایه‌تی و كارو پیشه‌دا .

له‌ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا هیچ شتێ بێ هوده حه‌رام نه‌كراوه، به‌لكو گشتی حیكمه‌تی تیایه ئه‌وسا بكه‌وێته ژێر بازنه‌ی ژیری و زانیاریمانه‌وه یاخود له‌ده‌ره‌وه تربێ، هه‌ر شتێ ئایینی پیرۆزی ئیسلام حه‌رامی كردبێ له‌به‌ر قازانج و به‌رژه‌وه‌ندی خه‌لك و مه‌ردوومه‌و نه‌ك بۆ ئیهانه‌و ژیان لێ تال كردنی .چونكه ئه‌و كارو كرده‌وه و خواردن و خواردنه‌وه‌ی حه‌رام كراوه، گشتی له‌به‌ر ئه‌وه‌یه زه‌ره‌رو زیانی هه‌یه، پیس و پۆخله وه‌ك خوای گه‌وره (عزوجل) له‌وه‌سفی پێغه‌مبه‌ر ﷺ له سوره‌ی الاعراف ئایه‌تی ١٥٧ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ ﴿١٥٧﴾ واته: ئه‌مرو فه‌رمانیان پێ ده‌كات، به‌چاكه كاری و قه‌ده‌غه‌یان ده‌كات له‌كارو كرده‌وه‌ی ناره‌واو ناپه‌سه‌ند، پاكی و بێ گه‌ردی و خاوێنیان بۆ حه‌لال ده‌كات و پیس و قیزه‌ونی و پۆخلیان له‌سه‌ر حه‌رام ده‌كا .. وه خوای گه‌وره پێداویستیه‌كانی ئاده‌میزادی نه‌خستۆته ناو حه‌رامه‌وه وه‌هه‌ر شتێكی لێ حه‌رام كردبێ ئیللا قه‌ره‌بووی كردۆته‌وه به‌حه‌لال و شتی پاك و پوخته‌وه، پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌خوتبه‌ی حه‌جی مالئاوایی دا چه‌ندین ئامۆژگاری جوانی موسلمانانی كرد، یه‌كێ له‌و ئامۆژگاریانه فه‌رمووی (ان اموالكم واعراضكم و دماءكم حرام

علیکم کحرمة یومکم هذا فی شهرکم هذا فی بلدکم هذا) رواه الترمذی
..واته مال و سامان و داراییتان لەگەل عەرزو ناموس و گیان و خوێنتان
لەسەر یەکتر حەرامە وەکو رێزو حورمەتی ئەورۆژەتان مانگەتان و لەو شارەتان
(کەمەککەی موکەرەمەیە ).

ئەگەر سەیرێکی ووردی ژیانی ئەمرۆی جیهان بکەین، دەبینین لەو پەری
سەخلەتی و دووره شارامی و قاتی قری و فەسادی روحی و نارەحەتیدان،
ئەمەش گشتی لەبەر تێکدانی و نەهێشتنی تەرازوو عەدالەتی بێ حەلالی و
حەرامی یە ،دیارە راگرتن و چاکردنەوەی ئەم تەرازووەیە بەعەدالەت و
دادپەروەری، زۆر لەگیرو گرفتەکان ناهێلی و چارەسەریان دەکات .

ئەوانەی دەیانەوێ بەحەرام بگەن بەئەنجامی پاك و و پیرۆز یا سەرکەوتن
و بالا بوون، ئەوە بەهەڵە لێ ی حالی بووینە ،شارەزایی و زانیاریان نی یە
بەماهیەتی حەرام و چۆنیەتی سوونەتی خودای لەم کەون و بونەوەرەدا ..

ئەگەر لەناوەرۆك و ماهیەتی حەرام ووردبینەوە، بۆمان دەدەکەوێ
کەحەرام یانی خیانەت لەگەڵ خوداو درۆو سپلەیی و نەزانین و پیسی و دەردو
بەلاو نەخۆشی ،تێك دان و دواکەوتن و تێ کەوتن و بێ کەس بوون و
موصیبەت و گیرو گرفت، تووش بوون بە نەخۆشیانی نەفسی بێ وەفایی لەگەل
خوداو مەردووم خەجالەتی و روو رەشی و تێك دانی میزان و تەرازوو،
یارمەتی دانی شەیتان و موشریکان بوون بەپێشرەوێکی خراپ ..هتد
لەکۆتایشدا ریسوایی و ئەشکەنجەی عەزاب و ئەشکەنجەی ئاگر .بەراستی
زەرەرو زیانەکانی حەرام مەترسیدارترە لەژەهرو لەهەموو زەرەرو زیانێکی
ماددی، خۆزگە خەلکانی ئەم سەردەمەش لەماهیەتی حەرام تێ دەگەیشتن و

به‌نووری هیدایه‌ت شادمان ده‌بوون و هه‌موو وه‌ك برایان ده‌ستیان له‌ناو ده‌ستی یه‌ك ده‌ناو ته‌رازووی دادپه‌روه‌رێتی میزان و حه‌لال و حه‌رامیان راده‌گرت، به‌س بیر له‌حه‌زره‌تی ئاده‌م بكه‌وه، كه‌یه‌ك بێ ئه‌مری خوای كرد له‌و داره‌ی خوارد كه لێی حه‌رام كرابوو، به‌چی گه‌یشت، چی به‌سه‌ر هات خۆی و نه‌وه‌كانی زه‌ریبه‌دانه‌كه‌ی به‌رده‌وامه‌و كۆتایشی نایێ.

له‌كۆتاییدا له‌خودای گه‌وره ده‌پارێینه‌وه گه‌ل و نیشتمانه‌كه‌مان ئاسووده بكات و برایه‌تی و ته‌بایی بخاته ناو ریزه‌كانمانه‌وه و خۆشی و به‌ختیاری و ئاسایش و هه‌رزانیمان پێ ببه‌خشێ .

امين والحمدلله رب العالمين .

# خۆشه‌ویستی دونیا به‌سه‌ر قیامه‌ت سه‌رچاوه‌ی خووره‌ووشته ناشیرینه‌كان و نه‌خۆشیه ده‌روونیه‌كانه

## به‌شی یه‌كه‌م

پێویسته بزانین بیرو باوه‌رو هه‌لوێست و و جۆری حالی بوون له‌مانای ژیان و دونیا ،ده‌ورێكی سه‌ره‌كی له‌داب و نه‌ریت و ئاكارو ره‌وشتی ئاده‌میزاد هه‌یه ،دیاریشه حه‌ق هه‌ر یه‌ك شته و ئه‌وه‌ی پێی داكه‌وتبێ ئاسووده‌و به‌خته‌وه‌ر بووه ،وه‌ئه‌وه‌ی وێل و لێل بوو بێ، ئه‌وه مایه‌ی به‌دبه‌ختی خۆیه‌تی، له‌گه‌ل كه‌سانێ كه‌له‌گه‌لّ ئاسۆو دونیای ئه‌ون، لێره‌دا ده‌توانین بلێین ئاده‌میزاد له‌م دونیایه ده‌ژیێ كه‌بیرو هۆش و هه‌لوێستی تیایه‌تی، نه‌ك هه‌ر لاشه‌و به‌ده‌نی، جا ئه‌وه‌ی شایانی باس بێ ئه‌و حه‌قه‌ی كه‌حه‌قه به‌دیاری و به‌خشش وره‌حمه‌ت له‌لای خودای حه‌قه‌وه بۆمان هاتووه، تاكه حه‌قێكی بێ وێنه‌یه، نرخ و ماهیه‌تی هه‌موو شتێكی بۆ دیاری كردووین وه‌ك ژیان ،دونیا ،مرۆڤ ،مادده ،دۆست ،دوژمن ،راست ،خوار، ره‌ش، سپی، قیامه‌ت، به‌رزه‌خ.. هتد.

جا ئه‌وه‌ی له‌ماهیه‌ت و نرخی دونیا حالیمان ده‌كات ئه‌وه‌یه، كه‌دونیا هه‌موو شتێ نی یه، به‌لكو قۆناغێكه ئاده‌میزاد پێ ی تێده‌په‌ری مایه‌ی تاقی كردنه‌وه‌ی خودایه، وه‌نرخ و ماهیه‌تێكی دیاری كراووی خۆی هه‌یه، وه دونیایێ تر ئا به‌دواوه‌یه كه‌عاله‌می به‌رزه‌خه‌و ئه‌ویش قۆناغێكه و پاشان دونیایێ تر

بەدواوەیە کەقیامەت و مەحشەرە پاشانیش یا جەهەنەمەو یا بەهەشتە ،هەر هەمووشیان حەقن و نرخ و بەهای خۆیان هەیە و پێ یان دراوە لەلایەنی خودای تاك و تەنها و بێ هاوتا..

جا ئەوەی لەهەلوێست و حالی بوونیدا رێکی نرخ و ماهیەتی ژیان، دونیا، قیامەت ،مادده وەیا هەرشتانێکی تربێ بترازێ ،ئەوە لەسکەی حەق ترازاوە ، بەپێ ی پلەی لادان و ناحالی بوونەکەی، ئانەمە دەورێکی سەرەکی هەیە لەهەموو روو لایەنانی ژیانەوە، لەوانەش ئاکارو ئاداب و نەریتەوە .هەلّویستێکی ناحالّی بوون ئەوەیە کەئادەمیزاد دونیا بەهەموو شتێ تێبگاو بزانێ یا نرخێکی زیاد لەحەقی خۆی پێ بدات، بەمەوە گۆرانکاری دەکەوێتە گشت لایەنەکانی ژیانی و بەرەو ئاسۆی سەلبیاتەوە دەچێ و دەخزێ، ئاکارو ئادابی ئالّۆز دەبێ، دەروونی پێشوازی لەنەخۆشیانی هەمە چەشنە دەکات.

خوای بالاّ دەستی شکۆمەندی زانای دانا لەسورەتی یونسدا دەفەرمووێ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱطْمَأَنُّواْ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنْ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ۝٧ أُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ۝٨﴾ (سورەتی یونس ٧-٨) واتە: بەراستی و بێ گومان ئەوکەسانەی تکاو رەجایان گەیشتن نیە بەلیقای ئێمە، رازین بەژیانی دونیاوە، دلّیان پێوە ئیتمئنان و ئۆقرەی پێوە گرتووە، ئەوانە لەحەقیانەتی نیشانەکان و ئایەتەکانی ئێمە بێ ئاگاو غافلّن، بۆ ئەوانەیە ئازارو عەزابی ئاگری دۆزەخ بەرامبەر ئەو کارو کردەوەیەی کەئەنجام دەدەن، لەم ئایەتانەدا روون و ئاشکرایە ئەگەر ئادەمیزاد لەبەر دلّ و بەرچاو تەسکی و دوور نەبینی بەژیانی دونیا ئۆقرەی

گرت و دڵی ئیتمئنانی بوو ئەوە دیارە لەحەقی ترازاوە و بەینی لەگەڵ خـوادا پچڕاوەو لەئایەت و نیشانەکانی خودا غافڵ و بێ ئاگایە نەفسیەت و گوفتـارو کرداری وان شایستەبێ بەعەزابی ئاگری جەهەنندەم .

دیارە خودای پاك و بەخشندەو میهرەبانیش بەلاش و بـێ هـوودە کـەس ناخاتە ئاگرەوە، بەلاّم زاتی خۆی زیاتر لەهەموو کەسێ شارەزا ترە بەنەفسیەت و ماهیەتی ئادەمیزاد، ڕوونی کردۆتەوە کەئـەوەی پیـاوی دونیـا بـێ و بـەس پیاوی لەحەق بێ ئاگاو حەق نەویست و ستەم کارو زاڵمە و پیـاوی خیانـەت و درۆو تاوانە، بەڵێ هـەر خۆشەویـستێتی دونیایـە هاتۆتـە کایـەوە لەئـەنجامی هەڵوێـستی و نالـەبارو ناحـەق کـەدونیای بەهـەموو شـتێ زانیـوە، نـرخ و بەهرەیەکی گەلێ زیاتری لەحەقی خۆی پێداوە، مایەی زوڵـم و تاوانـە مایـەی خیانەت و درۆو فڕو فێڵە، هەروەها مایەی نەخۆشیە دەروونیەکانە وەك بێزاری بێ ئارامی و ترسنۆکی و حەسوودی و چاوبرسیەتی و کە ئابـەو دڵـە ڕاوکـێ و ڕەزیلی و قرچۆکی و خۆبەزل زانـین و دڵ تـەنگی تـوڕەیی و خۆپەرسـتی و بـێ ویژدانی .....هتد.

هەر لـەم بارەیـەوە خـودای شـکۆمەند و ئـازیز فێرمـان دەکـاو تێمـان دەگەیەنێ ﷻ دەفەرمووێ ﴿ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَـٰدِ ۖ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَـٰمًا ۖ وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ ۚ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿٢٠﴾﴾ (الحديـد ٢٠) واتـە: بـزانن ژیانی دونیا بەڕاستی بریتیـە لـەیاری و گاڵتـەو گـەپ و ڕازاندنـەوەو فـەخرو

شانازی كردن له‌نێوانتان و وه‌زۆر كردنی ماڵ و سامان، و منداڵ وه‌ك ئه‌وه‌ی كه‌بارانی باش بباریَ جوتیار موعجیب بكات به‌شینایه‌كانی له‌وپه‌ڕی پیَ گه‌یشتن و چاكی و باشی دابیَ، پاشانیش ئه‌و شینایییه ورده ورده پوت و ووشك ببێته‌وه پاشانیش زه‌رد هه‌ڵده‌گه‌ڕیَ به‌زه‌ردی ببینی، پاشانیش پان و پوت بێته‌وه هیچی به‌سه‌ر هیچا نه‌مێنیَ ژیانی ئاده‌میزادیش ئاوایه، جاله‌ڕۆژی دوایش ئازارو ئه‌شكه‌نجه‌ی به‌هێزو توند هه‌یه بۆ سته‌م كارو زاڵمان و لێبورده‌و مه‌غفیره‌ت و به‌هه‌شتیش هه‌یه له‌پاڵ ڕازی بوونی خودا بۆ حه‌ق په‌رستان، جا بزانن ژیانی دونیا هیچ نیه، ته‌نها مه‌تاع و ڕابواردنێكی مه‌غروور و له‌خۆبایی بوونه، به‌لیَ ژیان ئه‌وه‌یه له‌منداڵی یاری و جووله جوول و گاڵته‌و گه‌پ و له‌گه‌نجێتی و تازه لاوێتی له‌هوه هیوایات و تۆپ و تۆپێن و مه‌له‌و یاری پاشانیش خۆجوان كردن و ڕازاندنه‌وه‌یه، پاشانیش فه‌خرو شانازی كردنه به‌هۆزو عه‌شیره‌ت و قه‌وم و حه‌سه‌به‌و نه‌سه‌به پاشانیش ڕاكردنه به‌دوای دونیاو هه‌وڵدانه ڕووه‌و زۆركردنی ماڵ و سامان و منداڵ پاشانیش به‌ره‌و پیری و دونیا جێهێشتنه .

وه پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویست ﷺ ده‌فه‌رمووێ (من اصبح والدنيا اكبر همه فليس من الله في شيء والزم الله قلبه اربع خصال)

١- هما لا ينقطع عنه ابدا.

٢- وشغلا لا يتفرغ منه ابدا.

٣- وفقرا لا يبلغ غناه ابدا.

٤- واملا لا يبلغ منتهاه ابدا .... اخرجه الطبراني في الاوسط

واته:ئه‌وه‌ی گه‌وره ئاواتی دونیا بیَ هه‌موو قه‌صدی تێیدایه كۆبێته‌وه

ئەوە بەش و باری هیدایەت و ڕێزو پلەو پایەی لای خودا نیە و بۆنیە، خوای گەورە چوار خەصلەت بەدڵیا دەبەستێتەوە ...

١-غەمێك و پەژارەیەك هەرگیز لێی جیانابێتەوە .

٢-هەست کردنی بەئیش و کارێ هەگیز لێی بەتاڵ نابێ .

٣-هەست کردنی بەهەژارێتی و هەرگیز لێی ڕزگار نابێ .

٤-هەست کردنی بەئاواتێ و هەرگیز پێی ناگا .

ئەم خالانە خەصڵەتانێکی دڵـن بـۆ کەسـانێ کـەدونیا گـەورە ئـاوات و ئومێدیانە ، بەلاّم ئەگەر کەوتە سەر هیدایەتی خودایی، ئەوا ئەم چوار خالـەی لەدڵیا نامینێ و شیفای تەواوی بۆ دێ، ئەگەر لەخوا غافلّ و بێ ئاگا بـووەوە، ڕووی کردەوە دونیا پەرستی واتـە دونیـای کـردە گـەورە ئـاواتی، ئـەوا چـوار خەصلەتەکەی ناوبراو بۆی دەگەڕێتەوە ناو دلّ ،ئازیزان ئیسلام نالێ دونیا هـەر هیچ نیە بەڵکو دەفەمووێ دونیا کێڵگەی دوا ڕۆژە، دیارە ئەوەی هیچ نەچـێنێ هیچیش نادورێتەوە، ئادەمیزادی موسڵمان چۆن داوای لێکراوە کـەبینای دلّ و دەروونـی بکـا، ئـاواش داوای لێکـراوە کـەبینای دونیـای بکـات، بـەرەو شارستانێتی وئاوەدان کردنەوە ئەمەش گشتی بەمانای عیبادەت و بەندایـەتی و کارچاکی و عەمەلی صالح خۆی دەنوێنێ، هەربۆ ئەمـەش لەلایـەنی خـواوە بەدێهێنراوە، هەرئەوەش کارو وەزیفەیەتی ،ئەمەش گـشتی ئەنـدازەو نـسبەی ڕێگەی خۆی هەیە و میزانی خۆی هەیـەو سـنورو ڕادەی خـۆی هەیـە ئەگـەر خۆشەویستێتی دونیا لەڕادەبەدەرو قیامەت بەرچاو نەگرتن هاتە کایەوە، ئـەوە دەبێتـە بنـچینەی هـەموو تـاوان و گوناهـان، وەك لەفـەرموودەدا هـاتووە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەفەرمووێ (حب الدنیا رأس کل خطیئة)

اخرجة ابن ابی الدنیا واتە:خۆشەویستێتی دونیـا زیـاد لـەڕادەو سـنوری خـۆی بناغـەی هـەموو تـاوان و گوناهەكانـە، دیـارە بەپێـچەوانەش وەك بڵـێین خۆشەویستی قیامەت سەرەكی هەموو خێرو چاكەو بەهرەیەكـە هـەر لەشـوێن خۆیەتی، ئێمەی موسڵمان دەبێ ئەو حەقیقەتە بزانین كەدونیا دەست مایەمانە بۆ خوا ڕازی كردن بۆ پیرۆزی بۆ بەرزی و بەهرە بۆ كڕینی بەهەشت جا ئەگـەر بەم دەست مایە بەرزی و پیرۆزی ڕەحمی خوامان پێی بەرهەم نەهێناو حاصـڵ نەكرد ئەوە تووشی ئەو پەڕی دۆڕاوی و خەسـارەتمەندی هـاتووین وەك كـابرای گێل و نەفامان لێ دێ، كەلەبازگانیەكەیدا قازانج سەری مایەی خواردبوو .

جابەكورتی دونیا هەر بۆ ئەوە باشە خوای پێ ڕازی بكـەی، دیـارە خـوا ڕازی كردنیش بەوە دەبێ، كەئادەمیزاد سەربازی دڵـسۆزی ئـایین و بەرنامـەی خوابێ و بۆ سەرخستنی ئایینەكەی. بەهۆشیارانەو عەقل و ژیری سـەردەمیانە تێ بكۆشێ.

## بەشی دووەم

ئەگەر ئادەمیزاد وەك مانای خۆی یا نرخی خۆی، حالّی نـەبوو لـەژیان و دونیا، ئەوە سروشتی لەئاست خۆیا دەترازێ، دەروونی شـپرزەدەبێ و عـەقل و ژیری لەئاسۆو مەیدانی خۆی تێـك دەچـێ و فاسـید دەبـێ، وەك چـۆن ئەگـەر ئادەمیزاد لەژیاندا هەموو پێداویستیەكانی ژیانی بەنرخ و قیمەتی خۆی نەكرێ و وەرنەگرێ و لێی حالّی نەبێ ئەوە ژیانی ئالّۆز دەبێ و بەئادەمیزادێكی ژیـرو هۆشیار ناناسرێ ،دیاریشە هەرخاوەنی شت بەنرخ و قیمـەتی خـۆی دەزانـێ و بەوپەڕی شایستەو گونجاوی، لێرەشدا مەبەستمان ئەوەیە بلّێین بـەلّێ هـەرخوای گەورە بەنرخ و قیمەتی ژیـان و دونیـا ومـاددەو مـردن هتـد دەزانـێ زۆر بەچاكی چونكە خۆی خـەلّقی كـردون و هـەر خۆشـی خاوەنیـەتی وەك نـرخ و قیمەتی هەموو شتێكی دیار كردووە لـەبارەی ژیـانی دونیاشـەوە دەفـەرمووێ

وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقۡتَدِرًا ﴿٤٥﴾

(سورەتی الكهـف ٤٥) واتـە: ئـەی پێغەمبـەری خۆشەویـست و سـالار ﷺ بەغونە بۆیان بێنەوە ژیانی دونیـا وەك ئـاوی بـارن وەهایـە بیبـارێنین بەسـەر زەویدا، جا بەهۆی ئەو بارانەوە گیاو گوڵ سەوز ببێ بەرزەوەبێ جا بەو شێوەیە تێكەڵ و پێكەڵ بێ بۆ ماوەیێ بەجوانی و قەشەنگی بێنێتەوە، جاپاشان زەردو پوت ببێ و ئینجا ووشك ببێ، پاشانیش بشكێتەوە بەسـەریەكاو ئەوسـا تـۆزو بایێ لێی بداو هەلّی گرێ و پەرت و پانی بكاتەوە، ڕاستی خودای بالآدەست و

شكۆمەند بەسەر هەموو شتێكدا توانای هەیەو هـەموو شـتێكی پـیّ دەكـریّ وەبۆهەموو شتیّ نرخ و قیمەت و بەهای داناوە ...

دەگێڕنـەوە جارێكیـان پێغەمبـەری خۆشەویـست ﷺ ڕابـورد بـەلای حـەیوانێكی مردارەوەبـووی گـویّ كورتیلـە، جالەئاسـتیا ڕاوەسـتاو كۆمـەلیّ لەسەحابەكان لەخزمەتیا بوون فەرمووی (ئایا ئەو حەیوانە مردارە بووە دەبینن كەچەند بیّ قیمەتە لەلای خاوەنەكەی وتیان بەلیّ ئەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ مردار بووەو بیّ نرخ و قیمەت بۆتەوە بۆیـە فڕێیـان داوە، جـا فـەرمووی كـیّ بەدرهەمێكی دەویّ و دەكڕیّ؟ ووتیان بۆچی مانە مردارە بووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی قەسەم بەو زاتەی گیانم وابەدەستیەتی، دونیا لەلای خوای گەورە لەو حەیوانە مرداربووە بیّ قیمەت ترە، ئەگەر دونیا قیمـەتی بـالی مێـشولەیەكی لەلای خوای گەورە هەبوایە قومە ئاوێكی نەدەدا بەكافریّ) ئیبن ماجـەو حـاكم دەریان هێناوە بەئیسنادێكی صـحیح، پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی (الـدنیا ملعونـة وملعـون مـا فیهـا الا ماكـان لله منهـا) اخرجـه الترمـذی وحـسنه واتە:دونیا مەلعونەو نەفرەت و نەعلەتی لیّ كراوە، بەوەی تیایەتی ئیللا شـتیّ نەبیّ كەبۆ خوابیّ ، لەڕیوایەتی ئیبن ماجەدا هـاتووە ئـیللا یـادوزیكری خـودا نەفرەت و نەعلەتی لیّ نەكراوە لەگەلّ ئەوەی بەیادو زیكری خـوا بەسـتراوەتەوە ئەویش زانای خواناسە لەگەلّ قوتابیان و فێربووانی و گوێگرانی.

هەروەها مامۆستای پێشەواو ڕابەرمان ﷺ دەفەرمویّ ئەوەی دونیـای خۆش بویّ زەرەرو زیان بەدوا ڕۆژو ئاخیرەتی دەگەیەنیّ، ئەوەی ئـاخیرەت و دوا ڕۆژی خۆش بویّ زەرەرو زیان بەدونیای دەگەیەنیّ جا ئێـوە فـەزلّ و ڕێـز بـدەن بەشتیّ كەدەمێنێتەوە بەسەر شتیّ كەنامێنێتەوە.

هه‌روه‌ها خۆشه‌ویست و ئازیزمانﷺ ده‌فه‌رمووێ (مالدنيا في الاخرة الا كمثل ما يجعل احدكم اصبعه فى اليم فلينظر بم يرجع اليه) اخرجة مسلم واته : وێنه‌ی دونیا له‌چاو دوارۆژ وه‌ك ئه‌وه وایه كه‌یه‌كێ له‌ئێوه په‌نجه‌یه‌كی خۆی بخاته ناو ده‌ریاو ده‌ری بهێنێ جا ته‌ڕاییه‌كه‌ی په‌نجه‌ی ژیانی دونیا بێ، كه‌به‌كاتێكی زۆر كه‌م ووشك ده‌بێته‌وه‌و نامێنێ وه‌ئاوی ده‌ریاكه‌ش له‌وێنه‌ی ژیانی قیامه‌ت بێ هه‌رگیز كۆتایی نایێ و نابڕێته‌وه، چونكه ئاو به‌قۆناغانی شلی و ڕه‌قی و گازییدا ده‌ڕواو ڕێژه‌كه‌ی دامه‌زراوه هه‌رگیز كه‌م نابێته‌وه له‌سه‌ر ئه‌م زه‌ویه‌دا!.

پێغه‌مبه‌ری پێشه‌واو دڵسۆزمان ﷺ ده‌فه‌رمووێ (يا عجبا كل العجب للمصدق بدار الخلود وهو يسعى لدار الغرور)اخرجه ابن ابى دنيا واته: ئای چه‌ند جێگه‌ی سه‌یرو سه‌رسوڕمانه، به‌هه‌موو مانای سه‌رسوڕمانێتی، بۆیه‌كێ ماڵی هه‌تا هه‌تایی به‌ڕاست بزانێ كه‌دوارۆژوو قیامه‌ته، كه‌چی هه‌وڵ و تێكۆشانی بریتی بێ له‌دونیا په‌رستی و بۆدونیای بوون و غروری و كه‌م نرخ و كه‌م ته‌مه‌ن تێ بكۆشێ.

ده‌گێڕنه‌وه جارێ پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویست ﷺ ڕاده‌وه‌ستێ له‌سه‌ر زبڵدانێ ده‌فه‌رمووێ وه‌رن په‌له بكه‌ن به‌ڵای دونیا پارچه په‌ڕۆكێی ڕزیو و ئێسقانێكی ڕزاو به‌ده‌ستی گرتبوو ئه‌وه دونیایه، دیاره مه‌به‌ستیشی ئه‌وه بووه كه‌به‌زرق و برقی دونیا فریو نه‌خۆین كه‌ببێ به‌مایه‌ی بێ ئاگاییمان له‌خوداو به‌رنامه‌كه‌ی هه‌روه‌ها ئه‌وه‌ش ده‌گه‌یه‌نێ عاقیبه‌ت و چاره‌نوسی زینه‌ت و ئاده‌میزاد هه‌رئه‌وه‌یه له‌سه‌ره‌نجامی ژیانی دونیایدا.

مامۆستای خۆشه‌ویست و ڕابه‌رمان ده‌فه‌رمووێ (ان الدنيا حلوة خضرة

وان الله مستخلفكم فيها فلينظر كيف تعملون فاتقوا الدنيا واتقوا النساء) واته: بزانن به‌ڕاستی دونیا سه‌وزاییه‌كی شیرینه و خودای بالآده‌ست ئێوه‌ی لیّ كردۆته جێنیشین و سه‌یرتان ده‌كاو بۆتان ده‌ڕوانیّ ئاخۆ چۆن كارده‌كه‌ن، جامه‌ردی خودا بن و خۆتان بپارێزن له‌دونیا، نه‌كه‌ن بیكه‌ن به‌مایه‌ی گومڕابوونتان به‌وه‌ی به‌ندایه‌ت دونیان بكه‌ن هه‌تكی حورمه‌تیان مكه‌ن ماف و حه‌قی خۆیانیان بده‌نیّ .

له‌كتێبی (ايها الولد)ی ئیمامی غه‌زالی له‌لاپه‌ڕه ۳۱-۳۲ ئه‌م باسه‌ی تیا هاتووه ...ئه‌بوبه‌كری شلبی ڕه‌حمه‌تی خودا له‌ئێمه‌و له‌ویش بیّ فه‌رموویه‌تی خزمه‌تی (٤٠٠) مامۆستام كردوه‌و له‌خزمه‌تیانا (٤٠٠٠٠٠) فه‌رمووده‌م خوێندۆته‌وه فه‌رمووده‌یه‌كم هه‌ڵبژارد، به‌وه‌ی كه‌بیكه‌مه میزان بۆخۆم كاری پیّ بكه‌م له‌به‌ر ئه‌وه بیرم لێی كرده‌وه والێی حالّی بووم كه‌خه‌لاص بوون و نه‌جاتی منی تیایه فه‌رمووده‌كه بریتیه له‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویست ﷺ فه‌رموویه‌تی به‌هه‌ندێك له‌ئه‌صحابه‌كان (١- اعمل لدنياك بقدر مقامك فيها ٢- واعمل لاخرتك بقدر بقائك فيها ٣- واعمل لله بقدر حاجتك اليه ٤- واعمل للنار بقدر صبرك عليها ،واذا اردت ان تعصى مولاك فا طلب مكانا لا يراك) واته: كاربكه بۆدونیا به‌ئه‌ندازه‌و قه‌ده‌ری مه‌قام و پله‌و پایه‌ی خۆت ...كاربكه بۆ ڕۆژی دوایی و قیامه‌تت به‌قه‌ده‌ر ئه‌وه‌نده‌ی كه‌تیای ده‌مینێیته‌وه واته(ماندو نه‌ناس به له‌تێكۆشان، چونكه ڕۆژی قیامه‌ت مانه‌وه‌ی تیا هه‌تا هه‌تاییه) كار بكه له‌پێناو دینی خوا به‌قه‌ده‌ر ئه‌وه‌ی چه‌ند پێویستیت به‌خوا هه‌یه (دیاره هیچ پێداویستیه‌كمان به‌بیّ كۆمه‌كی خودا دابین نابیّ)، وه‌ك له‌عه‌قیده‌ی طحاوی هاتووه ده‌فه‌رمویّ :ئه‌وه‌ی واحالّی بیّ كه‌یه‌ك چركه بیّ

مۆڵەت و کۆمەکی خودا دەتوانی بژییٚ ئەوە کافرو بیٚ باوەڕ بۆتەوە) کـار بکـە بۆناو ئاگری دۆزەخ بەقەدەر صبرو خۆڕاگریت لەناویدا(دیارە کەسیٚ بـۆ مـاوەی چرکەیەکیش صبرو ئارامی نیە لەناو ئاگر بمێنێتەوە، دەی کەواتە مانـای وایـە بەهەموو جۆرێك دەست بەرداری گوناه و تاوان و خراپە بە )جا ئەگەر دەتـەویٚ لەخودای شکۆمەندو بالأدەست هەڵگەڕێیتـەوە و عاصـیٚ بـی داوای شـوێن و مەکانیٚ بکە کەنەت بینیٚ (دیارە هیچ شوێن و مەکانیٚ نیە لەبەر چاوی خـودا نەبیٚ، کەواتە نەکەی لەخودای گەورەت عاصیٚ بی و پشتی تیٚ بکەی) ...

## بەشی سێیەم

حەزرەتی عیسی (علی نبینا وعلیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی دونیا داواكارو داوالێكراوە، ئەوەی داوای رۆژی قیامەت و ئاخیرەت بكات، ئەوە بەئیزن و خواستی خودا دونیا داوای دەكا هەتا بەش و بارو رزق و رۆزی خۆی بۆ تەواو دەكات، ئەوەی داواكاری دونیابێ و ئەوە رۆژی دوایی و ئاخیرەت داوا دەكا تاكو مردن پێ ی دەگا و ملی دەگرێ .

لەفەرمودەیەكی قودسیدا هاتووە كەزاتی ئازیز و شكۆمەند لەو كاتەی دونیای بەدیهێناوە و خەلقی كردووە پێ ی فەرموو (یا دنیا اخدمی من خدمنی واستخدمی من خدمك) واتە ئەی دونیا خزمەتی ئەو كەسە بكە، كەخزمەتی رێگەو بەرنامەی من دەكات، ئەو كەسەش بكە بەخزمەتكاری خۆت كەدلی بەتۆوە خەریكەو لەخزمەتت دایە.

موسای كوری یەسار دەلێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (ان الله عزوجل لم يخلق خلقا ابغض من الدنيا وانه منذ خلقها لم ينظر اليها)رواه ابن ابی دنیا واتە: خوای گەورەو بالا دەست و شكۆمەند هیچ مەخلوقێكی بەدی نەهێناوە و خەلقی نەكردووە وەك دونیا جێگەی ئەو پەری تووڕەیی و خەشمی بێ، لەو كاتەی بەدیهێناوە و خەلقی كردووە بۆی نەڕوانیوە و سەیری نەكردووە .

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ (الهاكم التكاثر يقول ابن ادم مالی مالی وهل لك من مالك الا ما اكلت فافنيت ولبست فابليت او تصدقت فابقيت ) رواه مسلم ..واتە (الهاكم التكاثر) كەئایەتێكی سەرەتای سورەتی (التكاثر) ە بەمانای (مەشغول بوون و خۆ خەریك كردن و شانازی كردن بەمال و كۆكردنەوە و پێوە بەسترانەوەی) ،دەلێ ئەی رۆلەی ئادەمی لەبەرچی وا

مەشغولی و لەغەفلەت دای، چی ماڵ و سامانی تۆیە ؟ئەگەر هەر ئەوە نەبێ كەدەیخۆیت و بەفەنای دەبەیت و، ئەوەی بەكالا و قوماشی دەدەیت و لەبەری دەكەیت كەسەرەنجامی رزیبوون و فرێدانە، ئەوەی دەیكەیتە خێرو دەیبەخشیتەوە لەرێگەی خودا بۆت دەمێنێتەوەو مایەی بەختیاری و سەرفرازیتە ..

ریوایەت كراوە جارێكیان حەزرەتی سولەیمان، كوری داود (علی نبینا وعلیهما الصلاة والسلام) رادەبوریّ بەرێگا بالندە سێبەریان لیّ كردوو زۆرێك لەئادەمیزاد و جنۆكەكان لەدەستە راست و چەپیەوە، لەخزمەتیان لەو كاتەی كەدەگەن پیاوێكی بەخواناسی لەبەنی ئیسرائیلەكان ،ئەو پیاوە دەلیّ قەسەم بەخوا ئەی كوری داود بەراستی خودای گەورە ماڵ و سامانێكی زۆر گەورەو عەزیمی پیّ داوی ،كەحەزرەتی سولەیمان گویّ ی لیّ دەبیّ دەفەرمویّ بەراستی (سبحان الله) ییّ لەصەحیفەو پەراوی مرۆڤێكی ئیماندار باشترە لەو ماڵ و سەروەتەی دراوە بەكوری داود .ئەو مولك و سامانەی دراوە بەكوری داودی بەسەردەچیّ و سبحان الله دەمێنێتەوە .

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویّ (ان الدنیا دار لمن لادار له ومال لمن لا مال له ،ولها یجمع من لاعقل له وعلیها یعادي من لا علم له، علیها یحسد من لا فقه له، ولها یسعی من لایقین له) .. واتە بەراستی دونیا خانوو ماڵی یەكێكە كە خانوو ماڵی نەبیّ ،وە ئەوەی ماڵ بۆ دونیا كۆیكاتەوە، هەر ئەو كەسەیە كەعەقل و ژیری نەبیّ، (مەبەست لەو كەسەیە كەبە دونیاوە خەریكە هیچ رەچاوی حەق و قیامەت ناكاو دونیای گرتۆتە باوەش و هەولی ئەوەی دەدا باشتریش لەباوەشی بگریّ) وە ئەوەی ناگەرێتەوە بەلای خودا دوور ناروانیّ

بەلای قەبرو قیامەتا، جار لەدوای جار لەقولایی دونیا پەرستی باشتر نوقم و نوغرۆ دەبێ، هەر ئەو کەسەیە کەعیلم و مەعریفەتێکی چاك و باشی نیە کەببێ بەمایەی سودو قازانج بۆی، وە ئەوانەی کەبۆ دونیا حەسوودی دەبەن، ئەوانەن کەفیقهو تێگەیشتنیان نیە وەئەوانەی کۆشش بۆدونیا پەرستی دەکەن ئەوەیە کەیەقین و دڵنیای نیە (بەبوونی ڕۆژێ قیامەت و بەهەشت و جەهەندەم...هتد.

هەروەها پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی ئادەمیزادی ئیماندار لەبەینی دوو ترس و خەوف دایە، ترسێکیان بریتیە لەو کات و زەمەنەی کەڕابردووە، نازانێ ئاخۆ خوای گەورە خێرو حەسەنات و عیبادەتی لێ قەبوڵ کردیە یان نا، وەترسەکەی تریان لەوکات و زەمەنیە کەماوە نازانێ ئاخۆ خوای گەورە چی قەزا کردووە، بامرۆڤ هەول بدا بۆ قیامەت و ئاخیرەتی، وەتاکو لەژیاندایە کاریکا بۆ پاش ژیانی کەمردنە، وەلەکاتی گەنجێتی هەول بدات بۆ کاتی پیری و بەساڵاچوون بزانن و تێ بگەن دونیا بۆ ئیوە خەلق کراوەو بەدی هاتووە وەئیوەش بۆ ئاخیرەت و قیامەت بەدیهاتوون و خەلق کراون، قەسەم بەو کەسەی گیانمی بەدەستە، لەپاش مردن هیچ کەس مۆڵەت نادرێ هیچ چارەیێ بەدەستەوە نامێنێ وەلەپاش دونیا هیچ شوێن نی یە تەنها بەهەشت یاخود دۆزەخ نەبێ .﴿١﴾

حەزرەتی عیسا سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی خۆشەویستێتی دونیا و قیامەت لەدلی ئادەمیزادی ئیماندار بەیەکەوە کۆنابێتەوە وەك چۆن ئاگرو ئاو لەقاپێکا بەیەکەوە کۆنابێتەوە .

(روی ان جبريل عليه السلام قال لنوح عليه السلام :يا اطول الانبياء

عمرا كيف وجدت الدنيا؟ فقال كدار لها بابان دخلت من احدهما وخرجت من الاخر) ریوایەت کراوە حەزرەتی جبرائیل (سەلامی خوای لیّ بیّ) فەرموویە حەزرەتی نوح (سەلامی خوای لیّ بیّ) ئەی ئەو پیّغەمبەرەی تەمەنت لەهەموو پیّغەمبەران (عليهم الصلاه والسلام) دریّژتر بووە، چۆنت دونیا دیت ؟فەرمووی وەك خانویّك دوو دەرگای هەبیّ لەدەرگایەکیان چوومە ژورەوە و لەدەرگاکەی تر هاتمە دەرەوە .

لەئیمامی حەسەنەوە ریوایەت کراوە :فەرموویەتی﴿۲﴾ پیّغەمبەر ﷺ رۆژیّ هاتە لای ئەصحابەکان رەزای خوای لیّ بیّ فەرمووی (ئایا لەئیوە هەیە بیەویّ خوای گەورە کوّرەیی دلی لەسەر لابەریّ و چاوی دلی رەوشەن بکاتەوە ،ئاگادار بن و بیّدار بنەوە ئەوەی خواست و رەغبەتی دونیا بیّ ،دونیا دریّژەی ئاواتی بیّ (واتە طولی ئەمەلی ببیّ بەدونیا) ئەوە خوای گەورە دلی کوّرە دەکات، بەپیّی ریّژەو ئەندازەی رەغبەت و طولی ئەمەلی ئەوەی خوا پەرستیّکی چاك بیّ بەمانای زاهید بیّ لەدونیا طولی ئەمەلی نەبیّ بەلکو رەغبەت و ئەمەلی کەم بیّ، بەدونیا ئەوە خوای گەورە فیّرە علیمی دەکات بەبیّ خویّندن و فیّرکردن، هیدایەت و ریّنمویی دەبیّ بەبیّ وەسیلەو هۆو ئەسباب، بیّدار ببنەوە لیّرە بەو لاوەقەوم و گەلیّ دیّنە گوّرەپانی ژیان، لەپاش ئیّوە مال کۆناکەنەوە ئیللا بەزۆری و کوشتن نەبیّ، دەولەمەند نابن ئیللا بەفەخرو شانازی رەزیلی نەبیّ، خۆشەویستی و مەحەببەتیان بۆ دروست نابیّ، ئیللا بەدواکەوتنی هەواو ئارەزوو نەبیّ، جا ئەگەر هەریەکیّ لەئیّوە کەوتە ئەو زەمان و رۆژە، صەبرو ئارام بگریّ لەسەر هەژاری و ئەگەر بشتوانیّ باخۆی دەولەمەند بکات، ئارام بگریّ لەسەر یەقین و تورەیی لیّوە وئەگەر بشتوانی

بچێته دونیای خۆشه‌ویستێتی وانه‌وه، صه‌برو ئارام بگرێ له‌سه‌ر بێ ده‌سه‌لاتی ئه‌گه‌ر بشتوانێ بابێ به‌ده‌سه‌تدار، ئه‌و جۆره صه‌برانه‌ش گشتی ته‌نها مه‌به‌ستی ره‌زامه‌ندی خوای گه‌وره بێ ،ئه‌وه خوای میهره‌بان پاداشتی پـه‌نجا راست گۆو صدیقانی پێ ده‌به‌خشێ . رواه ابن ابی دنیا .

## بەشی چوارەم

خوای گەورە و بالا دەست و شكۆمەند لەسورەتی (البقرە) ئایەتی ٢٠٠ ،٢٠١ ،٢٠٢ دا دەفەرمووێ ﴿فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا ۗ فَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ ﴿٢٠٠﴾ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُولَٰئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا ۚ وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾﴾ لەژێر سێبەرو واتاو مانای ئەم ئایەتانەدا خودای زاناو دانا، بۆمانی روون كردۆتەوە كەخەلكان و مەردوومان یەك جۆر نین، بەلكو لێك جیاوازن لەبیرو باوەر دا، هی واهەیە بەدوای بیر باوەرانێك دەكەوێ گشت ئاوات و ئامانجی تەنها لەدونیا كۆدەبێتەوە وەك بەواقیعی ژیانی بەس داوای بەش و باری دونیای لەخوای گەورە داوابكات ئاوایە، دوور ناروانن و ئاواتیان دوا رۆژ نی یە جا لەبەر هەر هۆیێ بێ، جا كەبەئاواتی دونیا ویستی ژیاون و هەموو هەول و كۆششەكانی بۆی كۆ كردۆتەوە، ئەوە فیترەتی لەخۆی پیس دەكاو ژیری خۆی دەشێوێنێ و بەدەردانی دەروونی نەفسی دادەكەوێ، روح و گیانی لێ فاسید دەبێ، چونكە ئادەمیزاد لەرێگەی روكنەكانی باوەرەوە حەق و مافی گیانی و روحی خۆی جەنگ دەكەوێ، روح و گیانی پێداویستی خۆی یەكجار زۆرەو وەپێویستە بەهەمیشەی پەیوەند بكات لەگەل خالیق و بەدیهێنەرەكەی، وەهەردەم كۆمەكی لێ وەربگرێ چونكە ئادەمیزاد لەدوو بەشی سەرەكی پێك هاتووە بەشێكیان لایەنە زاهیرە ماددی یەكەیەتی، كەلەكۆمەلی ئەندامی هاوپەیوەند پێك هاتووە، وەبەبەلێك دابرانی لەژیاندا

ناتوانیٚ بمێنێتەوە یا بەئاسودەیی و كامەرانی بژییٚت ..جا ئـەم لایەنـە بەشـە ماددیەی هەردەم پێویستی بە ماددیات هەیەو دەبیٚ، چونكە خۆی لەماددیات بەدی هـاتووە وەك خـۆڵ و كانزاكـانی و ئـاو...هتـد.ئـەو بەشـە ماددیانـەی كەگەرەكیەتی بۆ تەواو بوون و بەردەوام، بوون بەرەو ئاسۆی دروسـت و تـەواو، دابین كردنی پێداویستیەكانی ئەمە هەردەم پێویـستی بـەخۆراك و ئـاوو هـەوا هەیە ئەگـەر نـەخۆش كـەوت ئـەوە هـەر دەرمـان چارەسـەریەتی كەگـشتیان لەئاسۆو دونیای ماددەدا كۆ دەبێتەوە و كۆبونەتەوە.

لایەنەكەی تری ئادەمیزاد پێك هاتووە لەرۆح و گیان، ئەم بەشە لەماددە پێـك نـەهاتووە، بـەڵكو لـەفووێكی خـودایی هاتۆتەكایـەوەو خـەڵق بـووە، كەلەئاسمانـەوە ڕاهـاتووە پێداویـستیانی گـەلیٚ زۆرن كـە گـشتیان هـەر لـە ئاسمانەوەن، واتە لەلایەنی خودای تاك و پاك و بیٚ گەردە، جا ئادەمیزاد تـاكو بەرەو ئاسۆیەكی تەواوو ڕێك و پێك بـڕوا لەتـەواوی و چـاكی و جـوانی نزیـك دەبێتەوە، گەرەكیەتی هەردەم پێویـستیەكانی لایـەنانی مـاددی و مەعنـەوی خۆی دابین بكات واتە هاوپەیوەند بیٚ لەگەڵ زەوی و ئاسمان، لەگـەڵ زاهـیری و باتینی، لەگەڵ لاشەو ڕوح و لەگـەڵ دونیـاو قیامـەتـدا، ئابەمـەوە ئـادەمیزاد دەكەوێتە سـەر ڕاسـتە فـیترەو سروشـتی خـۆی و دەروونـی ئاسـودە دەبـیٚ و لەنەخۆشیەكانی دەروونی و فیكری و روحی ڕزگاری دەبـیٚ و ژیـانی پـڕ دەبـیٚ لەكامەرانی و دوارۆژو عاقیبەتیشی هەر پیرۆزی و بـەرزی دەبـیٚ لەبەهەشـتی ئاسمانی پڕنیعمەت و پلەو پایەدا.

جا خەڵكانێك لەبەر زوڵم و ستەم یا لەبەر سەر لێشێواوی و كوڵەواری بەدوای ماددیات دەكەویٚ واز لەمەعنەویات دەهێنێت، ڕوو لەزەوی دەكاو

پەیوەندی لەگەڵ ئاسماندا ناکات، وەك ئەوە وایە لەبەر خودا بپارێتەوە و بڵێ خودایە بەش و بارێکی باشی دونیایم پێ ببەخشەو بەس، جا ئەم جۆرە ئادەمیزادانە، نە هەر لەژیاندا ئاسودەو کامەران نابن لەبەر ئەوەی ڕوحیان فاسید بووە، بەڵکو لەکاتی گیان دەرچونیشیان گیانیان بەرەوئاسمان ناچێت پیرۆزو بەرز نابێ ناکەوێتە بەر ڕەزامەندی خودای میهرەبان و بەڵکو دادەشکێتەوە بەلای مادديەت و زەویدا بەلای نزمی و بێ قیمەتیدا بەلای جەهەنندەم و خشم و قینی خوداییدا، جا ئەم جۆرە کەسانە بەش و باریان لەلای خوای گەورە بۆنیە، لەدوارۆژدا بەدبەخت و ماڵ کاوڵ و بێ نرخ و داماو و زەبوون دەبن لەجەهەننەمی هەتاییدا، خوا پەنامان بدا بەڕەحمی خۆی، ئەم ئایەتانەش ماناو واتای مەبەستی باسکراومان بۆ دەردەخەن لەوەی کەئادەمیزاد لەدووبەشی سەرەکی پێك هاتوون ماددی و مەعنەوی زاهیری، و باتینی وەك خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَـٰنِ مِن طِينٍ ۝٧ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ۝٨ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ۝٩﴾ (السجده٧ - ٩) واتە: زاتی خودا ئەو زاتەیە کەهەموو شتێکی بەجوانترین شێوە بەدی هێناوەو ئادەمیزادی لەقوڕ خەڵق کردووە، پاشان وەچەو نەوەی گێڕاوە لەڕێگای پشتاو پشتەوە بەهۆی ئاوی مەنی یەوە، پاشان لەڕوحی خۆیا فوی بەلاشەکەیا کردووە، وەگوێچکەو چاوو دڵیانی پێداوەلەگەڵ ئەو هەموو نیعمەتانەش کەمێ ستایش و شوکرانەی دەکەن، وەکەسانێکی تر هەن ئاسۆی ژیری و عەقلیان فراوانەو دوربین و هۆشیارن

سینەو دڵو دەروونی خۆیان پاك كردۆتەوەو بەنوری ئیمان ڕەوشەنیان كردۆتەوە پەیوەندیان هەیە لەگەڵ زەوی و ئاسمان، پێداویستیان لەهەردوو لایەنی ماددی و مەعنەوی دابین دەكەن بەم هەڵوێستە ڕاست و دروست و لەجێیە، عەقل و ژیری خۆیان ئازاد كردووە، فیترەت و سروشتی خۆیان بەرەو پاكی هێناوەو ئاسودەیان كردووە بەهۆی پەیوەندی لەگەڵ خالق وبەدی هێنەریان خورەوشتی خۆیانیان جوان كردووە، بەهۆی تەقواوە دڵ و گیان پاكی و دەست و داوێن خاوێنی و ڕووخۆشی داب و نەریتیانە، هەلوێست و كارو كردارو گوفتاریان ڕەنگ دەداتەوە لەمانای (ربنا اتنا في الدنيا حسنة وفى الاخرة حسنة وقنا عذاب النار) پەروەردگارا بەخشش و ڕەحمەتت لەدونیاو قیامەتدا پێمان ببەخشە بشمان پارێزە لەئازارو ئەشكەنجەی ئاگری جەهەننەم خودای پاك و بێ گەرد وەك لەمەخلوقی خۆی بێ ئاگا نەبووە، بێ ئاگاش نابێ وەپشتیشی لەئادەمیزاد نەكردووە بێ حیساب نەیهێشتۆتەوە بەڵكو چاوی بیناو گوێی بیستنی هەمیشە لێیانە پەروەردەیان دەكاو سەرەنجامیش زۆر بەووردی حیسابیان لەگەڵدا دەكاو، هەركەسەو بەبەش و سزای خۆی دەگەیەنێ، جا یا بەلای جەهەنددەمایە یا بەلای بەهەشتایە، كەسانێك هەن لایەنە بەش و بارەكەی ماددیان فەرامۆش و ئیهمال كردووە، نرخێكی بەهەقی خۆی یا بەمانای خۆی بۆ دانێن هەر ڕوویان كردۆتە لایەنە ڕوحی و مەعنەویەكەیان، وەكو ئەوە بەشێكی ئەم ئایەتەیان پشت گوێ خستبێ و (فى الاخرة حسنة وقنا عذاب النار) یان وەرگرتبێ و ڕوویان تێ كردبێ و واش حالێن كەڕاستێتی ئیسلام و خواناسین هەر لای ئەوانە، كەسانی تر پێی نەگەیشتوون .

لەحەقیقەتدا ئایینی پیرۆزی ئیسلام ڕوونی كردۆتەوە كەخوای گەورە

ئێمەی لەسەر ئەم زەویە بەدی هێناوە، تاکو بەرەو شارستانێتی و پێش کەوتن و هەنگاو هەڵگرین، بەئاسمان و زەویدا بڕوانین و نیعمەتەکانی زۆری هەمەچەشنەی تیان کەبۆمان ڕام و موسەخخەر کراون، داوالێکراوین لێ بکۆلینەوە تاکو گەورەیی خودای بێ هاوتا زیاتر بەرچاو بخرێ بۆ عالەمی فریشتەو جنۆکەو ئادەمیان.

ئەمە لایەنە کارو وەزیفەیەکی ئادەمیزادە، خۆی دەگرێتەوە لەمانای (ربنا اتنا فی الدنیا حسنه) چونکە ئادەمیزاد بۆ عیبادەت و بەندایەتی و ئاوەدان کردنەوەو بینا کردن و جێ نشینایەتی و خەلافەت بەدی هاتووە و خەلّق کراوە ،کەگشتی لەمانای کارچاکی و عەمەلی صالح دا کۆدەبێتەوە، لەپاڵ ئیمان و باوەڕدا، جا کەسانێك ئەم وەزیفەو کارانەی خۆی پشت گوێ بخا، یا هەندێکی بکاو هەندێکی نەکا و هەوڵی بۆ نەدا، یاوای لێ حاڵی نەبێ، ئەوە.

زولم و ستەم لەنەفسی خۆی و خەلکانی تر کردووە ..چونکە دونیا مالی هەموو ئادەمیزادەکانە و ژیان تێیدا گشتی یە و هەمەلایەنە، هاو پەیوەندە گشت لایەنەکانی بەیەکەوە، ئەم جۆرە هەلوێست و ناحالی بوونە لەگومرایی و سەرلێشێواوی گاورە دێرینەکانی ئەورپاوە هاتۆتە کایەوە بەناوی (رهبانیه) روویان کردۆتە (خلوه) خانەو ئەشکەوت وازیان لەدونیا و ژیانی حەقیق هێناوە ،بەگومانی خوا پەرستیەکی راست و دروست ،بەلام ئایینی پیرۆزی ئیسلام، خوای گەورە وادەی داوە بەپاراستنی پەیامەکەی و وەك خوای گەورە دەفەرمووێ (انا نحن نزلنا الذکر وانا له لحافظون) کەسێ نەیتوانیوە و ناشتوانێ بیگۆرێ و دەست کاری بکات هەردەم وەك رۆژی رووناك راستیەکان پێش کەش

بەبەرەی ئادەمیزاد دەکات، وەك رەحمەت و نیعمەتانێکی خودایی، جا ئەم ئایینە پیرۆزە دونیای گێراوە بە کێلگەی دوا رۆژ، وەك پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرمووێ (الدنیا مزرعة الاخرة) هەروەها رەونەق دەداتەوە لەماناو واتای (ربنا اتنا فی الدنیا حسنة وفی الاخرة حسنة وقنا عذاب النار) ..

هەروەها پێغەمبەری سالارو سەردارمان ﷺ دەفەرموێ (لارهبانیة فی الاسلام) واتە گۆشەگیری و خۆ دوور گرتن بەناوی خواپەرستی لەئیسلام دا نی یە بەلکو لەئیسلامدا هەموو دونیا خەلوەی ئادەمیزادی ئیماندارە نەك کون و قوژبنێ بەتەنها .. وەك پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرمووێ (الدنیا سجن المؤمن وجنة الکافر) واتە دونیا بەندیخانەی ئیماندارانە و بەهەشتی بێ باوەران و کافرانە ..هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ (من لم یهتم بامر السلمین فلیس منهم) واتە ئەوەی ئیهتمام بەفەرمان و کارو کردەوەی موسلمانان نەدات ئەوە لەموسلمانان نی یە ..

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ (رحمة للعالمین) بووە، خۆی قودوەو پێشرەوی موسلمانان و خواپەرستان بووە ،ئەوەی سیرەی ژیانی خوێندبێتەوە یا بیخوێنێتەوە، بەروون و ئاشکرایی بەرچاوی کەوتووە، یابەرچاوی دەکەوێ کەپێغەمبەر ﷺ چەند ئیهتمامی بەدونیا و ژیانی موسلمانان داوە، عەقلیەتی کۆ کردنەوە تەجمیعی موسلمانانی چەنی فراوان بووە، هەروەها عەقلیەتی ئیداری و بەرێوەبردنی چەنێ لەپێش کەوتن و زانیندا بووە، هەروەها عەقلیەتی تەنزیم و رێك خستنی لەو پەری حیکمەت و فراوانی ودانایی دابووە ..هتد .. ئا ئەمانەی مانای (رحمة للعالمین) یان تەواو کردووە، ئا ئەمانە

بونەتە مایەی هیدایەت و رەحمەت و بەرەکەت لەنێوان موسلماناندا ئەگەر واز لەمانە بهێنرێ ئەوە مانای (رحمة للعالمین) لێ تێك دەچێ و هەلدەوەشێتەوە ..تەنانەت هەندێ لەمەسیحیە دێرینەکان ئاینی ئیسلامیان بەدونیا ویست (علمانی ئەمڕۆ مانا) دەزانی بۆیەپێی رازی نەبوون، گوایە ئەوان خواویسترو قیامەت ویستن.

با ئەو راستیەشمان لەبیر نەچێت کەدونیا کێلگەی دوا رۆژ و قیامەت بێ باشە، ئەوەی چی نەچێنێ چ بدروێتەوە ؟.ئەی ئەوە نی یە خودای شکۆمەند دەفەرمووێ (لیس للانسان الاما سعی) واتە ئادەمیزاد هیچی بۆ نی یە تەنها کۆششەکەی خۆی نەبێ دیارە ئەم کۆششەش هەر لەدونیایە نەك قیامەت ..ئەدی ئەوەنی یە خوای گەورە و بالادەست دەفەرمووێ (وقل اعلموا فسیری الله عملکم ورسوله والمؤمنون) واتە :بفەرموو بلێ کاربکەن و کۆشش بکەن، لێرە بەولاوە خودای شکۆمەند و پێغەمبەرەکەی و ئیمانداران چاویان بەکارەکانتان دەکەوێ..

باشە ئەگەر ئادەمیزاد دەسەلاتی نەبێ لەدونیا دەست لەمانای دەسەلات بکێشێتەوە کەی زوڵم و ستەمکاری دیکتاتۆرانی پێ لەبەین دەچێ ؟ ! کەئەمرو فەرمانێکی خودای یە.. کەی چارەی هەژارانی پێ دەکرێ ؟کەی یا چۆن موسلمانان بەرەو برایەتی و ئاکارو ئاداب و خورەوشتی ئیسلامەتی پێ دێ ؟..کەی دەتوانێ خەلکان لەبەندایەتی مەخلوق رزگار بکاو لەحاکمایەتی خودا حالیان کاو تێیان بگەیەنێ ؟.. کەی و چۆن ئەمرو فەرمانەکەی خودا کە لەقورئانا بەیان کراوە بەجێ یان بگەیەنێ ..کەی یا چۆن دەتوانی ئەمرو فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ بەجێ بگەیەنێ ؟.. کەی دەتوانێ یا چۆن

دەتـوانیٚ وەلاٚمـی پرسـیارەکانی خـودا لـەرۆژانی مەحـشەرو قیامەتـدا وەلاٚم بداتەوە.

جا بەراستی حالی بوون لەمانای ڕاستی ئیسلام و کـارپیٚ کردنـی ،ژیـان دیٚنیٚتەوە سەر باشترین ڕیٚگەی خۆی، هەموو لایەنەکانی دەبوژیٚنیٚتەوە و بـەرەو ئاسۆیەکی گەشاوەو پیٚشکەوتن دەیهیٚنیٚ ،لەگەل هەموو کات و زەمانیٚکـدا .. شارستانیٚتی هاوچەرخ رزگار دەکا لەتەنگ و چەلەمەکانی و بـەرەو کامـەرانی هەمیشەیی دەیبات ..

لیٚرەدا هاتینە کۆتایی زنجیرەی دووەمی ئادابەکانی ئیسلام ..

ربنا لاعلم لنا إلا اما علمتنا انك انت العليم الحكيم ..

ربنا تقبل منا انك انت السميع العليم .

## بێداربوونه‌وه‌و له‌خه‌و هه‌لسان :

بێداربوونه‌وه‌و له‌خه‌و هه‌ڵسان وه‌ك نیعمـه‌ت و به‌هره‌یـه‌كی خـودایی یـه‌، له‌هه‌مان كاتیشا ئایه‌ت و نیشانه‌یه‌كه له‌ئایات و نیشانه‌كانی خودای تاكو پاك ،به‌لگه‌و ده‌لیلێكی ره‌وشه‌ن و گه‌وره‌و ئاشكراشه‌، له‌سه‌ر ده‌سه‌لاتی بێ پایـانی و بێ سنووری زاتی شكۆمه‌ندی بالاده‌ست، له‌هه‌مان كاتیشا ده‌رس و وانه‌یه‌كه له‌لایه‌نی په‌روه‌رده‌گاره‌وه بۆ به‌نده و ئاده‌میزاده‌كان كه‌هه‌رده‌م بیریان ده‌خاتـه‌وه ئاوه‌ها خوادی بالاده‌ست زیندووتان ده‌كاته‌وه له‌پاش مردن، له رۆژی قیامه‌تـدا ..

زاتی شكۆمه‌ند په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رمووێ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِبَاسًا وَٱلنَّوْمَ سُبَاتًا وَجَعَلَ ٱلنَّهَارَ نُشُورًا ﴿٤٧﴾ (الفرقان ٤٧)، واته : زاتی په‌روه‌ردگار خۆیه‌تی بۆ ئیوه ئه‌م یاسایه قه‌شه‌نگ و جوانه‌ی كه‌ونی دابـین كـردووه شـه‌وی گێراووه بۆتان به‌پۆشاك و نوستنی داناوه بۆ ئیسراحه‌ت و پشوودان و رۆژیـشی گێڕاوه به‌مایه‌ی گه‌ران بـه‌دوای ژیـوارو كـاركردن ... جـا له‌سـه‌ر ئـاده‌میزاد پێویسته كه‌به‌یانی ده‌كاته‌وه‌، زاتی پـه‌روه‌ردگاری یـاد بكاتـه‌وه و پـشتی پـێ ببه‌ستێ، به‌م هه‌لوێست و بیره‌وه پێـشوازی له‌به‌ره‌بـه‌یان بكـات لـه‌و كاتانـه‌ی كه‌هۆش و بیر ساف و بێ گه‌رده‌و عه‌قل و ژیری ده‌رگای خستۆته سه‌ر پـشت و لاشه‌و به‌ده‌ن چووست و چالاكه‌.

## چه‌ند خالێك له‌ئادابی بێداربوونه‌وه، له‌خه‌وهه‌لسان :

١- پێویسته ئاده‌میزادی موسلمان به‌یانیه‌كه‌ی زوو پێش (طلوع الشمس) و پێش ئه‌وه‌ی ئاسۆی رۆژهه‌لات به‌رو روونی بێ له‌خه‌وهه‌لبستێ، تاكو سووده‌كانی روحی و گیانی چه‌نگ كه‌وێ، ته‌ندروستی به‌ده‌ن و لاشه‌ی له‌جێ بێ و كاتێكی چاك و پیرۆز و باش و صافی له‌كیس نه‌چێ ،سوودی لێ وه‌ربگرێ بۆ عیباده‌ت و .. زیركرو طاعه‌ت و به‌ندایه‌تی و خوێندنه‌وه‌و دیراسه‌كردن و گه‌لێ سوودی تر ..هتد خوای بالاده‌ست له‌م باره‌وه ده‌فه‌رمووێ ﴿كَانُوا قَلِيلًا مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ۝ وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ (الذاريات ١٧-١٨) زاتی په‌روه‌ردگار باسی سیفه‌ته‌كانی به‌هه‌شتییان ده‌كا، كه‌به‌و هۆیه‌وه به‌و پله‌و پایه‌وه، به‌و به‌هره خواییه گه‌یشتوون، یه‌كێ له‌م سیفه‌ت و كارانه‌ی ئه‌و ئیماندارانه ئه‌وه بوو خه‌ۆكی نه‌بووینه، زۆر عیشقه نوستن و پال دانه‌وه نه‌بووینه به‌لكو كه‌مێ له‌شه‌وا پال كه‌وتوون به‌یانیانی زۆر زوو، پارشێوه‌كان جێگای خه‌ویان جێ هێشتووه روویان كردۆته خوداو شه‌و نوێژ و ته‌وبه‌و استغفاریان كردوه .

٢- یه‌كه‌م شتێ كه‌له‌به‌بیرو هۆش و دل و زمان دابێ یاد و زیكری خوای گه‌وره‌یه بریارو دان نانه به‌تاك و ته‌نیایی خودای بێ هاوتا و پارانه‌وه و دوعا له‌به‌ر كردنیانه ..وه‌ك كه‌له پێغه‌مبه‌ر ﷺ گێردراوه‌ته‌وه له‌كاتی له‌خه‌و هه‌لسانیا فه‌رموویه‌تی (الحمدلله الذی احیانا بعدما أماتنا والیه النشور) رواه البخاری، حه‌مدو سه‌ناوستایش بۆ ئه‌و زاته په‌روه‌ردگاره‌ی كه‌زیندوومانی كردوه پاش ئه‌وه‌ی كه مراندبوومانی، گه‌رانه‌وه و كۆكردنه‌وه‌شمان هه‌ر بۆ لای

ئەوە لەرۆژی زیندوو کردنەوەو قیامەتا ..حیکمەت لەو دوعایەش گەلێ زۆرە یەکێ لەوانە خۆمانمان بیر دەخاتەوەو خوامان یاد دەخاتەوەو مردن و دوارۆژمان نیشان دەداو وفێری ئەوەمان دەکاکە پێشنیارەکانی نەفس و شەیتان پێشوازی لێ نەکەین، کاتێ کە دەلێن دەی مەجالەو قۆل و باسکی لێ هەلکەو لەحەرام و حەلال مەپرسە رەش و سپی مەناسەو ژیان هەر ئەو رۆیە ..وە گەلێ وانەو دەرسی تیایە .

٣- پاش هەلسان و یادی خودا رووەو پاکی و خاوێنی ببین، دەستنوێژێکی جوان و پاك و خاوێن و دروست بشۆین و پاشانیش نوێژێکی بەوشیاری بیرەوە ئەنجام بدەین بەوپەڕی ئەدەب و ویقارو خشوعەوە، لەئەبو هورەیرە ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (یعقد الشیطان علی قافیە رأس أحدکم اذا هو نائم ثلاث عقد یضرب علی کل عقدة علیك لیل طویل فأرقد فان استیقظ وذکرالله تعالی انحلت عقدة فان توضا انحلت عقدة فان صلی انحلت عقدة فاصبح نشیطا طیب النفس والا اصبح خبیث النفس کسلان) متفق علیه واتە: شەیتان لەلای سەروی هەریەکێ لەئێوە (واتە لەقاقۆلی) سێ گرێی لێ دەدا کاتێ کەئەو نوستووە لەواتاو مانای هەریەکێ لەم گرێیانە کەکابرای نوستووە واتێ دەگەینێ بۆخۆت پالّ دەوەو شەوێکی دورودرێژە، جا ئەگەر بێداربووەوە و زیکرو یادی خوای کرد ئەوە گرێیەك دەبێتەوە لەشی کەمێك سوك دەبێ، جائەگەر هەستاو دەست نوێژێکیشی شوشت ئەوە گرێی دووەمیش دەبێتەوە لەش و بەدەنی باشتر لێ سوك دەبێ، جائەگەر نوێژێکیشی کرد ئەوا گرێی سێ هەم دەبێتەوە، کەئەو بەیانیەی کردووە گیانی پاك و خاوێن ولاشەیەکی چوست و چالاك و ڕوحیکی ئاسوودەیی دەبێ بەپێچەوانە بەیانی

بەنەفس و گیانێکی پیس وبەلاشەو بەدەنێکی گران و تەپ و تەمبەڵ دەکاتەوە)

٤- خۆنەگرخاندن و کەلەکە وەرنەگێڕان، لەپاش وەئاگا هاتن و بێ داربوونەوە لەخەو، بەوەی بلێ ی دەی هێشتا زووە، ئیستاکە دەمێکی تر هەلدەستم چونکە لەوانەیە دووبارە خەو بتباتەوە بکەویە دونیای خەوەوە تاکاتانێکی زۆر درەنگ وەئاگانەیێ ی ببێ بەمایەی نوێژو چوون و کات لەدەست دەرچوون ،لەئامۆژگاریەکی پێغەمبەرﷺ هاتووە فەرموویەتی ئەی فلان زۆر مەخەوە چونکە ئەوەی زۆر بخەوێ لەرۆژی قیامەت فەقیرو هەژار دەبێ .

٥- تەمبەلی لەخۆ لادان، لەکاتی هەلساندا، جا لەبەر سەرما بێ، یا بۆرژان بێ یا لەبەر هەر شتێکی تربێ .

٦- خۆلادان و نەچوونەوە بۆ سەر جێ ی نووستن، پاش بێداربوونەوە لەبەرە بەیانی زوودا کەهەستێ بەئومێدی خەوەوە نوێژەکە بەجێ بگەینێ کەمایەی شلی و خاوی و پەلەی نوێژەکەیە تاکو زووتر بگەرێتە باوەشی خەو .

٧- شوشتنی دەم و ددان و خاوێن کردنەوەیان، بەشێوەیەکی تەندروستی و سوود بەخش، جایا بەسیواك و ئاو یا بەفلچەو مەعجون کەمایەی لادانی بۆنی ناخۆشی ناو دەم بێ، لەهەمان کاتیشا پارێزگاری بێ بۆ ددانەکان، لەخەدیجەوە(رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەر ﷺ کاتێ لەخەو هەلساوە دەمی بەسیواك پاك کردۆتەوە ) (کان رسول الله اذا قام من النوم یشوص فاه بالسواك)متفق علیه .

٨- بێ دەنگی پاراستن و نەکردنە هۆسەو هەراو غەلبەغەلب لەکاتی

وەناگا هاتن، دەست نوێژ شوشتن بەفنەو فن و كۆخە كۆخێكی زۆر بەرز كەببێ بەمایەی ئیزعاج كردن و بێزار كردنی دەرو دراوسێ و جیران، بەكورتی خۆلادان لەبێزار كردنی كەسانی تر لەماڵەوە یان دراوسێ جا بەهەر هۆیەكەوە بێ .

٩- ئاگا لەخۆ بوون بەدەرنەچوونی لەناكاو لەشوێنی گەرمەوە بۆ شوێنی سارد، بەتایبەتی لەكاتی بێدار بوونەوە لەخەودا ئیللا پاش لەبەركردنی پۆشاكی پێویست و گونجاو .

١٠- نەرمی و نیانی و نەكردنە هۆسە و دەنگ بەرزكردن لەكاتی بێدار كردنەوەی كەسانێ تر لەخەو ،بەلكو لەسەرخۆ بیر خستنەوەی یادی خودا بە(لا اله الا الله)بەقسانی خۆش و بەحیكمەت وەك بلێ ی نوێژكردن باشترو خێرترە لەخەو و نوستن (الصلاه خیر من النـوم) جا ئەگەر یەكێ بەجارێك لەخەوا هەلنەسا تۆش وازی لێ مەهێنە، بەلكو پاش كاتێكی كەم دیسان هەولی هەستان و بێداربوونەوەی بدە.

١١- كردنەوەی دەرگاو پەنجەرەكانی ژووری خەوتن (ئەوە لەكاتێكا كەلەژوورەوە بخەوین) بۆ ئەوەی هەواوی نوێ بێتە ژوورەوە هەوای كۆن و بەكارهاتوو دەرچێ بێجگە لەوەرزی زستان و سەرما.

١٢- رێك خستنەوەی جێگاكانی نووستن بەهەلگرتنیان بێ بۆ شوێنی خۆی، یا ئەگەر قەلەوێرە بوون بەچاكردنیان و رێك خستنەوەی بەتانی و پێخەفەكان بەشێوەیەكی جوان و عادەتی و باش .

لەئەبو هورەیرە ریوات كراوە (رەزای خوای لێ بێ) كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (هەر یەكێ لەئێوە بێداربووەوە بلێ (الحمدلله الذی رد علی روحی و عافانی فی جسدی واذن لی بذكره ) رواه الترمذی وقال حدیث حسن واتە:

حه‌مدو ستایش بۆ ئه‌و خودایه‌ی كه‌گیانی گه‌ڕاندەوه لاشه‌وبه ده‌نێكـی سـاغ و باشی پێدام كه‌مایه‌ی عافیه‌ت بێ بۆم مۆڵه‌تی دام كه‌زیكرو یادی بكه‌م .

هه‌روه‌ها له‌عائیشه (ره‌زای خوای لێ بێ)كه پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی هیچ عه‌بدو به‌نده‌یێ نییه له‌و كاته‌ی كه خـودای گـه‌وره روح و گیانه‌كـه‌ی بـۆ ده‌گه‌ڕێته‌وه بلێ (لا اله الا الله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمـد وهـو علـى كل شي قدير) ئیللا خوای گه‌وره له‌گوناهه‌كانی ده‌بووری ئه‌گه‌ر هه‌نـدی كـه‌فی ده‌ریاش بێ رواه ابن السنى .

## ئادابی ده‌ست به‌ئاوگه‌یاندن ( قضاء الحاجة )

بریتیه له‌به‌ڕێ كردنی پـاش مـاوه‌ی خواردنـه‌كان لـه‌زگ و ڕیخۆڵـه‌وه لـه ڕێگه‌ی كۆم و مه‌جالی به‌ول و میزه‌وه ،دیاره ئه‌و پاش ماوه‌یه ئێش و زیانه بۆ به‌ده‌ن وڕزگاربوون لێیه‌وه ڕه‌حمه‌ت و نیعمه‌تێكی خوای گه‌وره‌یه بۆئه‌وه‌ی لاشه‌و به‌ده‌نمان به هه‌میشه‌یی به‌چـاكی و سـاغی بمێنێتـه‌وه، دووربـێ له‌نه‌خۆشـیان، ڕیوایه‌ت كـراوه پێغه‌مبـه‌ری خۆشه‌ویـست ﷺ كـاتێ كه‌لـه ئـاوده‌س خانـه ده‌رده‌چوو ده‌ی فه‌مـوو (الحمدالله الذى اذاقنى لذته،وابقى فى قوتـه ودفـع عنـى اذاه) رواه عن ابن عمر الطبرى وابن السنى) واته: حه‌مدو سـتایش بـۆ خـودای گه‌وره‌و میهره‌بان ئه‌وزاته‌ی له‌ززه‌تی خۆی پێ چه‌شتم و له‌هێزو ده‌سه‌ڵاتا لـه‌بن نه‌هاتووه وه‌ئه‌زیه‌ت و ئێش و ئازاری خۆی له‌سه‌ر لادام.

## هه‌ندیٚ ئادابی تایبه‌ت به‌ئاوده‌ست خانه‌:

١- ته‌ئكید كردن و دلّنیا بوون به‌وه‌ی كه‌ئاوده‌ست خانه‌كه‌ چۆلّه‌و كه‌سی تیا نیه‌ و له‌شویٚنیٚ كه‌خه‌لّكان زۆر به‌سه‌ریه‌وه‌ن له‌ده‌رگادانی و چاوه‌ڕوان كردن له‌لابه‌لای (ئه‌ده‌ب خانه‌كه‌) تاچۆلّ ده‌بیٚ و ئیحراج نه‌كردنی خه‌لّكان به‌زۆر له‌ده‌رگادان و ڕاوه‌ستان له‌نزیك وبه‌رامبه‌ر ئاوده‌ست خانه‌كه‌ یانه‌گه‌ر دیتت كه‌سانیٚ هه‌ن چاوه‌ڕیٚ ده‌كه‌ن ئیتر پیٚی ناویٚ تۆ له‌ده‌رگاكان بده‌ی دیاره‌ به‌تالّ نیه‌، ئه‌وكاته‌ سره‌ی خۆت ده‌گری و پیٚش كه‌سانیٚ ناكه‌وی كه‌له‌پیٚش تۆدا بۆئه‌ومه‌به‌سته‌ له‌ویٚ وه‌ستاون ،جائه‌گه‌ر ویستت چاكه‌و خیٚر بكه‌ی كه‌سیٚ دوای خۆت پیٚش خۆت خه‌ی له‌وكاته‌ی كه‌ نۆره‌ت هات نه‌كه‌ی بلّیٚی فه‌رموو چونكه‌ مانای ناخۆشی لیٚ وه‌رده‌گیریٚ به‌لّكو بلّیٚ برا گیان تۆ بچۆ له‌پیٚشدا خۆت نه‌جات ده‌.

٢- كاتیٚ كه‌ده‌چیته‌ ناو ئاوده‌ست خانه‌ پیٚویسته‌ به‌پیٚی چه‌پ بچیته‌ ژووره‌وه‌، له‌ئه‌نه‌سه‌وه‌ گیٚڕدراوه‌ته‌وه‌ كه‌ پیٚغه‌مبه‌رﷺ كاتیٚ كه‌ده‌چووه‌ سه‌ر پیٚشاو ده‌ی فه‌رموو (اللهم انی اعوذبك من الخبث والخبائث)متفق علیه واته‌: ئه‌ی خوایه‌ من په‌نا به‌تۆ ده‌گرم له‌پیسایی و پیسه‌كان(مه‌به‌ست له‌جنۆكه‌كانی نیٚرو میٚیه‌).

٣- هه‌روه‌ها له‌دوعای ده‌رچوون له‌ئاوده‌ست خانه‌ له‌ئه‌نه‌سه‌وه‌ (ڕه‌زای خوای لیٚ بیٚ) گیٚڕدراوه‌ته‌وه‌ كه‌ پیٚغه‌مبه‌رﷺ كاتیٚ ده‌رده‌چوو ده‌ی فه‌رموو (غفرانك، الحمدلله الذی اذهب عني الاذی وعافاني) رواه ابن ماجه واته‌: ئه‌ی خوایه‌ گیان داوای لیٚبوردنت لیٚ ده‌كه‌م ،سوپاس و ستایش و حه‌مدی ئه‌و

خودایــە دەكــەم كــەئێش و ئەزیــەتی لەســەر لادام و لای بــرد، عافیــەت و تەندروستی چاكی پێ بەخشیم.

٤- ئەگەر ئادەمیزاد لەماڵەوە بوو جل و بەرگێكی سوك و ســادە لەبــەر بكات، لەكاتێك كەدەچێ دەست بەئاو بگەیەنێ نەك جل و بەرگی زۆرو شــل و شۆڕ ئاگاداری ئەو پۆشاك و بەرگەبێ لــەپاك و خــاوێنی، لــەوەی خــۆی جــوان بشۆرێ و خۆی بپارێزێ لەپشكە میزو پیسایی.

٥-خۆلادان لەوەی قیبلە بكەوتە ڕووەو پێشەوە یا پشتەوە لەئەبو ئەیوبی ئەنصارییەوە كە پێغەمبــەر ﷺ فەرموویــەتی (اذا اتــی احدكم الغــائط فــلا یستقبل القبلة ولا یولها ظهره شرقوا او غربــوا) متفــق علیــه واتــە: هەریــەكێ لەئێوە ئەگــەر چــووە سەرپێــشاو، پــێش و پاشــی نەخاتــە ڕووەو قیبلــە ڕووەو ڕۆژهەلاَت یا ڕۆژ ئاوا، دانیشێ، ئەمە لەكاتی كەئەدەبخانە نەبی و حاجز نــەبێ بەتایبەتی لەشوێنانی چۆڵ.

٦-هەڵنەگرتنی شتی پیرۆز وەك شتێ كەناوی خوای لەسەر نوسرابێ، یــا ئایەتەكانی قورئانی لەسەر نوسرابێ لەكاتی چوونە ئاو دەستەوە

٧-دڵنیا بوون لەداخستنی دەرگای ئاودەست خانە لەكاتێكدا كەلەژووری ئاودەست خانەكەیای.

٨-خۆهەڵنەكردن و یا جل و بەرگ دانەخستنی لــەپێش ئــەوەی بگەیتــە سەر شــوێنی دەســت بەئاوگەیاندنەكــە ،لەعائیــشەوە(ڕەزای خــوای لێ بــێ ) پێغەمبەر ﷺ فەرموویــەتی (مــن اتــی الغــائط فلیــستر)رواه ابــو داود واتــە: هەریەكێ بەرەو ئاودەست خانە ڕۆیشت باخۆی ستر بكات (٣).

٩- نەڕوانین و چاو لادان لەسەیركردنی عــەورەت، چــونكە خــوای گــەورە

لەهەموو كەسێ شایستە ترە بەشەرم و حەیا لێ كردنی .

١٠- قسەنەكردن لەكاتێكدا كەلەئاودەست بیت و سەلام نەكردن و وەلآم نەدانەوەی، لەكوڕی ئیمامی عومەرەوە(ڕەزای خوای لێ بێ ) فەرمووی (مر رجل بالنبی وهو یبول فسلم علیه فلم یرد علیه) رواه مسلم واتە: پیاوێ ڕابوورد بەلای پێغەمبەر ﷺ لەوكاتەی میزی دەكرد جا سەلامی لێ كرد پێغەمبەر ﷺ وەلآمی سەلامەكەی نەدایەوە.

١١- بەپێوە میز نەكردن بۆئەوەی پرۆشكی میزت پێ نەكەوێ، لەعائیشەوە فەرموویەتی (من حدثكم ان رسول الله بال قائما فلا تصدقوه) رواه احمد واتە: ئەوەی قسەی بۆكردی كەپێغەمبەری خوا ﷺ بەپێوە میزی كردووە پێی باوەڕ مەكە.

١٢-دەست شۆرین لەپێش تارەتا بۆ ئەوەی نەبێ بەمایەی گواستنەوەی نەخۆشی هەروەها پاش تارەت دیسان دەستمان بشۆرین بەئاوو سابون .

١٣-هەوڵدەین بەدەستی چەپ تارەت بكەین و خۆمان پێ خاوێن كەینەوە، دەستی ڕاستیش بۆ نان خواردن و سەلام كردن و دۆقە كردن و كاری پیرۆز بەكار بهێنین.

١٤-دڵنیا بوون لەنەجات بوونی تەواو لەپیسایی، بەجێ گەیاندنی پاك و خاوێنی و شۆرین و تەهارەتی شەرعی.

١٥-پاك كردنەوەی شوێنی ئاودەست خانەكە بەئاو پیاكردنی، پاش بەجێ گەیاندنی قەزای حاجەت.

١٦-مامۆستایێ دەی گێڕاوە دەی گوت من لەحەقی ئەو ڕەحمەت و نیعمەتەی خوای گەورە كەنەجات بوونە لەپاشەڕۆك و پیسایی تەواو حاڵی

نەبووم، تاكو تووشی نەخۆشی مایەسیری نـەبووم كـە التهابـاتی دوا ڕیخۆڵەیـە بەمانای كۆم ،كەئەم نەخۆشیە زوو زوو تەنگاوی دەكردم كەبـچم خـۆم نـەجات بدەم، جا لەوكاتەی كەدەچووم بەوپـەڕی ئـازارو تەقـەلاّ لـەهیچ شـتێ ڕزگـارم نەئەبوو، وام لێ هات بەو پەڕی سەخڵەت و ناڕەحەتی داكـەوتم، ئەوكاتـە بـیرم دەكردەوەو دەم ووت بەخوا ئیحتماله بۆیە وام لێ هاتبێ لەكاتی لەش ساغیمدا سستیم كردبێ لەشوكرانەی خودا لەسەر ئەم ڕزگاربوونە، ئای كەسانێ كەلـەش ساغن قەدری ئەم ڕەحمەتە خوداییە نازانن، نازانن ئەگەر خودا نەجاتیان نەدات زگیان دەبێ بەعەمباری پیسایی، ئای ئەگەر ئەم جارە خـودای گـەورە چـاكی دەكردمەوە شەرت بایە شوكرانەی خودام لەبیرنەكردایە.

# ئادابی ده‌ست نوێژ

ده‌ست نوێژ مه‌رج و شه‌رتێكه بۆ به‌جێ گه‌یاندنی نوێژی دروست و ته‌واو، كه‌بریتیه له‌پاك كردنه‌وه‌ی ئه‌ندامه زاهیرو دیاره‌كان وه‌ك ده‌ست و ده‌م و چاو و باسك و پێیه‌كان، بۆ خۆئاماده كردن بۆ چوونه ناو نوێژ یه‌كێ له‌مامۆستاكان ده‌فه‌رمووێ بزانه كه‌تۆ ده‌ست نوێژ هه‌ڵده‌گری ده‌چیته زیاره‌ت و مقابه‌له‌ی په‌روه‌ردگارت جاله‌سه‌رته ته‌وبه بكه‌یت و به‌دڵ و به‌گیان بگه‌ڕێیته‌وه لای، چونكه پاك و خاوێنی له‌شی داناوه به‌ئاو كه‌پاك بێته‌وه، له‌پێش ئه‌وه‌ی كه‌پاك ببێته‌وه له‌گوناه و تاوان.

قال النبیﷺ عن الوضوء( من توضأ فاحسن الوضوء خرجت خطایاه من جسده حتی تخرج من اظفاره)رواه مسلم واته: ئه‌وه‌ی ده‌ست نوێژ بشۆری به‌باشترین شێوه، ئه‌وه گوناه و تاوان و خه‌تایه‌كانی له‌لاشه‌و جه‌سه‌دی ده‌رده‌چن هه‌تاكو له‌نینۆكه‌كان تێده‌په‌ڕن، خواپه‌رسته چاكه‌كانی پێشین هه‌وڵیان داوه هه‌رده‌م ده‌ست نوێژیان ببێ چونكه هه‌ستیان به‌به‌ره‌كه‌ت و فه‌زلی كردووه

.

## هه‌ندێ له‌خاڵه‌كانی ئادابی ده‌ست نوێژ :

١- له‌سه‌ره‌تای ده‌ست نوێژه‌كه ناوی خودا بهێنێ به‌(بسم الله الرحمن الرحیم) پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی (لا وضوء لمن لم یذكر اسم الله تعالی) واته: ده‌ست نوێژ نابێ بۆ كه‌سێ، ناوی خودای له‌سه‌ر نه‌هێنێ ،هه‌روه‌ها له‌فه‌رمایشتێكی تردا ده‌فه‌رمووێ هه‌موو شتێ یا هه‌موو كارێ ئه‌گه‌ر (بسم

الله)ی لەسەر نەكرێ دوابراووبێ بەرەكەت دەبێ(روى ابو داود غيره بسنده عن رسول الله ﷺ قال كل امرذى بال لا يبدا فيه بسم الله الرحمن الرحيم فهو اقطع) أري قليل البركة.

٢- بێ دەنگی و ئامادەبوونی دڵ و نیەت هەبوون، لەوكاتەی كەدەست نوێژەكە دەشۆی تاكو دەست نوێژەكە تەواو دروست بی و لەخێرو بێرو ڕەحمەتەكە بێ بەش نەبێت.

٣- بەكارهێنانی دار سیواك لەكاتی دەست نوێژ شوشتنەكانا، چونكە مایەی پاك و خاوێنی دەم و زارە و مایەی ڕەزامەندی خوای پەروەردگارە، لەئەبو هورەیرە گێڕدراوەتەوە كە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (لولا ان اشق علی امتی لأمرتهم بالسواك مع كل وضوء) رواه البخاري واتە: ئەگەر مایەی ئەزیەت و مەشەققەت نەبایە لەسەر ئۆممەتەكەما ئەوا فەرمانم پێ دەكردن كەسیواك بەكار بهێنن لەگەڵ هەموو دەست نوێژەكانا ،لەم فەرموودەیەوە دەردەكەوێ كەئیسلام چەند گرنگی داوە بەپاك و خاوێنیەوە و چەند گرنگی داوە بەلادانی ئەزیەت و مەشەققەت لەسەر موسڵمان.

٤- قسەو پێكەنین نەكردن و دەست گەمەو یاری و سوحبەت نەكردن لەكاتی دەست نوێژ شوشتندا.

٥-دەست شۆرین و ئاو لەدەم وەردان و یابلێین دەم و لوت ئاو تیا ڕامالین سێ جار، هەروا گوێ پاك كردنەوەو مەسح كردنی دیوی ناوەوەو دەرەوەی، پاشان شۆرینی روخسار ئاو پیا جاری كردنی سێ جار پاشان شۆرینی باسكەكان تا ئەنیشك و سێ جار ئاو پیاجاری كردنی، پاشان مەسحی سەر بكەین كەبریتیە لەدەست تەڕكردن دوای داهێنانی بەبەشێك لەسەرمان، ئەوسا

شۆرینی هەردوو پێ بەگۆزینگەکانیشەوە بەشێوەیەکی چاك و پاك وخاوێن وهەولّدەین زیاتر لەشوێنی واجبەکەی بشۆرین.

عن ابی هريرة ان الرسول(ص)قال (الا ادلكم على ما يمحو الله به الخطايا ويرفع الدرجات قالوا بلى يا رسول الله ،قال اسباغ الوضوء على المكاره وكثرة الخطى الى المساجد وانتظار الصلاة بعد الصلاة فذلكم الرباط فذلكم الرباط) رواه مسلم واتە: لەئەبو هوریرەوە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی، ئایا کارێکتان نیشان بدەم، کەببێ بەمایەی ئەوەی خوای گەورە گوناهەکانتان پێ ڕەش بکاتەوە پلەو پایەتان پێ بەرز بکاتەوە؟ ووتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، فەرمووی دەست نوێژ شۆرینی چاك و پاك و پوختە و زۆر هاموشۆکردنی مزگەوت و چاوەڕوان کردنی نوێژ لەدوای نوێژ، بەوەی پێشی بانگدان ئامادەبێ لەمزگەوتدا، ئائەمە بۆ ئێوە ریباتە ئائەمە بۆ ئێوە ریباتە، واتە وەك سوارێکی چاك و باشە کەجیهادو تێکۆشانی پێ بکەیت لەپێناو ڕێگەی خوادا یا بلّێین ئەمە مایەی بەرزی و پیرۆزیەو پەیوەندبوونێکی پتەو باشە لەگەڵ پەروەردگارە.

٦- ئاو پیا بەسەربردنی هەموو بەش و ئەندامەکانی کەپێویستن بشۆرێن بەشێوەیەکی چاك و پاك نەك شۆرێنی بەشێکی و پشت گوێ خستنی بەشەکەی تر، یا شۆرینی هەندێك و پاشان بەدەست تەڕایی ئەو شوێن بەشوێنی تری نەشوراو دەستی پیا بخشێنێ وەدڵنیا بوون لەئاو جاری کردن بەسەر پێست وتەواو تەڕکردنی، دەست پیا هێنانی لەگەڵ ئاو پیاکردنی بۆئەوەی بەچاکی و پاکی تەڕ ببی و خاوێن ببیتەوە، هەروەها ناوبەینی پەنجەکانی دەست و پێ، دەبێ ئەوشوێنانەش بەجوانی بشۆرین، لەئەنەسەوە پێغەمبەر ﷺ دیتی پیاوێ پێی خۆی بەجوانی نەشۆریبوو پێی فەرموو(بگەڕێوە دەست نوێژەکەت جوان بشۆرە)ئیمامی ئەبوداود و نەسائی ڕیوایەتیان کردووە.

٧- دوعای پاش دەست نوێژ فەرامۆش نەکەین ،لەئیمامی عومەرەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (هەریەکێ لەئێوە نیە دەست نوێژێکی باش بشۆرێ پاشان لەدەست نوێژەکەی بوەوەو بڵێ (اشهدان لا الە الا اللە وحدە لاشریك لە واشهد ان محمد عبدە ورسولە اللهم اجعلنی من التوابین واجعلنی من المتطهرین) ئیللا هەرهەشت دەرگاکانی بەهەشتی بۆدەکرێتەوە، تاکو پێی بچێتە ژوورەوە بەهەرکامیان کەخواستی لێیەتی) ئیمامی ترمذی ریوایەتی کردووە .

٨- سوننەتە لەپاش هەردەست نوێژ شۆرینێکا، دوورکعات نوێژی سوننەتی دەست نوێژ بکەیت ئەگەر نەکەوتبێتە کاتی نوێژی راتبەکان (کەنوێژە سوننەتەکانی بەرو دوای نوێژە واجبەکانن) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (هەریەکێ لەئێوە دەست نویژێك بشۆرێ پاشان دوو ڕکعات نوێژی سوننەت بکات بەبێداری هۆش و بیرەوە و بەئاگایی دڵ و هەستەوە ئیللا شایستەی بەهەشت دەبێ).

٩- سێ بارە جاری کردنی ئاو بەسەر ئەندامەکانی کەشایستەن بۆ شۆرین لەدەست نوێژا، سوننەتە بەلاّم زیاتر نەء مادام پێویست نەکات، چونکە دەبێ بەمایەی ئیسراڤی ئاو، پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ نەهی لێ کردووە، وەك فەرموویەتی ئەوەی لەسێ مستە ئاوی زیاتر بەدەم و چاوی دابکات لەدەست نوێژەکەیا، ئەوە زیادە ڕەوی کردیە لەئاو سەرف کردنا[4].

١٠-هەوڵبدەین دەست نوێژەکانمان بپارێزین، خۆمان دوور بگرین لەبێ دەست نوێژی لەهەموو کات و ساتێکا، لەئەنەسەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (ان استطعت ان تکون ابدا علی وضوء فافعل) واتە ئەگەر

[4] ئەگەر بەسێ مستەئاو خاوێن نەبۆوە، پێویستە بەر لەدەست نوێژ شوشتن، بێ نیەت هێنان چلکەکە خاوێن بکاتەوە ئینجا دەست نوێژ هەلْگرێت.

دەتوانیّ بەهەمیشەیی دەست نویّژت بیّ و دەست نویّژ بشۆری ئەمە خۆت بیّ دەست نویّژ مەهیّلّەوە، دیارە ئەمڕۆ الحمدلله ئاو زۆرەو باهەولّدەین بەهەمیشەیی دەست نویّژمان بیّ، جارلەدوا جار بیشۆرینەوە بابەدەست نویّژەوە هەردەم زمانمان تەڕ بیّ بەویردو یادی خودا، ڕیّ لەچی ناگری و مایەی پیرۆزی و بەرزییە، پەشیمانی و نەدامەتی هەرگیز بەدوادانایی، لەكتابی (التذهیب متن الغایة والتقریب) لەفیقهی الشافعی دا كەدكتۆر(مصطفی نوسیتیەوە) داهاتووە لەبارەی فەرزەكانی دەست نویّژ و سوننەتەكان، فەرزەكانی دەست نویّژ شەشن.

١- النیە:نیەت هیّنان لەكاتی دەم و چاو شۆرینا.

٢- روخسار شۆرین.

٣- شۆرینی دەست تاكو ئەنیشك.

٤- مەسح كردنی بەشیّك لەسەر.

٥- شۆرینی پیّیەكان تا گۆزینگەكان.

٦- یەك لەدوای یەكی ئەوخالانەی باس كران بەشیّوەیەكی تەرتیب و ڕیّك، بەجیّ نەگەیاندنی خالیّ لەم خالانە، دەبیّتە هۆی دانەمەزراندی دەست نویّژەكە.

## هەروەها سوننەتەکانی دەست نوێژ( ١٠ )سوننەتن :-

١- ناوی خودا هێنان وەك بڵێین بسم الله الرحمن الرحم.

٢- شۆرینی هەردوو دەست پێش ئەوەی بخەیتە ناو ئاوی جامەکەی کەدەست نوێژی پێ دەشۆریت.

٣- ئاو لەدەم وەرکردن (المضمضة).

٤- ئاو لەلوت وەردان یالوت شۆرین (مەبەست لەناوەوەی) (الاستنشاق).

٥- مەسح کردنی یا دەست هێنان بەتەڕی بەسەر هەموو سەردا،واتە مەسح کردنی گشت سەر.

٦- مەسح کردنی (دەست تەڕ پیا هێنان) بەگوێچکەکانا بەناوەو بەدەرەوەیدا.

٧- دەستی تەرهێنان و بردن بەناو ڕدێنیٚ ئەگەر زۆر هاتبیٚ.

٨- دەست تەڕ هێنان بەناوبەینی پەنجەکانی دەست و پێیدا.

٩- پێش خستنی ڕاستە لەپێش چەپە لەشۆریندا.

١٠- سیٚ بارە کردنەوەی شۆرینەکان لەسەریەکا.

١١- یەك لەدوای یەك شۆرین پێش ئەوەی ووشك ببێتەوە واتە بەین نەخستنیان بەکات و سات.

### ئەوشتانەی دەست نوێژ دەشکێنن و بەتاڵی دەکەنەوە شەش شتن:-

١- دەرچوونی هەرشتێ لەهەردوو ڕێگای پێشەوەو پشتەوە(ماخرج من السبیلین)

٢- نوستن (ئەگەر شێوەی دانیشتنێ نەبێ وەك کورسی هاو وێنەی).

٣- لاچوونی عەقل و ژیری بەسەر خۆشی یا نەخۆشی.

٤- دەست لێدان ژن و پیاو لەیەکتر، واتە لەوانەی دەست نوێژیان لێك دەشکێ.

٥- دەست دان لەفەرجی ئادەمیزاد بەناو لەپی دەست.

٦- دەست دانە بازنەو حەڵقەی شوێن پیسایی دەرچوون واتە کۆم.

## ئادابی نوێژ

نوێژ کۆڵەگەی دینە، ئەوەی بەچاکی ئەنجامی بدات، ئەوە دینی ڕاگرتووە، ئەوەی تەرکی بکاو وازی لێبهێنێ ئەوە دینی خۆی خاپور کردووە ،نوێژ عیبادەتێکە ڕۆژانەیە بۆهەموو موسڵمانێ، موسڵمان تێیدا ووتوێژ لەگەڵ پەروەردگاری دەکات لەهەر ڕۆژێکدا پێنج جار، مایەی پیرۆزی و پاکی و بەرزیەتی، خۆراکی ڕوح و گیانیەتی،دەرمانی دڵ و دەروونیەتی،ڕێگای پەیوەندی و دۆستایەتیە لەگەڵ پەروەردگاری بێ نیاز، جێگەی نیازو ئاواتی هەموو مەخلوقێکە، ئەو زاتە پاك و بەرز بێ گەردە، بۆیە ئاوا هەموو مەخلوقێ لەیادیا سەری کڕنۆشی بۆ دادەنوێنێ و شوکرانەو ستایشی دەکاو لەبەریا دەپاڕێتەوە، وەك لەکتێبە پیرۆزەکەیدا هاتووەو دەفەرمووێ أَلَمْ تَرَ أَنَّ

ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلطَّيْرُ صَٰٓفَّٰتٍ ۖ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسْبِيحَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٤١﴾ (النور٤١) واته: ئایا نابینیت و تیّ ناگەیت و نازانیت، هەرچی خاوەن هۆش و بیروعەقڵە جا چ لەئاسمانەكان بیّ چ لەزەوی، گشتیان وان لەتەسبیحات و یادی خودان، هەروەها باڵندەكان كەبەلێك كردنەوەی باڵەكانیان، لەئاسمانا ئەوانیش وا لەتەسبیحات و ستایشی خودادان، هەر گشتیان نوێژو بەندایەتی و عیبادەتی خۆیان دەزانن، خودای شكۆمەند زانایە بەو كارو كردەوانەی كەدەیكەن،كەواتە نوێژ كارو بەندایەتی هەموو هۆشیارو بێدارانە هەموو بەدیهێنراویّ سەرگەرمی ئەنجامدانیەتی تەنها بیّ باوەڕو كافرانی ئینس و جن نەبیّ .

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ( اول مایحاسب علیه العبد یوم القیامة الصلاة وان صلحت صلح سائر عمله وان فسدت فسد سائر عمله)الطبرانی واتە: یەكەم شتیّ كەئادەمیزادی لەسەر محاسبە بكریّ نوێژە، جا ئەگەر نوێژەكانی ڕاست و درووست و بەجیّ بوون ئەوە هەموو كاروكردەوەكانی چاك و دروست و ڕێك دەبیّ، وەئەگەر نوێژەكانی خراپ و نا بەجیّ و فاسد بوون ئەوە هەموو كارەكانی خراپ و بیّ جیّ و ناپەسەند و فاسید دەبیّ ...ئیمامی تەبەرانی گێڕاویەتیەوە.

ئاخیرو دوا وەصیەت و ئامۆژگاری پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لەسەرە مەرگا دەی فەرموو: ئاگاتان لەنوێژەكانتان بیّ ئاگاتان لە نوێژەكانتان بیّ (الصلاة الصلاة وما ملكت ایمانكم) هەروەها ئاگاتان لەكەسانیّ بیّ كەلەژێر دەستتانن وەچاویان لەچاكەو خێری ئێوەیە...)

ڕیوایەت كراوە ئیمامی عەلی (سەلامی خوای لیّبێت) لەوكاتەی كەكاتی

نوێژ دەهاتە پێشەوە، دەلەرزی و ڕەنگێکی دەیناو ڕەنگێکی دەبرد، پێیان ووت ئەوە چیتە ئەی ئەمیری خاوەن باوەڕان؟ دەی فەرموو کاتی ئەمانەت هات ئەوئەمانەتەی ئاسمانەکان و زەوی و چیاو شاخەکان لەوکاتەی خودای گەورە پیشانی دان و عەرزی کردن هەڵیان نەگرت و پشتیان تێ کردو لێی ترسان .

جا بەڕاستی هەرچەند باسی گەورەیی نوێژ بکەین، ئەوە کاتێکی زۆری دەوێ لێی نابینەوە، وەحەقی باسەکەشمان بەتەواوی پێ نادرێ، وەئەو کەسانە لەهەموو کەس باشتر لێی حاڵی دەبن کەبەهەرەمەند بووینە بەنوێژو تام و شیرینی ئیمانیان لەرێگەیا نۆشتووە.

هەندێ لەخاڵەکانی ئادابی نوێژ:

١- پێشوازی کردن لەنوێژ بەسینەیەکی فراوان و دڵ خۆشی و خۆشەویستیەوە بەعەزم و جەزم و بەنەشات و گورج و گۆڵیەوە بەرەو گفتوگۆ لەگەڵ خودا بینەوەو بە ئاوات و ئومێدو مەبەستەوە ڕووی تێ بکەین.

٢- خۆڕێکخستن و جوان کردن و پیسی و پۆخڵی لەخۆ دوور خستن و بێ تاقەتی لەخۆلادان و خۆ دوورگرتن لەشل و شەوێتی، وەك خودای گەورە دەفەرمووێ ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٍ ﴾ (الاعراف ٣١) واتە: ئەی ئادەمیزاد خۆت ڕێك و پێك و جوان بکە لەوکاتانەی کەدەچیتە مزگەوت، تاکو موسڵمانان بەچاك و پاك و هۆشیارو ڕەوشەن بیر، بکەونە بەرچاوی خەڵکانی تر، نەك بەشێوەیەکی نارێك و جل و بەرگی پیس و پەرۆخ کەپێچەوانەی ئایین و تەبع و سروشتی مرۆڤە .

٣-بیرو هۆشی خۆمان صاف بکەینەوەو هەرچی هەمانە لەپێداویستی هەمە چەشنە، کەمایەی دڵ و مێشك گرتنە لەخۆمانی دووركەینەوە، بەدڵ و

هۆشـێکی صـاف و بـیٚ گـەردەوە نوێـژەکانمان ئـەنجام بـدەین ، لەعائیـشەوە فەرمووی گوێم لیٚ بوو لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەی فەرمەوو (لا صلاه بحضرة الطعام ولاهو يدافعه الاخبثان)رواه مسلم .

واتە :نوێژ مەکەن لەکاتێکا کە خواردن ئامادەیـەو تـۆش برسـی و چـاو هۆش و بیرت لیٚ یەتی وەیا لەو کاتەی کەتـەنگاویت بـۆ ئـەوەی بـچیتە سـەر پێشاو چونکە ئەم کارانە والەئادەمیزاد دەکات بیرو هۆشەکەی لەنوێـژ نـەبیٚ و وەبەپەلە ئەنجامی بداو لەکۆلە خۆی بکاتەوە.

٤- پاراستنی بیٚ دەنگی و غەلبە غەلب نەکردن و رانەکردن و خۆتەنگاو و نارحەت نەکردن لەکاتێکا کەبەرەو نوێژ دەچیت، ئەگەر واش حالی بیـت لـە نوێژی جەمەعاتدا دوا دەکەوی، بەلکو دەبیٚ بەویقارو رێـز حورمەتـەوە رووە و نوێژ کردن بـچیت، لەئـەبو هـورەیرە (رەزای خـوای لیٚ بـیٚ) فـەرمووی گـوێم لەپێغەمبەری خودا بوو ﷺ دەیفەرموو (اذا اقيمت الصلاة فلا تاتونها وانتم تسعون وعليكم السكينة فما ادركتم فصلواوما فاتكم فاتموا) متفق عليه واتـە : کاتی کەقامەت کرا ئیوە بەراکردن و خۆتـەنگاو کـردن بـەرەو نوێـژ نەیـەن، بەلکو نێوە بەرۆیشتنی عادەتی ئیعتیادی خۆتان بـەدلنیایی و همێنـی بـەرەو نوێژ وەرن جا لەکوێندەر بەنوێژەکـە راگەیـشتن ئـەوە راگەیـشتن ئەگـەر بەشـیٚ لەنوێژەکە پیٚ ی رانەگەیشتن، ئەوە پاش سەلام دانەوەی ئیمام ئیوە هەلـسنەوە تەواوی بکەن .

٥- چوونە ناو نوێژ بەدل و هۆش و بێداری و هەسـت و نەسـتەوە لەگـەل خودادا بدوێن ،خشوع و تەوازوع و مل کەچـی لەخۆمانـدا دابنێـنین، وەپـەل و پۆیەکانمان لەدەستەکان و قاچەکان نەجولێنین بەشـێوەیی مانـای رێـزو ویقـارو

ئەدەب و مل كەچی و خشوع تێك بدات ناشیرینی بكات ،چونكە سێ جار جوولە بكەوتە هەر رەكاعەتێكا ئەوە نوێژەكەی بەتاڵ دەبێتەوە .

٦- خۆ لادان لەئاور دانەوەو پێكەنین و گەمە و یاری یاهەر جولەێی تربێ كەلەگەڵ نوێژدا نەگونجێ لەعائیشەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پرسیارم لە پێغەمبەری خودا كرد ﷺ لەبارەی روو كردنە ئەم لاو ئەولا لەنوێژا فەرمووی (ئەوە لەشەیتانەوەیە شەیتان دەیەوێ بەشێك لەنوێژی موسلمانی بەندە بدزی و لێ ی پربداتێ و بیفرێنێ) رواه البخاري .

٧- دەبێ لەنوێژدا سەیری جێگەی سوجدەو كرنوشمان بكەین نەك تەماشای ئاسمان یا ئەم لاو ئەولا بكەین)

٨- پێویستە عەقل و ژیریمان لەگەڵ هۆش و فیكرو بیرمان لەمانای ئایەتەكان و زیكرەكانی ناو نوێژا بێ، ئەوەی مانای نازانین بەزووترین كات ماناكەی خۆمان فێر بكەین و بپرسین مانای چی یە .

٩- ئیتمئنان و دلنیا بوون لەبەجێ گەیاندنی رەكەعاتەكانی نوێژ خۆ دوور بگرین لەوەی پەلەو بكەین لەرەكەعاتەكان و یا لەروكوع و سەجدەكاندا .

١٠- تا بۆمان دەكرێ كۆخەو باوەشك و پشمین (قرپ و ئحەئح و هتد )لەخۆمان دوور بگرین .

١١- هەولدان لەبەجێ گەیاندنی نوێژەكان لەسەرەتای كاتەكانی هاتنیان (ئەنجامیان بدەین) وە دوا نەخستنیان بەبێ عوزرو بیانو و هۆ ،یا لەبەر تەمبەلی و كەمتەرخەمی .

١٢- دانیشتن لە مزگەوتا یا لەماڵەوە لەسەر بەرماڵەكە لەپاش تەواو بوونی نوێژەكە، بۆ زیكرو دوعا كردن .

له‌مه‌عازه‌وه (ره‌زای خوای لیّ بیّ) پیّغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌ستی گرتووه پیّ ی فه‌رموو (یا معاذ والله انی لأحبّك ثم قال اوصیك یا معاذ لاتدعن فی دبر كل صلاة تقول: اللهم اعنی علی ذكرك و شكرك وحسن عبادتك) رواه ابو داود والنسائي واته: ئه‌ی مه‌عاز قه‌سه‌م به‌خوا خۆشم ده‌ویّ ی پاشان پیّ ی ووت ئامۆژگاری و وه‌صیه‌تیّكت ده‌كه‌م ئه‌ی مه‌عاز دوعاییّ بكه‌، له‌ پاش هه‌ر هه‌موو نویّژه‌كانا بلیّ :په‌روه‌ردگارا یارمه‌تیم بده له‌سه‌ر زیكرو شوكرانه‌ت و به‌ندایه‌تی جوان و چاك و به‌جیّ.

١٣- سوننه‌ته كه‌نویّژه‌كه‌ت ئه‌نجام دا مانای نویّژ له‌بیرو هۆش فه‌رامۆش نه‌كریّ، به‌لكو به‌هیواو ئومیّدو چاوه‌روانی نویّژی داهاتوو بیت

١٤- ئه‌و نویّژه سوننه‌تانه‌ی (راتبه‌ن) له‌پیّش و پاشی نویّژه واجبه‌كان پیّویسته ئه‌نجام بدریّن پاریّزگاری یان له‌سه‌ر بكریّ، چونكه شوره‌و سیاجن بۆ نویّژه واجبه‌كان و مایه‌ی زیاده نزیك بوونه‌وه‌یه له‌ره‌حمه‌تی خودای گه‌وره، له‌رمله‌ی كچی ئه‌بو سوفیان (ره‌زای خوای لیّ بیّ) فه‌رمووی گویّم له‌پیّغه‌مبه‌ری خوا بوو ﷺ ده‌ی فه‌رموو (مامن عبد مسلم یصلی لله تعالی كل یوم اثنتی عشرة ركعة تطوعا غیر الفریضة الابنی الله بیتا فی الجنة ) رواه مسلم واته: هه‌ر به‌نده‌ییّ موسلمان له‌هه‌ر رۆژیّكا دوانزه ره‌كه‌عات نویّژ بۆ خودا بكات بیّجگه له‌نویّژه واجبه‌كان، ئیللا خوای گه‌وره كۆشكیّكی له‌به‌هه‌شتدا بۆ دروست ده‌كات ،ئیمامی موسلم ریوایه‌تی كردووه.

١٥-هه‌ولّدان بۆ نویّژكردن به‌جه‌ماعه‌ت له‌نزیكترین مزگه‌وتدا، قال رسول الله ﷺ (صلاة الجماعة افضل من صلاة الفذ بسبع وعشرین درجة)متفق علیه واته: نویّژی به‌جه‌ماعه‌ت باشتره له‌نویّژی ته‌نیایی به‌بیست و حه‌وت

دەرەجەو پلە .

١٦-بەدەست هێنانی بەروبوومی نوێژەکان لەزیکری خودای گەورە بەبەردەوامی و وەهەست کردن بەموراقەبەو چاودێریتی خوداو هەمیشە لێ ترسانی و، وەوازهێنان لەکاری فاحیشەو نارەوا چ بەووتار چ بەکارو کردار، چونکە نوێژی تەواو وەك خوای گەورە پێناسەی دەکاو دەفەرمووێ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴿٤٥﴾ (العنكبوت ٤٥) واتە: نوێژ بەتەواوی ئەنجام بدەن چونکە بەڕاستی نوێژ ئادەمیزادی دوور دەگرێ لەکاری فاحیشەو نارەوا .

هەروەها پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرمووێ (من لن ينهى صلاته عن الفحشاء والمنكر لم يزدده عندالله الا بعدا) واتە: ئەوەی نوێژەکەی لەکاری فاحیشەو مونکەرو کاری نابەجێ و ناپەسند دووری نەخاتەوە، ئەوە هیچی بۆ لەلای خوای بێ هاوتا زیاد ناکات، تەنها دووری و ڕووڕەشی خەجاڵەتی نەبێ.

باسەرێکیش لەکتێبی فیقهی بدەین لەکتێبە فیقهەیەکانی ئیمامی شافعی جا باتەماشایەکی (التهذيب) بکەین کەدانراوی دکتۆر (مصطفى)یە بزانن لەبارەی شەرت و ئەرك و سوننەتەکانی نوێژ چی دەفەرمووێ .

## شه‌رت و مه‌رجه‌كانی واجب بوونی نوێژ سێ شتن:-

**یه‌كه‌م:** الاسلام واته ده‌بێت مسولمان بێـت، كه‌واتـه داوانـاكرێ لـه‌سـه‌ر غه‌یری موسڵمانان.

**دووه‌م:** البلوغ ده‌بێ بالغ بووبێ، كه‌واته له‌سه‌ر منداڵی بچوك واجب نیه باشتروایه له‌حه‌وت ساڵیه‌وه منداڵ ڕابێنی له‌سه‌ر نوێژ كـردن وه‌ك له‌فـه‌موده‌دا واهاتووه، له‌ده ساڵی كه‌مێ ئازاری بده‌ی له‌سه‌ر نوێژ نه‌كردن.

**سێ یه‌م:** العقل پێویسته عاقل و ژیرمه‌ند بێ، كه‌واته له‌سه‌ر شێت و بێ عه‌قلان واجب نیه داوایان لێ ناكرێ.

## شه‌رته‌كانی پێش چوونه ناو نوێژ پێنج شتن:-

**یه‌كه‌م:** پاك و خاوێنی ئه‌ندامه‌كانی له‌ش له‌بێ ده‌ست نوێـژی بـچووك و گه‌وره.

**دووه‌م:** له‌خۆلادانی پیسی و پۆخڵی.

**سێ یه‌م :** ستری عه‌وره‌ت مه‌به‌ست داپۆشینی عه‌وره‌ته(بـه‌جل و بـه‌رگی پاك و خاوێن)كه‌له‌پیاو به‌ینی چۆك و ناوكیه‌تی، به‌نیـسبه‌ت ئـافره‌ت هـه‌موو له‌شیه‌تی، ته‌نها هـه‌ردوو ده‌سـته‌كانی نـه‌بێت له‌گـه‌ڵ ده‌م و چـاوی ڕاوه‌سـتان له‌شوێنێكی پاك و خاوێن بۆ نوێژ كردن

**چواره‌م:** زانیاری دڵنیاو ته‌ئكید بوون به‌هاتنی كاتی نوێژه‌كه.

**پێنجه‌م:** ڕووكردنه قیبله ده‌توانیت ڕوو له‌قیبله نه‌كه‌یت لـه‌دوو كاتـدا، له‌كاتێكدا تـرس زۆر له‌ئارادایـه له‌مه‌یـدانی جـه‌نگ و جیهـادو تێكۆشـانا و

لەكاتی چوونە سەفەر بۆ نوێژی سوننەت تۆش سواری ولاغی یا ئۆتۆمبێلی .

ئەركەكانی نوێژ بریتین لەم خالآنەی خوارەوە:-

١-نیەت هەبوون واتە (النية)دەبێ لەگەڵ (الله اكبر) نوێژ دابەستنا بێت، ئەوەت لەدلأبێ كەتۆ ئەوە ئەو نوێژە دەكەیت.

٢-ڕاوەستان بەپێوە بۆ ئەوكەسەی توانای ڕاوەستانی هەبێ .

٣-تكبیرەی ئیحرام واتە:(الله اكبر)كردنی نوێژ دابەستن كەلەسەرەتا دەست پێ دەكات.

٤-خوێندنەوەی سوڕەتی (الفاتحة) وە بەمانای سوڕەتی (الحمد)یش هاتووە (بسم الله الرحمن الرحيم)یش ئایەتێكە لەو سوڕەتە.

٥-ڕكوع بردن و دڵنیا بوون تێیدا.

٦-سەر بەرزكردنەوە لەڕكوع و ڕاست بوونەوەو دڵنیابوون لەم ڕاوەستانە (پاش سەر بەرزكردنەوە لەركوع دا).

٧-سوجدە بردن و دڵنیا بوون تێیدا.

٨-دانیشتن لەبەینی دوو سوجدەدا واتە پاش سوجدەی یەكەم سەر بەرز دەكەیتەوەو دادەنیشی تا دڵنیا دەبی لەدانیشتنەكە پاشان دیسان دەچیتەوە بۆ سوجدەی دووەم.

٩-دانیشتنی ئاخیرو كۆتایی.

١٠-(التشهد)واتە(التحيات) خوێندن.

١١-الصلاة علی نبیﷺ واتە صەلاوەت لێدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لەكۆتایی (التحيات)ەكە.

١٢-سەلام دانەوەی یەكەم بەلای ڕاستەدا.

١٣-نیەتی كۆتایی نوێژەكەو تیا دەرچوونی.

١٤-تەرتیبی ئەركانەكان واتە یەك لەدوای یەكیان بەوشێوەیەی كەباسمان كرد.

## سونەتەكانی پێش چوونە ناونوێژ دوو شتن:

**یەكەم:** بانگدان

**دووەم:** قامەت كردن.

پاش چوونە ناو نوێژەكە دووشتی تریش سوننەتن :

تەحیاتی یەكەم و قنوت خوێندن لەنوێژی بەیانی لەپاش هەڵسانەوە لەڕكوعی دووەم ...ولەنوێژی سوننەتی ویتر لەپاش نیوەی مانگی ڕەمەزان...یان لەكاتی مەترسی و گێچەڵ و بەلاّ .

هەیئاتەكانی نوێژ پازدە خەصڵەتن:

١-هەردوو دەست بەرز كردنەوە تاكو نەرمەی گوێچكەكان لەكاتی (الله اكبر)ی نوێژ دابەستن وەلەكاتی چوونە ڕكوع وەلەكاتی هەڵسانەوەی لەڕكوعا، وەدانانی دەستی ڕاست لەسەر چەپا لەبەینی ناوك و سینگدا، خوێندنی ئیفتتاحی نوێژ كە بریتیە لەخوێندنی (وجهت وجهي للذي فطر السموات والارض حنيفا....الخ) و (اعوذ بالله من الشيطان الرجيم) خوێندن لەپێش فاتیحەو دەنگ بەرزكردن بۆ ئیمام لەڕكاعەتەكانی یەكەم و دووەمی نوێژەكانی مەغریب و عیشاو بەیانی ...وەدەنگ بەرز نەكردن لەنوێژەكانی نیوەڕۆو عەسردا ...وگوتنی ئامین كردن لەكۆتایی سورەتی الفاتحە و الله اكبر كردن لەكاتی چوونە ڕكوع و سوجدەدا وەلەكاتی هەڵسانەوە لێیاندا، وەخوێندنی (

سمع الله لمن حمده ربنا لك الحمد)له‌كاتی هه‌ڵسانه‌وه له‌ڕكوعدا، خوێندنی (وسبحان ربي العظيم وبحمده) له‌ڕكوعدا وه(سبحان ربی الاعلی)خوێندن له سوجده‌دا.

دانانی هه‌ردوو ده‌ست له‌سه‌ر ڕانه‌كانی له‌كاتی دانیشتندا له‌ته‌حیاتا جا ڕاخستنی ده‌ستی چه‌په به‌كراوه‌یی له‌سه‌ر ڕانی چه‌په‌وه، ڕاخستنی ده‌ستی ڕاست به‌شێوه‌ی قوچاندن په‌نجه‌ی شایه‌دمان نه‌بێ، كه‌مایه‌ی ئاماژه‌كردن بێ له‌كاتی شایه‌دمان هێنان له ته‌حیاتدا، دانیشتنی به‌شێوه‌یه‌كیوا كه‌پێیه‌كان له‌بنه خۆدا ڕابێخی له‌ته‌حیاته‌كانا كه (ئیفتراشی)پێ ده‌ڵێن ، هه‌روه‌ها له‌دانیشتنی ته‌حیاتی كۆتایی به‌شێوه‌ی (التورك) داده‌نیشی كه‌بریتیه له‌بردنه ده‌ره‌وه‌ی پێی چه‌په له‌بن لاقی ڕاسته و گه‌یاندنی نه‌رمایی سه‌ره‌وه‌ی ڕان به زه‌ویه‌وه .

## پێویسته بزانین ئافره‌ت له‌گه‌ڵ پیاودا جیاوازن له پێنج شتا :

پیاوپاسك و قۆڵه‌كانی له‌ته‌نیشته‌كانی جیاده‌كاته‌وه، واته نای نوشتێنێ به سینه‌و به‌ده‌نیه‌وه له‌كاتی ڕكوع و سوجده‌دا وزگی خۆی جیاده‌كاته‌وه نای‌نوشتێنێ به‌ڕانه‌كانی له‌كاتی ڕكوع و سوجده و ده‌نگ به‌رز ده‌كاته‌وه‌و ئاشكرای ده‌كا له‌شوێنانی كه‌سوننه‌ته ئاشكرابكرێ وه‌ك باسمان كرد وه‌ئه‌گه‌ر له‌نوێژدا تووشی شتێك بوو وه‌ك هه‌ڵه‌ی ئیمام بێ یاشتی تر، ده‌ڵێ سبحان الله عه‌وره‌تی پیاو به‌ینی ناوك و چۆكه‌كانیه‌تی، به‌لاّم به‌نیسبه‌ت ئافره‌ت ئه‌ندامه‌كانی له‌شی به‌یه‌كه‌وه ده‌لكێنێ له‌كاته‌كانی ڕكوع و سوجده‌داو ده‌نگی هه‌ڵناهێنێ له‌نوێژه جه‌هریه‌كاندا (واته ئه‌و نوێژانه‌ی ده‌نگ ئاشكرا كردنی تیا

سوننەتە )بە ئامادەبوونی پیاوی بێگانە (مەبەست لەو کەسانەیە کەدەست نوێژی لێ بشکێ ) و ئەگەر لەنوێژدا تووشی شتێ بوو وەك ڕاست کردنەوەی هەڵەی ئیمام یان شتانی تر پێویستە چەپڵە لێ بدا بەدەستی ڕاست لەپشتی دەستی چەپی بدات بۆ بێدارکردنەوەی ئیمام لەسەهو و هەڵەکەی و هەموو لاشەو بەدەنی عەورەتە تەنها دەستەکانی و دەم و چاوی نەبێ .

## ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە، ئەم خاڵانەی خوارەوەن :-

١-قسەکردن بەشێوەیەکی قەصدو مەبەست و عەمدی.

٢-زۆر جووڵەو ئیش و کاری زۆر، کەدەبێتە مایەی تێك دانی نیزامی نوێژ.

٣-بێ دەست نوێژ بوونەوە، واتە دەست نوێژ شکان لەکاتی نوێژدا.

٤-ڕوودانی یان دەرکەوتنی پیسایی و پیس و چەپەلی.

٥-دەرکەوتن و ئاشکرابوونی عەورەت لەکاتی نویژ کردندا.

٦-گۆڕانی نیەت، بەکافر بوونەوەی بێ یا بەنەکردنە نوێژەکەی بێ یا بۆ ڕیازەو وەرزش بێ .

٧-ڕوو وەرگێڕان لەقیبلەو پشت تێ کردن .

٨-خواردن و خواردنەوە لەکاتی نوێژ.

٩-پێکەنین و قەه قەهە.

١٠-هەڵگەڕانەوەو ڕەت بوونەوەی لەئایین و دینا واتە مورتەد بوونەوەی.

# ئادابی نان خواردن :

خوارده‌مه‌نیه پاكه‌كان به‌هه‌موو جۆرو نه‌وعیانه‌وه ڕه‌حمه‌ت و نیعمه‌تێكی زۆر گه‌وره‌ی خودایه، له‌هه‌مان كاتیشدا دیارده‌ی گه‌وریی زانای خوای تاك و پاك و بێ هاوتایه، هه‌روه‌ها نیشانه و ئایه‌ت و به‌ڵگه‌ی زۆرن له‌سه‌ر ده‌سه‌ڵاتی بێ پایانی خودای كارزان و كارله‌جێ و داناو حه‌كیم، خودای هه‌میشه زیندوو بالآده‌ست سه‌رنجی ئاده‌میزاد ڕاده‌كێشێ كه‌بڕوانێ به‌لای ده‌وروو به‌ریا و به‌لای كه‌ون و بونه‌وه‌را به‌لای خواردن و خواردنه‌وه‌یا، به‌لای ئاووهه‌واو یا باوو باران بروسكه‌و گرمه‌گرمی....هتد.ئه‌وه‌ش بۆ ئه‌مه‌یه تاكو ئاده‌میزاد بگه‌ڕێته‌وه‌و وورد بێته‌وه له‌واقعی خۆی و ده‌ورو به‌ریاو خۆی بیربكه‌وێته‌وه كه‌كێیه وه‌بۆكێ ڕۆیشتووه، خوای گه‌وره ده‌فه‌رمووێ ﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَىٰ طَعَامِهِ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴿٢٨﴾ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴿٢٩﴾ وَحَدَائِقَ غُلْبًا ﴿٣٠﴾ وَفَاكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ مَّتَاعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ ﴿٣٢﴾﴾ (عبس ٢٤-٣٢) واته: با ئاده‌میزاد بڕوانێ و وورد بێته‌وه له‌خوارده‌مه‌نیه‌كه‌ی كه‌ئێمه به‌رهه‌می ده‌هێنین، ئا ئه‌وه‌تا ئێمه خۆمانین باران ده‌بارێنین به‌شێوه‌و ئه‌ندازه‌یه‌كی ڕێك و پێك و گونجاو كه‌ده‌یكه‌ین به‌مایه‌ی ڕه‌حمه‌ت و پاشان زه‌وی شه‌ق شه‌ق ده‌كه‌ین و به‌شێوه‌یه‌كی وا كه‌جۆره‌ها نه‌بات و دانه‌وێڵه‌ی ترو شیناییانی جۆراو جۆر له‌زه‌یتون و دارخورماو باخ و باخات و باخچانی زۆر چڕو پڕ له‌دارو بارو فاكیهه‌و له‌وه‌ڕگای هه‌مه جۆری تیا ده‌ڕوێنین و پێی ده‌گه‌ینین، ئه‌مانه گشتی بۆ ئه‌وه‌ی ببێ به‌مایه‌ی ڕابواردنتان و خۆشی

ژیانتان بۆ ئێوەو ئاژەڵەكانتان جا بەڕاستی ئەمە جێگەی بیرلێ كردنەوەو دیراسەكردن و تیا ڕوانینی و پەند لێ وەرگرتنیەتی، ئیمامی علی (كرم الله وجه) دەفەرمووێ :یادو زیكری خودای شكۆمەند بكەن لەسەر خواردن و خواردەمەنیا، زیادە ڕەوی تیا مەكەن بەڕاستی ئەم خواردن و خواردنەوەیە بەهرەو نیعمەتە لەنیعمەتەكانی خودای ئازیز و خۆشەویست، جا پێویستە لەسەرتان شوكرانەو ستایشی بكەن، بەچاكی و باشی هاوڕێیەتی ئەم نیعمەتە بكەن پێشوازی لێ بكەن پێش ئەوەی لێتان ببڕێ، چونكە شك و گومانی تیا نیە دەڕواو دەبڕێتەوەو بەسەر دەچێ وەشاهێدی و گەواهی لەسەر خاوەنەكەی دەدا، بەوەی چۆن لەگەڵی مامەڵەی كردووە، جا ئەگەر یەكێ لەئێوە لەسەر نان خواردن دانیشت وەك عەبدو بەندە دابنیشێ بەوەی لوت بەرزی تیا نەكاو بەنیعمەت و ڕەحمەتی خودای گەورە بزانێ و ئەگەر كرا لەسەر زەوییا دابنیشێ و ئەوسا دەست بكا بەنان خواردن.

مامۆستاییێ تر دەفەرمووێ (قوڕ بەسەر ئەوكەسەی لەناو موڵك و سامانی خوادایەو لەسەریان دەڕواو لێی دەخواو بۆی دەڕوانێ تیای دەخەوێ و شوكرانەو ستایشی خوای گەورەشی لەسەر ناكات)

## هەندێ لەخاڵەكانی دابونەریتی نان خواردن:

١- دەست و دەم شۆرین لەپێش نان خواردن و پاش نان خواردن.

٢- پێش دەست بۆبردنی یا لەسەرەتا پێش خواردنی ناوی خودا بێنین و بەنیەتی نان خواردن و دوعاو نزای مەئسورو گەڕاوە لەپێغەمبەرا ﷺ بخوێنین وەك بڵێین (بسم الله الرحمن الرحيم) نیەتمە خۆپارێزی و تەقوا بكەم لەسەر

گوێڕایەڵی و تاعەتی خودای گەورە (اللهم بارك لنا فیما رزقتنا وقنا عذاب النار)کوردیەکەی واتە:ئەی خوایەگیان بەرەکەت بخەیتە ئەو ڕزق و ڕۆزیەی پێمانت بەخشیوە وبمان پارێزە لەعەزاب و ئازاری جەهەندەما، دیارە حیکمەت لەو زیکرو ویردەش زۆرە، ئەوە بیری ئادەمیزاد دەخاتەوە کەدەست بۆ حەرام درێژ نەکات و حەرام نەخوات، چونکە حەرام خواردن نەبەرەکەتی خوای دەکەویتێ و نە لەئاگری جەهەندەمیش پێی دەپارێزرێ جگە لەوەش ئەم زیکرو ویردە هەزاران بیری ئادەمیزاد دەخاتەوە ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (اذا اکل احدکم فلیذکر اسم الله تعالی فاذا نسی ان یذکر الله فی اوله فلیقل بسم الله اوله واخره)رواه الترمذی واتە: ئەگەر یەکێ لەئێوە نانی خوارد با ناوی خوای گەورەی لەسەر بێنێ، جا ئەگەر لەبیری چوو لەسەرەتاوە ئەو کاتەی وەبیری هاتەوە بابڵێ بەناوی خوای گەورە هەر لەسەرەتاوە تا کۆتایی.

٣-با خواردەمەنی پاك و پوختەو حەلاڵ پەیدا کەین و بخۆین، خۆبپارێزین لەماڵ و سامانی حەرام و دزراو

عن کعب بن عصره ان رسول الله ﷺ قال (کل لحم نبت من الحرام فالنار اولی به)رواه الترمذی واتە: هەرگۆشتێ لەحەرامەوە پەیا بووبێ ئەوە هەر بۆئاگری جەهەننەم باشە.

٤-خواردەمەنی چاك و باش و خاوێن بخۆین واتە سوتاوو تێك نەچووبێ کاتی بەسەر نەچووبێ هەروەها گەر شایستەی شوشتن بوو جوان بیشۆین پێش خواردنی.

٥-هەوڵدەین بەدەستی ڕاست نان بخۆین.

٦-لەکاتی نان خواردن دەست کەین بەوخواردنەی کەلەلێواری قاپەکەیە

له‌نزیكمانه‌وه، واته ده‌ست بۆ ناوه‌ڕاستی قاپه‌كه یا ئه‌و سه‌رو ئه‌و سه‌ر نه‌به‌ین، به‌تایبه‌تی له‌كاتێك كه‌له‌گه‌ڵ برایانی تردا نان ده‌خۆین، عومه‌ری كوڕی ئه‌بی سه‌له‌مه (سه‌لامی خوای لێبێت)ووتی پێغه‌مبه‌ری خوداﷺ پێمی فه‌رموو ئه‌ی ڕۆڵه ناوی خوا له‌سه‌ر خواردن بێنه به‌ده‌ستی ڕاست نانه‌كه‌ت بخۆو وه‌له‌و خواردنه بخۆ كه‌لێته‌وه نزیكه (ئیمامی موسلم و بوخاری ڕیوایه‌تیان كردووه).

٧-پاروو لوقمه‌ی بچووك بخه‌ینه ده‌مان، تاكو به‌ئاسانی باش بجوڕێ و قووت بدرێ.

٨-خۆمان لاده‌ین له‌وه‌ی فوو له‌خواردنی گه‌رم بكه‌ین و خواردنی زۆر سارد یا زۆر گه‌رم نه‌خۆین.

٩-كه‌خواردنێ ده‌خۆین ده‌م نه‌هێنیته‌وه سه‌ر ناوه‌ڕاستی قاپه‌كه نه‌بادا شتێك له‌ده‌مان به‌ربێته‌وه بۆ ناو خواردنه‌كه..ببێته مایه‌ی بێزی كه‌سانی ترو خواردنیان بۆ نه‌خورێ.

١٠-كاتێ كه‌ویستمان نان بخۆین پێویسته جوان دانیشین ڕێك بین، واته خۆمان دوور بگرین له‌وه‌ی نان بخۆین به‌پاڵدانه‌وه وه‌یا به‌پاوه یا به‌خۆ خواركردنه‌وه یا درێژبوونه‌وه یا به‌ڕۆیشتنه‌وه، عن وهب بن عبدالله قال رسول الله ﷺ ( لا اكل متكئا)رواه البخاری واته: من خواردن به‌پاڵ دانه‌وه ناخۆم

.

١١-خۆلاده‌ین له‌وه‌ی زه‌می خواردن بكه‌ین یا عه‌یبی لێ بگرین (چونكه نیعمه‌تی خودایه) عن ابی هريرة (ما عاب رسول الله قط ان اشتهاه اكله وان كرهه تركه)متفق علیه .واته : له‌ئه‌بو هوره‌یره‌وه(سه‌لامی خوای لێبێت) پێغه‌مبه‌ر ﷺ قه‌ت و هه‌رگیز عه‌یبی له‌خواردن نه‌گرتووه ئه‌گه‌ر حه‌زی لێ

بووبیٚ خواردوویه‌تی ئه‌گه‌ر حه‌زی لیٚ نه‌بووبیٚ نه‌یخواردووه .

١٢- خواردن به‌سوك نه‌گرتن و خراپ سه‌یر نه‌كردن، هه‌رچه‌نده كه‌میش بیٚ و پاراستن و خه‌سار نه‌كردنی هه‌ر چه‌نده زۆر كه‌میش بیٚ، خۆ پاراستن له‌وه‌ی به‌رماوه یا خواردنی ماوه فریٚ بدریٚ به‌لای چرو زبره‌وه عن جابر (ره‌زای خوای لیٚ بیٚ) (ان الرسول الله ﷺ امر بلعق اصابع وقال انكم لاتدرون فی ای طعامكم البركة) رواه المسلم له‌جابره‌وه (ره‌زای خوای لیٚ بیٚ) پیٚغه‌مبه‌ر ﷺ ئه‌مری فه‌رموو به‌لیٚستنه‌وه‌ی‌په‌نجه‌كان و قاپه‌كان وه فه‌رموویه‌تی ئیوه نازانن به‌ره‌كه‌تی خودای گه‌وره له‌كامه‌خواردنتان دا هه‌یه.

١٣- خۆ لادان له‌زۆر خواردن و ئیسراف كردن چونكه مایه‌ی نه‌خۆشی و ته‌مبه‌لی و ده‌ردو به‌لایه ،وه‌ك خوای گه‌وره ده‌فه‌رموویٚ ﴿وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ وَلَا تُسْرِفُوٓاْ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ﴾ الاعراف/ ٣١ واته : بخۆن و بخۆنه‌وه زیاده ره‌وی و ئیسرافی تیامه‌كه‌ن، چونكه به‌ڕاستی خوای گه‌وره زیاده‌ڕه‌وی وئیسراف كارانی خۆش ناویٚ، وقال رسول الله ﷺ (ما ملأ ابن ادم وعاء اشر من بطنه، حسب ابن ادم لقيمات يعمن صلبه فان لم يفعل فثلث لطعامه و ثلث لشرابه وثلث لنفسه) رواه الترمذی واته: ئاده‌میزاد هیچ جۆركیكی پر نه‌كردووه كه‌مایه‌ی شه‌ربیٚ وه‌ك كیسه‌ی گه‌ده‌و مه‌عیده‌ی، كافی یه بۆ ئاده‌میزاد چه‌ند لوقمه‌یه‌كی بخوات پشتی پیٚ بوه‌ستیٚ ئه‌گه‌ر به‌خۆشی نه‌وه‌ستا، هه‌ول بدات گه‌ده‌و مه‌عیده‌ی بكات به‌سیٚ به‌شه‌وه به‌شیٚ بۆ خواردن به‌شیٚ بۆ ئاو به‌شه‌كه‌ی تر بۆ هه‌ناسه و هه‌وا، ئیمامی ترمذی ریوایه‌تی كردووه .

١٤- خۆ لادان له‌وه‌ی شانازی و فه‌خر بكه‌یت به‌جۆره‌كانی خوارده‌مه‌نی وه‌ك بلیٚ ی فلانكه خواردن زۆر خۆشه، ئیمه هه‌میشه یا زۆر جار ده‌یخۆین

به‌شێوه‌یه‌كی مه‌دح بلێ ی ئه‌وها ئه‌وهایه، كه‌ده‌بێته مایه‌ی ئه‌زیه‌ت دانی دلی هه‌ژاران و هه‌ست كردنیان به‌كه‌م و كوری عن عمر بن شعیب (ره‌زای خوای لێ بێ ) عن جده قال، قال رسول الله ﷺ اكل واشرب والبس وتصدق فی غیر سرف لامخلیة) رواه ابو داود واته بخۆ و بخۆنه‌وه و پۆشاك ده‌به‌ركه‌ن خێرو خێرات بكه‌ن و زیاده ئیسراف به‌بێ لووت به‌رزی ته‌كه‌ببوور .

١٥-قسه له‌سه‌ر نان خواردن به‌شێوه‌یه‌كی رێك و پێك و له‌سه‌ر خۆ، وه‌ك باسی پیاوچاكان و فه‌رمان كردن به‌چاكه‌و به‌خێر و خێرات .

١٦- پێ نه‌كه‌نین و ده‌نگ تیا به‌رز نه‌كردنه‌وه‌ی له‌كاتی نان خواردن، هه‌روه‌ها گالته‌و یاری نه‌كردن به‌كه‌سێ یا سه‌یر نه‌كردنی ده‌م و چاوی كه‌سانی تر كه‌له نزیكته‌وه‌ن یا نانت له‌گه‌لا ده‌خۆن یا له‌ده‌رورووبه‌رتان .

١٧-تێكه‌ل نه‌كردنی خوارده‌مه‌نی، ئه‌گه‌ر كه‌میش بێ چونكه زیانی هه‌یه له‌ڕووی ته‌ندروستی‌یه‌وه .

١٨- له‌پاش نان خواردن یه‌كسه‌ر نه‌نوین و نه‌چین بۆ حه‌مام عن عائیشه (ره‌زای خوای لێ بێ) قالت (قال رسول الله ﷺ اذیبوا طعامكم بذكر الله و الصلاة ولا تناموا علیه فتقسوا له قلویكم) رواه ابن سنی .. واته: خوارده‌مه‌نی سكتان بتاوێننه‌وه به‌زیكرو یادی خوداو نوێژ كردن وه‌نه‌كه‌ن بنوون له‌سه‌ر تێری، چونكه ده‌بێته مایه‌ی دل ره‌قیتان.

١٩-به‌كارنه‌هێنانی قاپ و قاچاغێ كه‌له زێردروست كرابێ یا له‌زیو یا به‌چه‌نگارو كه‌وچكی كه‌له‌زێڕو زیو دروست كرابێ، چونكه ئه‌مانه حه‌ڕامن بۆ به‌كاربردنیان.

٢٠-ده‌ست پێ نه‌كردنی خواردن پێش كه‌سانێ كه‌له‌تۆ به‌ته‌مه‌ن گه‌وره‌ترن

یازاناترن یا خاوەن ڕێزو قەدرو حورمەتن.

عن حذیفة قال (كنا اذا حضرنا مع رسول الله ﷺ لم نضع أیدینا حتى یبدأ رسول الله ﷺ فیضع یده)رواه مسلم، لەحوزەیفەوە(سەلامی خوای لێبێت) ئێمە ئەگەر لەخزمەت پێغەمبەر ﷺ بایناییە لەكاتی نان خواردنا دەستمان درێژ نەدەكرد بۆ نان خواردن، تاكو پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بۆخواردن درێژ نەكردبایە.

هەوڵدەین لەوەی بەتەنها نان نەخۆین ئەگەر ئەو شوێنە ئیمكان بێ كەسانی تریش تیای كۆببنەوە چونكە بەرەكەت و خۆشەویستی هۆگری و دڵ لێك نزیك بوونەوە لەجەمع و كۆمەڵ دایە.

٢١-سوپاس و ستایش و شوكرانەی خودا كردن لەكۆتایی نان خواردنەكە، عن أبی سعید ان رسول الله كان اذا فرغ من طعامە قال (الحمدلله الذی اطعمنا وسقانا وجعلنا مسلمین)رواه ابوداود و الترمذی واتە: لەباوكی سەعیدەوە پێغەمبەر ﷺ كاتێ لەنان خواردن دەبۆوە دەی فەرموو (حەمدو سوپاس بۆ ئەو خودایەی كەخواردن و خواردنەوەی پێ بەخشین و وەگێڕاومانی بەموسڵمان) ئیمامی ئەبو داود و ترمذی ڕیوایەتیان كردووە .

٢٢-ئەو ڕاستیەشمان لەبیر نەچێ ئەو خواردنە هەمووی بەئەندازەو حیسابە خوای گەورە لەبارەی ئەو نیعمەتانە لێمان دەپرسێتەوەو پرسیارمان لێ دەكات، وەك خوای گەورە لەسورەتی التكاثر دەفەرمووێ (ثم لتسئلن یومئذ عن النعیم) واتە: پاشان لەڕۆژی قیامەتا بێ گومان پرسیارت لێ دەكرێتەوە لەبارەی نیعمەتەكانەوە، جا پێویستە حەلاڵ بخۆین و هەژاران فەرامۆش نەكەین بەتایبەتی هەژارە خزمەكان و جیرانەكانمان، هەروەها سفڵەو بەدنەك نەبین

لەڕاست ئایین و بەرنامەی خوادا، جار لەدوای جار خۆشەویستێتی خودای گەورە لەدڵ زیاد بكەین و داوای زیادە بەخشش و ڕەحمەت و بەرەكەت و ڕزق و ڕۆزی و هیدایەت و زانیاری و بەهرەی لێ بكەین و لەبەندایەتی ئەو زاتە پاكە دەسەلاَت بێ سنوورە بێ تاقەت و داوەشاو نەبین مەلەل و بێ زاری ڕوومان تێ نەكات و بێ ئومێدی و هیوا بڕاوی بەسەر خۆمان دانێنین، وە لەكارچاكیدا بێ قصور بین لەعەیب و عارو نەنگی و كەم و كوڕی دووركەوینەوە، هەردەم مانای (احسن كما احسن الله الیك) فەرامۆش نەكەین واتە چاك و باش بین وەك خوای گەورە چاكەو ئیحسانی لەگەڵمانا كردووە.

## ئادابی ئاو خواردنەوە

ئاو وەك خواردەمەنی پێویستی ژیانە بەڵكو پێویستترو گرنگ تریشە خودای بەخشندە منەت دەخاتە سەر بەندەكانی كەزۆر لەئایەتەكانی قورئانی پیرۆز بەدابەزاندنی ئاو لەئاسمانەوە بۆ سەر زەوی وەك لەسورەتی (الواقعة) دا دەفەرمووێ ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ۝٦٨ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ۝٦٩ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَـٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ۝٧٠﴾ (الواقعة ٦٨-٧٠)

واتە: ئایا ڕونیوتانەو سەرنجتان داوەتە ئەو ئاوەی دەی خۆنەوە، ئایا ئێوە داتان بەزاندووە لەهەوری چڕوپڕا یا ئێمەین دابەزێنەری، جا ئەگەر خواستمان لێی بایە دەمان گێڕا بەئاوێكی زۆر سووری تاڵ ئایا هێشتا ئێوە لەسەر نیعمەتانی خوای گەورە حاڵی نابن و ستایش و شوكرانەی ناكەن؟!

هەروەها زاتی بەخشندە لەسورەتی الحجر دا دەفەرمووێ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَـٰحَ

لَوَٰقِحَ فَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَسۡقَيۡنَٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمۡ لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ ﴿٢٢﴾

(الحجر٢٢) واته: ئێمەین بایەكانمان ناردووە كەمایەی تەلقیحی زۆرێـك لـەدارو بارەكان و شینایییەكانە، جا لەئاسمانیشەوە ئاومان باراندووە كەمایـەی ژیـوارو خواردنەوەتانە و تینوتێتان دەشكێنێ؟ خۆ ئێوە نین خەزن كـاری ئـاو هێنـان و بردنە ئاسمان و بارینی.

جا بەڕاستی هەرچەند باسی سوودو قازانجەكانی ئاو بكەین هەرلێی دێ و شایستەیە، سەرەنجام حەقی باسەكانیمان بەتەواوی پێ نادرێ، فەرموون ئێـوەو چەند خاڵێك لەئادابەكانی ئاو خواردنەوە:-

١- نـاوی خـودا هێنـان لەسـەرەتای ئـاو خواردنـەوەو دواتـر بڵـێین حەمدوستایش بۆخودای بەخشندە كـە گێڕاویـەتی بـەئاوێكی شـیرین و خـۆش بەڕەحمەتی خۆی وەنەی گێڕاوە بەسوێرو تـاڵ بـەهۆی گونـاه و تاوانەكانمانـەوە سیغەی عـەرەبیەكەی ئاوایە (الحمدالله الذی جعله عـذبا فراتـا برحمتـه ولم یجعله ملحا اجاجا بذنوبنا).

٢- سـوننەتە ئـاو خواردنـەوە بەدانیـشتنەوەبێ، هـەم باشـترە لـەڕووی تەندروستیەوە هەم مایەی زیادە تەوازوع و ئەدەب و ویقارە، عن انس قال نهی رسـول الله ﷺ (ان یـشرب الرجـل قائمـا فالاكـل قـال ذلـك اشـر)رواه مـسلم واته:لەئەنەسەوە (سەلامی خوای لێبێت)فەرمووی پێغەمبـەر ﷺ قەدەغـەو نەهی كردووە لەپیاوێك كەبەپێوە ئاو بخواتەوە ووتیان ئـەی خـواردن فـەرمووی ئەوە خراپترینە...واتە: خواردن و خواردنەوە سوننەتە بەدانیشتنەوە بێ.

٣- خواردن و خواردنەوە بەدەستی ڕاست بـێ ...عـن حفـصه(رضـی الله عنها) ان (رسول الله ﷺ كان یجعل یمینـه لطعامـه وشرابه ویجعـل یـساره لما

سوی ذلك)رواه ابوداود و الترمذی واته: له‌حه‌فصه‌وه(سه‌لامی خوای لێبێت) پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌ستی ڕاسته‌ی گێڕاوه بۆنان خواردن و ئاو خواردنه‌وه‌ی وه‌ده‌ستی چه‌پی گێڕاوه بۆ غه‌یری ئه‌مانه.

٤- بۆ ئاو خواردنه‌وه پێویسته ئاوه‌كه بمژین كه‌م كه‌مه، نه‌ك داڕێژین و ڕووكه‌ینه قوڕقوڕاگه‌مان، چونكه ئاو مژین كه‌م كه‌مه مایه‌ی ته‌ندروستی له‌زه‌ت لێ كردنه.

٥- ئاو خواردنه‌وه به‌سێ كه‌ڕه‌ت، واته به‌سێ جار بیخۆینه‌وه عن ابن عباس (رضي الله عنه) قال قال رسول الله ﷺ (لا تشربوا كشرب البعير ولكن اشربوا مثنى وثلاث وسموا اذا انتم شربتم واحمدوا اذا انتم رفعتم) رواه الترمذي واته: ئاوێ مه‌خۆنه‌وه وه‌ك ئاو خواردنه‌وه‌ی حوشتر، به‌لكو به‌دووجار سێ جار بیخۆنه‌وه جا كاتێ كه‌ده‌یخۆنه‌وه (بسم الله) بكه‌ن و ناوی خودا بهێنن و وه‌كاتی كه‌سه‌ری له‌سه‌ر هه‌ڵده‌گرن(الحمدالله) بكه‌ن و شوكرانه‌و ستایشی خودای له‌سه‌ر بكه‌ن.

٦- هه‌ناسه نه‌ده‌ین له‌ناو جاما یا په‌رداغی ئاو خواردنه‌وه هه‌روه‌ها فووشی تیا نه‌كه‌ین....عن ابن عباس (ان رسول الله ﷺ نهی ان یتنفس فی الانـاء اوینفخ فیه) رواه الترمذی واته له‌ئیبن عه‌باسه‌وه پێغه‌مبه‌رﷺ قه‌ده‌غه‌ی كردووه له‌هه‌ناسه‌دان له‌ناو جام و په‌رداغی ئاو خواردنه‌وه یاخوت فوو تیاكردنی .

٧- خۆلادان له‌ئاو خواردنه‌وه له‌لوله‌ی مه‌سینه یا له‌شتێ كه‌ئاوه‌كه‌ی تیا دیارنه‌بێ یا له‌شتێ كه‌ئی ئاو خواردنه‌وه نه‌بێ، عن ابی هریرة(رضي الله عنه) نهی رسول الله ﷺ ان یشرب من فی السقاء او القربه)متفق علیه.

٨- خۆلادان لەئاو زۆر خواردنەوە بەتایبەتی لەکاتی نان خواردن لەبەر ئەوەی کاری هەرس کردنی خواردنەکە لەئاسایی خۆی لادەبەری .

٩- خۆلادان لەئاو خواردنەوە لەناو جام و پەرداغی لەزێر یا لەزیوو دروست کرابێ چونکە بەکارهێنانیان حەرامە، عن ام السلمة (رضي الله عنها) (قالت قال رسول الله ﷺ ان الذى يأكل ويشرب فى انية الذهب والفضة فانما يجرجر في بطنه نار جهنم) رواه مسلم واتە:ئەوەی خواردن و خواردنەوە دەخواتەوە لەناو قاپ و پەرداخی کەلەزێڕ دروست کرابێ یا لەزیو، ئەوە ئاگری جەهەندەم لەناو زگی ڕاکێش ڕاکێشی پێ دەکرێ و مایەی ئەشکەنجەو عەزاب دەبێ .

١٠- ساقی یا ئاو گێر لەسەرەتاوە لەگەورەی گەلەکەیەوە دەست پێ بکات بۆ ئاوگێڕان یا لەباشترینیان یا لەزاناترینیان پاشان بەلای ڕاستەی ئەودا بسوڕێ .

١١- سوننەتە ئەوەی ئاو دەگێڕێ خۆی ئاخیر کەس ئاوبخواتەوە، عن ابى قتادة (رضي الله عنه) النبى ﷺ قال ساقي القوم اخرهم)رواه الترمذى واتە: لەئەبی قەتادەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی ئاوگێڕی گەل و قەومێ خۆی ئاخیر کەس بێ لەئاوخواردنەوە .

١٢- ئاو بەخشین خێرێکە زۆر گەورەیە لەفەرموودەدا هاتووە دەفەرمووێ ئەوەی گوناهی زۆرە با ئاو ببەخشێ وەك دەفەرمووێ ﷺ (من كثر ذنبه فليسق).

# ئادابی جل و بەرگ و پۆشاك

جـل و بـەرگ و پۆشـاك نیعمـەتێكی خودایـە، تایبەتمەنـدی كـردووە بەئادەمیزاد، مایەی خۆ پێ پاراستنیەتی لەسەرماو گەرماو بـاران و تیـشكی رۆژ هەروەها مایەی داپۆشین و ستركردنی عەورەتە هەروەها مایەی جـوانی و رێزو كەرامەتە، خودای گەورە دەفەرمووێ ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَابِيلَ تَقِيكُمُ الْحَرَّ وَسَرَابِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ كَذَلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ﴾ (٨١) (النحل ٨١) واتە: زاتی خودای مونعیم، جل و بەرگ و پۆشاكی بۆ ئێوە گێڕاوە كەمایەی خۆپاراستنتانە پێیـەوە لەگـەرما، جـل و بـەرگ و پۆشـاكی تریش وەك كراسی زرێی جەنگ مایەی خۆ پاراستنە لەكاتی ناخۆشی جەنگ و نارەحەتیدا، ئاوەها زاتی شكۆمەند بۆ ئێوە نیعمەتەكانی بەسـەر ئێـوە تـەواو دەكات بەئومێدی ئەوەتان بیربكەنەوەو روو بكەنەخوداو موسلمان بن .

هەروەها زاتی شكۆمەند رووەو نەوەی ئادەمی لەفەرموودەیەكی قودسـی دا هـاتووە دەفـەرمووێ (یـا عبـادی كلكم عـار الامـن كـسوته فأستكـسونی اكسكم) رواه مسلم واتە : ئەی بەندەكانم ئێوە رووتن ئیللا ئەوەتان نەبێ كەمن پۆشاكم پـێ ی بەخـشیوە جـاداوای پۆشـاكم لێ بكـەن، جـا جـل و بـەرگ و پۆشاكتان پێ بدەم .

خەلكانێكی زۆر لەئاست ئەم نیعمەتە بێ ئاگان كەجل و بەرگ و پۆشـاك نیعمەتی خودایە، پێویستە لە ئاستیەوە شوكرانەی خـودا بكـەن و بەنیعمـەتی خودای بالادەستی تێ بگەن و ،خودای خێـر خـوازو چـاكە ویـست و نیعمـەت

دەری خۆیان خۆش بوێ و هەر خودای بەخشندەیە هۆو ئەسباب و کەرەستەی خاوو عەقلی پرشنگداری بەدیهێناوە ،ئاسمان و زەوی و مەخلوقاتی نێوانیانی بۆ مایەی سەرو موسەخخەرو کردوون و سەرەرای ئەوەش بیر و هۆش و عەقل و زانیاری پێ بەخشیوون، وە باقی پێداویستیەکانی ژیانی بەدیهێناوە نیعمەتانی زۆری بێ ژماری دارشتووە بەسەر ئادەمیزادەکانا تاکو شوکرانەی ئەو زاتە بکەن، کەرێك خەرو بەرێوەبەری ئەو کەون و بونەوەرو دونیایەیە

خودای شکۆمەند جل و بەرگ و پۆشاکی وەك نیعمەتانێك پێ بەخشیووین، تاکو نیعمەتەکانی خۆی پێمان ببخەشێ و تەواوی بکات و تاکو شوکرانەی خودا لەسەر بکەین و زاتی بەخشندەمان خۆش بوێ و سەر گەرمی خۆشەویستاتی ئەو بین، وەبیکەین بەمایەی خۆ پێ جوان کردن و رێز و حورمەت و کەرامەتی خۆمانی پێ بپارێزین، پێوە کۆمەکی هەژاران و داماوانی بکەین و کەببێ بەمایەی زیادە خۆشەویستی لەنێوان خودا و بەندەو وەلەنێوان ئادەمیزادەکانا، بەلام شەیتان سیفەتان وەك لەدێرینەوە دوژمنی باوکە ئادەم و رۆلەکانیتی لەسەر دوژمنایەتی کۆلیان نەداوەو کۆلێش نادەن، ئا ئەوەیە ئەو جل و پۆشاکە نیعمەتەی خوای گەورە پێ ی بەخشیوون، بەهیواو ئومێدی ئەوەمان کە ببێتە مایەی رێزو حورمەتمان شوکرانەی خوداو هەست کردن بۆ بەرەو تەواوی نیعمەتانی خودا ئەوە شەیتان دەیەوێ ئەو نیعمەتە بکات بەنیقمەت و مایەی بێ رێزی مایەی وروژاندنی شەهوەت و فیتنەو ئاشوب لەناو کۆمەلانی خوا پەرست و موسلمانان، ئەو مۆدیلات و پیلان و فرفێلی شەیتان و شەیتانیانە زۆر دەمێکە لەتەقەلای ئەوەدان هەمان عادەت و تەقالید لەناو کۆمەلانی موسلمانان بەرپا بکەن ،کەنە لەگەل سروشت و

فیترەتـی موسـلمانێتی دەگـونجێ و نەلەگـەل خـوو عـەقل و داب و نـەریتی کوردەواری دەگونجێ و نەلەگەل کەرامەت و عیززەت و ویقارو مەردایەتی ئـەم گەلە ئازایە دەگونجێ، بۆیە لەگەل ئەو هەموو تەقەلایەو بێ ووچـانەی شـەیتان سیفەتان، نەیان توانیوە بەمەرامی خۆیان بگەن، مایەی شـەرم و حـەیا لـەناو کوردەواری لابەرن، لەگەل ئەو هەموو تەقەلایـە و فروفێلـەی ئـەنجامیان داوە، توانیویانە رێژەیەکی زۆر کەم لەخەلکان چەواشە بکـەن بـەعادات و تەقالیـدی جاهیلیەتی نوێ، ئەویش ماوەکەی کـەم دەبـێ ،چـونکە ئـەو میللەتـە بـەرەو هۆشیاری یە، هەر کاتێك راستی و پاکی بۆ دەرکەوت، ئەو عادەت و تەقالیدە بێ بنچینەوە و ئەنجامە بۆ سەرو گێلاکی خاوەنەکەی رەت دەکاتـەوە، بەپەنـدە کوردیەکـــەی خۆمـــان وەلامـــی دەداتـــەوە، دەلێ مـــالێ قـــەرپ ســـەر بەخاوەنەکەیەتی.

پێغەمبەری ئازیز ﷺ فەرموویەتی: (صنفان مـن امتـی لم ارهمـا قـط معهم سـیاط کأذنـاب البقـر یـضربون بهـا النـاس، ونـسـاء کاسـیات عاریـات مـائلات رؤوسـهن کأسنمة البخت المائلة لا یدخلن الجنة ولا یجدن ریحها وان ریحها لتوجد من مـسیرة کذا وکذا) رواه مـسلم والامام احمـد واته : دوو صنف و تـاقم لە ئومەتی خۆما نەم دیون تاقمێ قامچیان بەدەستەوەیە، وەك کلکی مـانگـاو چێل وایە پێ ی لەخەلکی دەدەن، تاقمەکەی تر ئافرەتـانێکن جلیـان لەبـەرەو رووتـن (واتە نیوەیان داپۆشـراوە و نیوەشـیان رووتـە) یـا (جلـی زۆر تـەنکیان لەبەرە و وەك رووت بن وایە) لارو وێلن (خەلکانیش، وێل دەکەن) پرچ و قژیان لەسەر سەری خۆیان کۆدەکەنەوە وەك پشتی حوشتر ئەوانە ناچـنە بەهەشـتەوە وەبۆنی بەهەشتیان بۆ ناچێ، کەچی بۆنی بەهەشت ئەوەندە سالە رێیە دەڕوات،

له‌فه‌رمووده‌یه‌كی تردا هاتووه، هه‌ربه‌م شێوه‌یه وه‌صفیان ده‌كاو له‌كۆتاییه‌كه‌یاندا ده‌فه‌رمووێ (العنوهن فانهن ملعونات) واته: به‌نه‌عله‌تیان كه‌ن ئه‌وانه مه‌لعونن جابرای به‌ڕێزو خوشكی خۆشه‌ویستم، نیعمه‌ت بۆخۆشی و پیرۆزی و به‌رزیه هه‌روه‌ها بۆجوانی و ڕێزو حورمه‌تیه نه‌ك كردنه مایه‌ی فیتنه‌و ئاشوب و نه‌فره‌ت، نه‌ك كردنه مایه‌ی بێ ڕێزی و ئاژاوه‌و ده‌ردو مه‌ینه‌ت..

## هه‌ندێ له‌خاڵه‌كانی ئادابی جل و به‌رگ و پۆشاك

١- ناوی خودا هێنان له‌سه‌ره‌تای جل و به‌رگ له‌به‌ركردندا، وه‌ك له‌سه‌ره‌تای هه‌ركارێ (بسم الله) كردن سوننه‌ته.

٢- ئاده‌میزاد له‌جل و به‌رگ له‌به‌ركردندا نیه‌تی داپۆشینی عه‌وره‌ت بێ وه‌ك خودای به‌خشنده ده‌فه‌رمووێ يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَٰرِى سَوْءَٰتِكُمْ وَرِيشًا ۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾ (الاعراف/٢٦)، ئه‌ی ڕۆڵانی ئاده‌می به‌ڕاستی بۆ ئێوه‌مان به‌دی هێناوه‌و دابه‌زاندووه جل و به‌رگ و پۆشاك كه‌مایه‌ی داپۆشینی عه‌وره‌تتانه و مایه‌ی جوانی و ڕێزو حورمه‌تتانه ،وه‌بزانن جل و به‌رگی خواپه‌رستی و ته‌قوا باشترین و خێرترین شتێكه یابڵێین ته‌قوا باشترین پۆشاكێكی ڕێزو حورمه‌ت و به‌رزییه ئه‌مه له‌ئایه‌ت و نیشانانی خودای بالاده‌سته بۆ ئه‌وه‌ی تكاتان بێ بیركه‌نه‌وه‌و ڕێگه‌ی خودا بگرنه به‌ر.

٣- نزاو پاڕانه‌وه‌یێ وه‌ك له‌پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویستمان ﷺ گه‌ڕاوه‌ته‌وه، عن ابی سعید الخدری(رضي الله عنه) ان النبی (صلى الله عليه وسلم) (كان

اذا لبس ثوبا او قميصا اورداءا او عمامة يقول) (اللهم انی اسال عن خيره ماهو له واعوذبك من شره وشر ماهو له) رواه ابن السنی ...واته: له‌ئه‌بوو سه‌عیدی خودریه‌وه پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌گێڕێته‌وه هه‌ركاتێ كه‌جل و به‌رگی له‌به‌ر ده‌كرد، جاكراس بایه یا كڵاو ده‌ی فه‌رموو په‌روه‌ردگارا، من پرسیاری خێروبێری ئه‌و پۆشاكه‌ت لێ ده‌كه‌م وه‌خێروبێری كه‌به‌هۆیه‌وه چه‌نگ ده‌كه‌وێ و په‌نا به‌تۆ ده‌گرم له‌شه‌روبه‌ڵای ئه‌و پۆشاكه، له‌وشه‌ڕو گێچه‌ڵه‌ش كه‌به‌هۆیه‌وه ده‌بێ ...ئیبن سونی ڕیوایه‌تی كردووه .

٤- دوعاكردن له‌كاتی له‌به‌ر كردنی جل و به‌رگی نوێ : عن عمر(رضي الله عنه) قال سمعت رسول الله(صلى الله عليه وسلم) (يقول من لبس ثوبا جديدا، فقال الحمدلله الذی كسانی ما اواری به عورتی و اتجمل به في حياتی، ثم عمدالی الثوب الذی اخلف فتصدق به كان في حفظ الله وفي كنف الله عزوجل في سبيل الله حيا اوميتا) رواه الترمذی له ئیمامی عومه‌ره‌وه (سه‌لامی خوای لێبێت) فه‌رمووی بیستم له پێغه‌مبه‌ری خوداﷺ ده‌ی فه‌رموو ئه‌وه‌ی پۆشاكێكی تازه‌ی له‌به‌ر كرد، بڵێ سوپاس بۆ ئه‌و خودایه‌ی پۆشاكی پێدام كه‌مایه‌ی داپۆشینی عه‌وره‌ته و جوان و ڕێكی خستم له‌ژیانما، پاشان باهه‌وڵبدات جل و به‌رگه كۆنه‌كه‌ی بكات به‌خێر، جا به‌مه‌وه ده‌كه‌وێته چاودێری پڕ ڕه‌حمه‌تی خودای شكۆمه‌ندو ئازیز كاتێ زیندووه‌و دوای مردنیش، وئه‌گه‌ر پۆشاكه نوێیه‌كه‌ی كفنیش بوو با وه‌سیه‌ت كات كه‌جل و به‌رگه‌كه‌ی بده‌ن به‌هه‌ژارێ .

٥- جل و به‌رگێكی شیاو و گونجاو كه‌له‌خۆیا بوه‌شێته‌وه‌و له‌به‌ر بكات واته زیاده ڕه‌ویی و ئیسرافی تیا نه‌كات، وه‌ك چۆن زیاده‌ڕه‌وی له‌خواردن و

خواردنەوە دروست نیە، ئاواش لەجل و بەرگ و پۆشاك دروست نیە .

٦- دڵنیا بوون و تەئكید كردن لەپاك و خاوێنی ئەو جل و پۆشاكەی لەبەر دەكەیت بۆ ئەوەی عیبادەت و نوێژەكانت دروست بێ، چونكە ئادەمیزادی ئیماندار دەبێ گیانی پاك بێ، كارو كردەوەو گوفتارو ڕەوشتیشی پاك بێ .

جل و بەرگ و پۆشاك، چاكی و پاكی و سەنگ و ڕێزو حورمەت بۆ ئادەمیزاد زیاد دەكات.

٧- شانازی نەكردن بەجل و بەرگ و پۆشاك، هەروەها لوت بەرزی و تەكەبورو فەخفەخە نەكردن بەجل و بەرگەوە...عن ابی هريرة عن رسول الله ﷺ قال (لا ينظر الله يوم القيامة الى من جر ازاره بطرا)متفق عليه. واتە: خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتا بەچاوی ڕەحمەت سەیری كەسانێ ناكات، كەجل و بەرگیان درێژو شۆڕ بۆتەوە لەبەر لووت بەرزیانا.

٨- هەستان بەچاك كردنی جل و بەرگ و پۆشاك ئەگەر دڕابوو یا كون ببوو پێغەمبەر ﷺ بەدەستی خۆی جاروابووە پۆشاكەكەی چاك دەكردەوە.

عن سهل بن الحنظلة (قال سمعنا رسول الله(صلى الله عليه وسلم)يقول انكم قادمون على اخوانكم فاصلحوا رحالكم واصلحوا لباسكم حتى تكونوا كأنكم شامة في الناس فان الله لا يحب الفحش ولاالتفحش)رواه داود...واتە: لە سهل كوڕی حەنظلة (سەلامی خوای لێبێت)ووتی گوێمان لەپێغەمبەری خوداﷺ بوو دەی فەرموو ئێوە دێنە ناوبرایانی خۆتان جا كاروانی خۆتان چاك و ڕێك خەن هەروەها جل و بەرگ و پۆشاكتان چاك و باش بكەن هەتا وای لێ دێ، زۆر چاك و درەوشاوەو بەڕەونەق بكەونە بەرچاو لەناو خەڵكان وەك

خاڵ سەر روو وابن بزانن خودای گەورە پیسی و پۆخڵی خۆش ناوێ و بێزەوەری و نارێکیشی خۆش ناوێ.

٩- بەلای ڕاستە دەست پێ بکەین لەدەبەرکردنی پۆشاك و پێلاو و گۆریەو شەرواڵ لە لەبەرکردنەوەش بەلای چەپا دەست پێ بکەین، ...عن عائشه (رضي الله عنها) (قالت كان رسول الله(صلى الله عليه وسلم) يحب التيمن في شأنه كله في طهوره وترجله)رواه البخاري واتە: لەعائیشەوە ڕەزای خوا لێ بێ پێغەمبەرﷺ لەڕاستە دەست پێ کردنی هەڵبژارد، لەهەموو بوارەکانی ژیانی و پێی وەموعجیب بوو هەتا لەپاك و خاوێنی و شت لەبەر کردنیشا.

١٠- جل و بەرگ و پۆشاك یا پێلاو گۆریەی یا هەربەگێکی تریش بێ داوەشاندنیان پێش دەبەر کردنیان پێویستە نەبادا زەردەواڵەیەك یا شتێکی تری تیا چووبێ، کەمایەی ئەزیەت و ژان و پێوەدان بێ یا مایەی نەخۆشی بێ.

١١- جل و بەرگ دەق کردن لەکاتی لەبەر کردنەوەی و ناوی خودا هێنان لەکاتی لەبەرکردنەو، یا وەنەکەین بەبێ سەروبەری فرێ بدەین، بێ موبالاتی پێ بکەین عن انس قال قال رسول الله ﷺ ستر ما بين اعين الجن وعورات بنى ادم ان يقول الرجل المسلم اذا اراد ان يطرح ثيابه بسم الله الذى لا اله الاهو)رواه ابن السنى.

لەئەنەسەوە ڕەزای خوای لێ بێ فەرموویەتی پێغەمبەرمان ﷺ فەرموویەتی سترو پەردە لەنێوان چاوانی جن و (واتە جنۆکە یا پەری) عەورەتی ئادەمیزاد ئەوەیە پیاوی موسڵمان کاتێ کەجل و بەرگ لەبەردەکاتەوەو دای ئەنێ بڵێ (بسم الله الذى لا اله الا هو) واتە بەناوی ئەو

خودایەی كەتاكە پەرستراوێ تر نیە تەنها خۆی نەبێ.

١٢- گۆرەوی پێی هەمیشە بەپاكی ڕابگری و هەموو ڕۆژێ بیشوات، بەتایبەتی لەڕۆژانی هاویندا نەبادا بۆن بگری و خەڵكانی پێ ئەزیەت بدات.

١٣- خۆی لابدات لەوەی پۆشاكی حەریر (ئاوریشم) لەبەر بكات چونكە بۆ پیاوان حەرامە بەلاّم بۆ ژنان حەلاّلە.

١٤- لەجل و بەرگ لەبەركردندا خۆنەشبهاندنی پیاو بەژنان یان ژن بەپیاو، عن ابی هریرة قال قال رسول الله(صلی الله علیه وسلم)لعن الله الرجل یلبس لبسة المراة والمراة تلبس لبسة الرجال) رواه ابو داود.

خوای گەورە نەعلەتی كردووە لەپیاوێك كەجل و بەرگی ژنان لەبەر دەكات، یا خۆی خانمانی و ژنانی ڕێك دێخێ، هەروەها خوای گەورە نەعلەتی لەو ژنانەش كردووە كەجل و بەرگی پیاوان لەبەر دەكەن، یا خۆی پیاوانی و نێرانی ڕێك دێخێ.

١٥- خۆ لادان لەجل و بەرگی تەسك یا تەنك، واتە چ پیاو چ ئافرەتان نابێ جل و بەرگی تەسك و تەنك لەبەر بكات چونكە مایەی بێ ڕێزی و وروژاندنی شەهەوەت و ناشیرینیە.

١٦-ئادەمیزاد چ پیاو چ ژن هەوڵبدات جل و بەرگێك لەبەر بكات كەلەگەڵ ڕێزو تەمەن و ئاین و عادات و حورمەتی بگونجێ.

جل و بەرگێ لەبەر نەكات بەر شوبهەو شاز بێ، یا لەشێوازی پیاو خراپان بچێ یا لەگەڵ ڕێزو تەمەن و ویقارێدا نەگونجێ وەك لای هەموان ڕوون و ئاشكرایە.

١٧-هەروەها سوننەتە گەر برایێ جل و بەرگێكی نوێی لەبەر كرد،

کەیفت پێی بێ و پیرۆزبایی لێ بکەیت و دوعای خێری بۆ بکەیت، وەك بڵێی (البس جديدا وعش حميدا ومت شهيدا ) واتە: ئەم جل و بەرگە نوێیەت پیرۆز بێ و ژیانێکی خواناسانە بژیت و بەریتە سەر، مردنیشت بەشەهیدی لە ڕێگەی خودابێ.

## ئادابی قسەکردن(الكلام) :

خوای باڵادەست و شکۆمەند ئادەمیزادی بەجوانترین شێوەو ڕوخسار خەڵق کردووەو بەدی هێناوە، چاوو گوێ و دڵی پێ بەخشیوە، عەقل و خواست و هەست و نەست و زەین و زاکیرەو هۆش و بیرو ئەندێشەو خەیاڵ گشتی پێ داوە، زیاد لەگشت مەخلوقاتی تر، هەموو کەون و بوونەوەریشی بۆ رام و موسەخخەر کردووە، هەوڵ بدا و خێرو بێری لێ بەرهەم و بەرچەنگ بێنێ و هۆو وەسائیل و ئەسبابی فێربوون و کارکردن و پشکنینی بۆ ئاسان کردووەو پێی بەخشیوون.وەك خودای ئازیزو نیعمەت بەخش دەفەرمووێ قُلْ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۖ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٢٣﴾ (الملك ٢٣) واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست و سالار بفەرموو بڵێ زاتی (الله)خواوەندی شکۆمەند، ئەوزاتەیە کەئێوەی بەدیهێناوەو ڕێکی خستوون و شێوەی پێ بەخشیون و هەموو پێداویستێکی بوونتانی پێ داون گوێ و چاو و دڵی پێ داون لەدروست بوون و بەدیهاتنتانا، بۆ ئەوەی حاڵی بن لەخواناسین و دەسەڵاتی بێ پایانی پەروەردگارتان بۆدەرکەوێ، لەگەڵ ئەوەشا کەمێ شوکرانەو ستایشی خودای باڵادەست دەکەن، هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ

أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ ﴿٨﴾ وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ ﴿٩﴾ (البلـد٨-٩) واتـە: ئـەی ئادەمیزاد بۆچی واسەرت لێ شێواوە چی تۆی لەپەروەردگارت لاداوە ئەی ئێمە دووچاوومان پێ نەداوی زمان و دوو لێومـان بـۆ بـەدی نـەهێناوی ،هـەروەها خـودای بالادەسـت و شـکۆمەند دەفـەرمووێ ٱلرَّحْمَٰنُ ﴿١﴾ عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ ﴿٣﴾ عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ ﴿٤﴾ (الـرحمن ١-٤) واتـە: زاتـی خـودای میهرەبان و بەخشندە، قورئانی ناردووە لای پێغەمبەری خۆشەویـست و فێـری کردووە، هەر ئەو زاتەیە ئادەمیزادی بەدیهێناوەو ئەو هـۆو ئەسبابانەشـی پـێ بەخشیوە، کەهەست و نەست و قەصدو مەبەستی خۆی پێ دەربخـاو ئاشـکرای بکات و، بەو هۆیـەوە پەیوەنـدی لـەنێوان تاکـەکان پتـەو تربـێ و لەتـەواوی نیعمەتانی پەروەردگار بەهرەمەند بـی و ڕووەو ژیـانی ئاسـوودەو بەختـەوەری دونیـاو قیامـەت پـێ هـەڵبنێ، خـودای بـالا دەسـت ئـەمرو فـەرمان بەئادەمیزادەکان دەکا حەق ببیستن و حەق بلێن و بەحەق بجولێنـەوە ،وە دەبـێ ئادەمیزاد زۆر وووریای زمان بی بەرەلای نەکاو بەعەقل و حیکمەت و علمیەوە بیبەسـتێتەوە، دەنـا رووە و شـەرمەزاری هـەلاك و پەشـیمانی دەبیـات، لەفەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هـاتووە (فقـد ورد فـی الحـدیث قولـه ﷺ) (ان الرجل یتکلم بالکلمة من سخط الله ما یظن تبلغ مابلغت فیهوی بها فی النار سبعین خریفا وان الرجل یتکلم بالکلمة من رضوان الله تعالی ما یظن ما بلغت فیرفع بها فی علیین) رواه الترمذی واتە: پیاوی واهەیە بەبێ موبالاتی بەهەندی هەڵناگرێ بەکەیفی خۆی دەکەوێتە ناوقسان قـسەی وای لـەدەم دەردەچـێ کـە جێگەی توورەیی و خـەشمی خودایـە، ئـەم قـسەیەی دەبـێ بەمایـەی ئـەوەی

کەحەفتا ساڵ پێ ی فڕێ بدرێتە جەهەندەمەوە، کەپێشتر وای لێ حاڵی نەبووە و گومانی بۆ نەچووە، کەئەم قسەیە دەیگەیەنێ بەم تێ کەوتن و شەرمەزاری و خەسارەی یە پیاوی واش هەیە قسە دەکات قسەی وای لەدەم دەردەچێ کەجێگەی ڕەزامەندی خودای مەزن بێ گومان ناباووای لێ حاڵی نییە کە ئەم قسەیە بەرزی دەکاتەوە، بۆ ڕێزی پیاو چاکانی پایە بەرز کەلە دەفتەرو سجلی (علیین) ناوین تۆمار کراوە ..ئیمامی ترمزی ریوایەت کردووە .

## هەندێ لەخاڵەکانی داب و نەریتی قسەکردن :-

١- دەبێ لەقسە کردندا هەولدەین جوانترین قسە و بەباشترین ووشەو زاراوە پێ ی بدوێین، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرمووێ (اتقوا النار ولو بشق التمرة فمن لم يجد فبكلمة طيبة) متفق علیە واتە : خۆ بپارێزن لە ئاگری جەهەندەما ئەگەر بەکردنە خێری پارچە یا لەتەخورمایێ بێ، ئەگەر ئەویش چەنگ نەکەوت ئەوە بەقسەیەکی خۆش و جوان هەروەها زاتی (المتكلم) خواوەندی ئازیز لەسورەتی الحج ئایەتی (٢٤) دا دەفەرمووێ وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٢٤﴾ واتە: ڕێنمایی و ئیرشادی خەڵکان بکەن بەرەو ووتارو گوفتارانی شیرین و جوان و ڕێك و پێك، کەمایەی بەختەوەری دونیاو قیامەتیان بێ، هەروەها خەلکان و مەردووم بکەن بۆ لای ڕێگەی زاتی خواوەندی ستایش بۆ کراو.

٢- دەبێ لەقسە کردندا لەسەرخۆبین، هەولدەین جوان بێ و ڕوونی کەینەوە تاکو بێ ئەزیەت گوێگران و خۆشەویستان لەمەرام و مەبەست حالی

بكه‌ین، له عائیشه‌وه (ره‌زای خوای لێ بێ) فه‌رموویه‌تی پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌قسه‌كردندا به‌جوانی ده‌ری ده‌بری و جیایی ده‌خسته نێوان ووشه‌كان و به‌شێوه‌یی وا ئه‌گه‌ر یه‌كێ بیویستبایه بیژمێرێ ده‌یتوانی) ئیمامی موسلم ریوایه‌تی كردووه.

٣- پێویسته قسه‌كانمان له‌ئاست مسته‌وای گوێ گربێ له‌رووی رۆشه‌نبیری و فه‌هم و زانیاری یه‌وه، ئه‌كه‌ر وانه‌بێ گومانی خراپ ده‌رگای ده‌بێته‌وه، له‌ماهیه‌تی قسه‌و وتاره‌كه كه‌م ده‌بێته‌وه، وه‌ك له فه‌رمووده‌دا هاتووه پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رمووێ (نحن معاشر الانبیاء امرنا ان نكلم الناس علی قدر عقولهم) واته: ئێمه‌ی كۆمه‌له‌ی پێغه‌مبه‌ران (علیهم الصلاة والسلام) فه‌رمانمان پێ كراوه قسه له‌گه‌ل خه‌لكان و مه‌ردووم بكه‌ین به‌پێ ی رێژه‌ی عه‌قل و ژیری یان .

٤- خۆ بپارێزن له‌قسه‌و ووتاری واكه له راستیه‌كه‌ی دلنیا نین و عیلم مان به حه‌قیقه‌ته‌كه‌ی نی یه و وه‌به‌شی زه‌ن و گومانی تیایه، چونكه گومان و زه‌ن درۆترینی ووتاره، وه‌ك له فه‌رمووده‌دا هاتووه كه پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رمووێ خۆتان له‌گومان و زه‌ن بپارێزن چونكه گومان و زه‌ن درۆترینی ووته‌و قسه‌یه كه‌صیغه عه‌ره‌بیه‌كه‌ی وایه (ایاكم والظن فان الظن اكذب الحدیث)متفق علیه.

٥- هه‌ولده‌ین قسه كه‌م بكه‌ین، ئیللا ئه‌گه‌ر وه‌لامی كه‌سانێ بوو پرسیاریان لێ كردین یا نه‌صیحه‌ت و ئامۆژگاریێ بوو یا ئه‌مركردن به‌چاكه بوو، یاقه‌ده‌غه‌كردنی خراپه‌و ناپه‌سه‌ندی بوو، یانیش ئه‌گه‌ر بانگ هێشتنی خه‌لكان بوو به‌ره‌و دینی خودا .

خـوای گـەورە دەفـەرمووێ ﴿لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١١٤﴾﴾ (النساء ١١٤)واتـە: خێروچـاكە لـەزۆر پستە پستی و چپە چپی دانیە، مەگەر یەكێ فەرمان بكات بەخێرو خێرات یـا چاكەخوازی یا ئیصلاحی نێوان خەڵكان بێت ئەوەی ئەم كارانـە ئـەنجام بـدات، لەپێناوی ڕەزامەندی خودای گەورە ئەوە بەڕاستی لێرە بەولاوە پاداشتێكی زۆر گەورەو عەزیمی دەدەینەوە.

٦- پێویستە خۆمان دوور بگـرین لەقـسەو ووتـارێ كەلەئاسـۆی لـەغوە كۆببێتەوە، بێ خێر بێ ئەنجام و بێ ماناو بێ ناوەڕۆك بێ ،خوای گـــــەورە دەفــــــەرمووێ ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ﴿٢﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾﴾ (المؤمن ١-٣) واتـە بـێ گومان ئەو ئیماندارانە سەركەوتوون، ئەوانەی نوێژەكانیان بە خشوع و ترسـەوە بەجێ دەگەینن و ئەوانەی خۆیان لە لەغوەو قـسەی زیـاد دوور دەگـرن و دژی دەوەستن.

٧- بیركردنەوە لەو قسانەی كەمەبەستە بكرێن ئـاخۆ لەشـوێن خۆیـەتی ئاخۆ دوارۆژیش پەشیمانیبەدوادا نایێ ئایا مایەی زەرەرو زیان نیە، ئایا كەس زیانی پێ لێ ناكەوێ، ئاخۆ لەئاسۆی گوفتاری حەكیمانـە جێگـەی دەبێتـەوە، دەبێ ئەم ڕاستیە لەبیر خۆمـان نەبەینـەوە كـەخوای گـەورە دەفـەرمووێ مَّا

يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ ﴿١٨﴾ (سورەتی ق ١٨) واتە: هیچ کەسێ دەم لێك ناکاتەوە بۆ قسەکردن ئیللا فریشتەی سەرشانی ئاگایان لێیەتی بۆی تۆمار دەکەن، گوفتارەکەی دەکەوێتە دەفتەری ئەعمال و دوارِۆژی رۆژی قیامەت لەسەری حیسابە .

٨- گوێ گرتن و بێ دەنگ بوون لەئاست کەسانێ کەپلەو پایەیان لەتۆ بالاترەو رێزو حورمەتیان بەرزترەو زانیاری و عیلم یان لەتۆزۆرترەو لەتۆ بەتەمەن گەورەترن، رێز لێگرتنیان و گوێ پێ دانیان و دانیشتن بەئەدەب لەخزمەتیانا، ئەگەر حیکمەت و حەقێ خواستی کەمێ قسەبکەی، ئەوا روخسەت و مۆڵەتیان لێ وەرگرە ئەوسا بدوێ.

٩- قسە نەکردن لەکاتێکا کەیەکێك لەمەجلیس قسە دەکات، تاکو لەقسەکانی دەبێتەوە، قسە نەبرِینی کەسێ کە لە قسەکردندایە، رێزگرتنی خەڵك لەقسەکردندا مەجلیس (استغلال) نەکردن هەربۆ قسەی خۆت مۆڵەتی خەڵکانیش بدە بۆ قسەکانیان.

١٠- خۆلادان لەوەی بەقسە دڵی خەڵك زامار بکەی، یا بەهەڵەی بخەیتەوە یا گاڵتەو گەپی پێ بکەی، یا بەشێوەیێ بێ هەست بەنەقس بکات و هەستی پێدارِوشێ، خودای گەورە لەسورەتی (البقرة)دا لەئایەتی ٨٣ دا دەفەرمووێ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا .....﴿٨٣﴾ واتە: قسەی جوان و باش لەگەڵ خەڵکانا بکەن.

١١- دەنگ بەرز نەکردن لەکاتی قسەکردندا، ئیللا بەقەدەر پێویست نەبێ، هەروەها هەڵ نەچوون و تورِەنەبوون و هاوار نەکردن وەك خوای گەورە

لەسورەتی (لقمان)دا لەئایەتی ١٩دا دەفەرمووێ ﴿وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ ١٩﴾ واتە: لەڕۆیشتندا خاوەن مەبەست بە و مام ناوەندی بە هێواش مەڕۆ گومانی خەڵكن بەریتە ئەوەی بڵێن دیارە ئەم كابرایە بەتەمای شتێكە، خێراش مەڕۆ بڵێن دیارە كەتنێكی كردووە، هەروەها دەنگت نزم كەرەوە لەئاخافتندا تا دەگاتە ئاستی پێویست، ناخۆش ترین دەنگ دەنگی گوێ درێژ.

١٢- بێ دەنگی پاراستن و ڕووگەشاوەیی و زەردەخەنەی سەرلێوان لەكاتێ قسەكردندا، عن ابی الدرداء(رضي الله عنه)قال كان رسول الله(صلی الله علیه وسلم)لا یحدث حدیثا الا تبسم..رواه احمد واتە: لەئەبو دەردائەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی پێغەمبەری خودا ﷺ هیچ قسەیەكی نەدەكرد ئیللا بەڕوێكی زەردەخەنەیی نەبێ.

واتە ئەگەر ئادەمیزاد لەناو نەفسی خۆیا بێ تاقەت بوو، یابەهۆی گیروگرفتێكی ماڵەوە ناڕەحەت بوو، ئیدی با بێ تاقەتیەكەیی و ناڕەحەتیەكەی لەڕێگەی شێوەی قسەكانیەوە، نەخاتە سەر نەفس و گیانی ئەم و ئەو ، بەڵكو بێ تاقەتی و ناڕەحەتیەكەی لادات لەكاتێكا كەلەگەڵ براكەی دەدوێ، وەك لەفەرموودەدا هاتووە دەفەرمووێ (لا تحقرن من المعروف شیئا ولو ان تلقی اخاك بوجە طلق) واتە: چاكەی كەمیش بەسووك مەگرە ئەگەر لەبرای ئیمانداریش بەڕووخۆشی و ڕووێكی گەشاوەو كراوە بیت، لەفەرموودەیێ تر هاتووە، پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ (ابتسامتك في وجە اخیك صدقة) واتە: زەردەخەنەی سەرلێوانت لەڕووی براكەی ئیماندارت خێرو صەدەقەیە.

١٣- خۆت لەقسەی جوێن و پیس و نابەجێ لابدە، لەبەر ئەوەی ئیماندار

نابێ زمانی بەجوێن و قسەی ناشیرین بکاتەوە، کەببێ بەمایەی ئازاری خەڵکان یا سووك کردنیان...عن ابی موسی(رضي الله عنه) قال (قلت یا رسول الله ﷺ اي المسلمين افضل؟ قال من سلم المسلمون من لسانه ويده)متفق عليه واته: ئەبو موسا ووتی، ووتم ئەی پێغەمبەری خوداﷺ باشترین موسڵمان کێیەو دەبێ چۆن بێ؟ فەرمووی ئەو کەسەیە کەموسڵمان لەدەست و زمانی سەلامەت بن ،ئیمامی موسلم و بوخاری ڕیوایەتیان کردووە.

١٤- خۆلادان لەسوێند خواردن لەکاتی قسەکردندا بەتایبەتی سوێند کەپێویست نەبێ وەجێگەی خۆی نەبێ و کەس داوای نەکردبێ بۆ کارێکی خێرو ئیصلاح، خودای گەورە لەسورەتی (المائدة) لەئایەتی ٨٩دا ﴿وَٱحۡفَظُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ﴾ ﴿٨٩﴾ واتە: سوێند خۆتان بپارێزن یا واتە: سوێندی بێ هودە مەخۆن، ئەگەر سوێندێکتان خوارد، وەفا بەسوێندەکە بکەن یا کەفارەتی سوێندەکە بدەن ، ئەگەر کەفارەتەکەی باشتر بوو لەبەجێ گەیاندنەکەی .

١٥- خۆلادان لەسوێند خواردن بەمەخلوق وەك پێغەمبەرﷺ بێ یا کەعبە بێ یا مەلائیکە بێ یا باوو باپیران بێ یا شەرەف و ناموس بێ ،عن ابن عمر (رضي الله عنه) عن النبی (صلی الله علیه وسلم)قال ( ان الله تعالی ینهاکم ان تحلفوا بابائکم، فمن کان حالفا فلیحلف بالله او لیصمت) خوای مەزن ئێوەی قەدەغەکردووە لەوەی سوێند بەباوو باپیرانتان بخۆن، جا ئەوەی سوێند دەخوات باسوێندەکەی بەخودا بخوات دەنا بێ دەنگ بێ .

١٦-دەم و زمانمان تەڕو پاراو کەین بەزیکرو یادی خوداو ئیستغفار کردن، بەتایبەتی گەر هەڵەیەکمان لێ ڕوویدا.

١٧- کەفارەتی مەجلیس لەیاد نەکەین، لەکاتێکدا کەدەبێتە کۆتایی مەجلیسەکان، کەمایەی کەفارەتی لەغوەکانمانەو مایەی قەبوڵ بوونی زیکرو قسە خێرەکانمانە، کەفارەتی مەجلیس بریتییە لەم ویردەی پێغەمبەرﷺ (سبحانك اللهم وبحمدك اشهد ان لا اله الا انت استغفرك واتوب اليك) واتە: پەروەردگارا، پاکی و بێ گەردی و دوور لەکەم و کوری شایەستەی تۆیە لەگەڵ هەموو حەمدو سوپاس و ستایشێك، شایەدی دەدەم کەهیچ خوداو پەرستراوێ نیە، تەنها زاتی تۆ نەبێ، داوای لێ خۆش بوونت لێ دەکەم و بۆلای تۆ دەگەڕێمەوە.

١٨-چاودێری موراقەبەی زمانمان بکەین و بیپارێزین لەقسەو وتارە حەرامەکان و ئەوانەی مایەی هەلاکەت و خەسارەت مەندی و زیانن کەبەکورتی بریتین لەم خالآنەی خوارەوە:-

أ- پێویستە زمانمان لەدرۆو قسەی پڕوپوچ و بێ بنەما بپارێزین.

ب- زمانمان دوور بگرین لەغەیبەت کردن ،غەیبەت بریتییە لەباسی کەسێکی نادیار لای کەسانێکی تر، بەشێوەیەکی وا کەپێی ناڕەحەت بێ چونکە غەیبەت قسەی پیاوی بەویقاڕو مروەت نیە.

ج- پێویستە زمانمان بپارێزین لەنەمیمی، کەبریتییە لەهێنان و بردنی قسەو ووتاری ناخۆش لەبەینی خەڵك، پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ (لا يدخل الجنة النمام) واتە: ئەوەی نەمیمی بکات ناچێتە بەهەشت .

د- خۆ دوورگرتن لە قسەو وتار مایەی خۆ هەڵکێشان بێ، یا جیدال و دەمەقاڵێ بێ سوودو ئیستفادەبێ یا خۆهاوشیتنە ناو گفتوگۆیێ مایەی سەر ئێشەو نیزاع نەبێ هیچی تیا نەبێ .

ه-باسی خۆنه‌كردن و شانازی به‌خۆنه‌كردن له‌خێروخێراتیێ كه‌ئه‌نجامت داوه، یا خۆبه‌گه‌وره ده‌رنه‌برِین و خۆبه‌چاك نه‌زانین هه‌رچه‌نده چاك و باشیش بیت، واته خۆدورگرتن له‌ریایی و روپامایی یا بلێین چاو نه‌بوون له‌ده‌ستانی خه‌ڵك بۆشتانی مه‌عنه‌وی یا ماددی (فلا تزكوا انفسكم هو اعلم بمن اتقى) النجم/٣٢ .

و- زمان پاراستن له له‌عنه‌ت كردن له‌خه‌ڵكان یا جوێن دان یا قسه‌ی ناشیرین و نادروست یا ته‌عن و په‌لار، چونكه له‌عنه‌ت و كافر كردنی كه‌سێ ئه‌گه‌ر شایسته نه‌بێ، ئه‌وه بۆسه‌ر خاوه‌نه‌كه‌ی ده‌گه‌رێته‌وه .

ز-خۆدووركرتن له‌سوحبه‌تی زۆر، كه‌خه‌ڵك و مه‌ردوومان بخه‌یته پێكه‌نین چونكه مایه‌ی دابه‌زینی حورمه‌ت و ویقارو هه‌یبه‌تی ئاده‌میزاده له‌فه‌رمووده‌دا هاتووه (ویل للذی یكذب بالحدیث، فیضحك به القوم فویل له فویل له){٤}

ح-زمان دووركرتن له‌زه‌م كردنی خه‌ڵكان یان سوك كردنی هه‌رمه‌خلوقێ تر یا دوعای خراپ كردن.

گ-گاڵته‌و فشه نه‌كردن به‌خه‌ڵك و مه‌ردوومان، به‌تایبه‌تی به‌و كه‌سانه‌ی چه‌وساوه‌و بێ هێز و نقوستانن وكه‌م نه‌كردنی رێزو حورمه‌تیان.

جا له‌كۆتاییه‌كه‌یدا فه‌رمووده‌یه‌كی پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویستتان ﷺ ده‌خه‌ینه‌وه یاد كه‌تێیدا ده‌فه‌رمووێ (من كان یؤمن بالله و الیوم الاخر فلیقل خیرا اولیصمت) متفق علیه واته: ئه‌وه‌ی ئیمانی به‌خوداو رۆژی دوایی هه‌یه، با قسه‌ی خێر بكات یانیش كرِوبێ ده‌نگ بێت.

# ئادابی ناوماڵ

ئادەمیزاد بەشێ لەکاتی ژیانی لەماڵەوە بەسەر دەبات، بەتایبەتی کاتی تیسراحەت و پشوودان لەگەڵ کەسو کارو خاوخێزانەکەی، وەیا لەگەڵ تاکەکانی خانەوادەی گرنگترین شتێ ئەنجام بدرێ لەماڵەوە بەندایەتی و عیبادەت کردنە و پێشوازی کردنە لەمیوان و و چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردنە لەگەڵ ئەندامەکانی ماڵەوەت ....ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەم لایەنەشی باس کردووە وەك هەرلایەنەکانی تری ژیان.

## هەندێ لە ئاداب و داب و نەریتی ناوماڵ

١- ناوی خودا هێنان لەکاتی گەڕانەوە ناوماڵ، بەو شێوەیەی کە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی (بسم الله ولجنا بسم الله خرجنا وعلى الله ربنا توكلنا، اللهم ربنا انا نسئلك خير المولج وخير المخرج) واتە: بەناوی خودا هاتینە ماڵەوە، وە بەناوی خودا دەرچوو بووین وەپشتمان بەستبوو بەخودای پەروەردگارمان و تەووەککولمان لەسەر وی بوو ، پەروەردگارا ئەی خوایە گیان، داوای باشترین ماڵێکت لێ دەکەین، بۆی دەگەڕێینەوە و داوای باشترین شوێنێکت لێ دەکەین کە بۆی دەردەچین.

٢- کاتێ کەگەیشتینە ناوماڵ سەلاو لەئەندامانی خانەوادەکەمان بکەین وەلەفەرموودەدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ (یابنی اذا دخلت على اهل بيتك فسلم على اهلك تكن بركة عليك وعلى اهل بيتك)رواه الترمذى واتە: ئەی ڕۆڵە ئەگەر گەڕایتەوە ماڵەوە سەلام لەکەس و کارت بکە دەبێتە

مایەی بەرەکەت بەسەر تۆ بەسەر کەس و کاری ماڵەوەتان.

ئەگەر کەس لەماڵەوە نەبوو دیسان هەرسەلام بکە بەو شێوەیە(السلام علینا وعلی عباد الله الصالحین)واتە: سەلامی خوا لەسەر خۆمان بی و لەسەر هەموو بەندە چاکە صالیحەکانی خودای گەورە بێت، وەك لەقورئاندا هاتووە فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا عَلَىٰ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً .... ﴿٦١﴾ (نور ٦١) واتە: ئەگەر چوونە ماڵێ سەلام لەنەفس و گیانی خۆتان بکەن، بەسەلامیێ لەلای خودای گەورەوە پیرۆزو موبارەك و پاك و پوختە بیێ.

٣- نەکەیت لەناکاو بچێتە ماڵەوە بەبێ لەدەرگادان یا بەبێ ئاگادار کردنەوەیان .

٤- هەست کردن بەچاودێرێتی و موراقەبەی خودا لەکاتی تەنهایی خۆلادان لەگوناه و تاوان لەکاتی تەنهایی کەلەماڵەوەین.

٥- دەنگ بەرزنەکردنەوە هەڵپە هەلپ نەکردن و یاری و گەپ ئەنجام نەدان بەشێوەیێ وا کەئەندامەکانی ماڵەوە یا دراوسێ ئیزعاج بکات و بێزاریان بکات، یا دەنگ بەرزنەکردنی ڕادیۆو تەلەفزیۆن و تسجیل و C.D و شتی تر کەدەبێتە مایەی بێزارکردنی کەسانی تری ماڵەوە .

٦- خۆلادان لەگوێ گرتن یا تەماشاکردنێ شتێ کەشایستەو لایەقی ئادەمیزادی موسڵمان نەبێ، چونکە چاوو گوێ و دڵ و گشتیان بەرپرسیارن، وەك خودای گەورە لەسورەتی (الاسراء)دا لەئایەتی ٣٦دا دەفەرمووێ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَٰئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا ﴿٣٦﴾.

٧- حیسابێ بۆ حەیاو حورمەتمان بکەین، بەداپۆشینی عەورەت

به‌تايبه‌تی له‌كاتی جل و به‌رگ گۆڕینداو له‌كاتی خۆ پاك كردنه‌وه‌دا، موراعاتی ئه‌ده‌ب و ویقار بكه‌ین له‌كاتی دانیشتن و نوستن، چاو داگرتن له‌ته‌ماشاكردنی عه‌وره‌تی ئه‌وانی تر، له‌فه‌رموده‌دا هاتووه پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌فه‌رمووێ (نهیت ان امشی عریانا) رواه الطبرانی واته: لێمان یاساغ و قه‌ده‌غ كراوه به‌ڕووتی هاتو چۆ بكه‌ین.

٨- ڕازی بوون به‌وبه‌ش و باره‌ی یا به‌و جێگه‌و مه‌كانه‌ی كه‌خودای گه‌وره بۆی قسمه‌ت كردووین، بیركردنه‌وه له‌حاڵی كه‌سانێ تر كه‌بێ جێگه‌و ڕێگه‌ن، شتێكی وایان نیه له سه‌رماوگه‌رما خۆ بپارێزن، له‌عبدالله ی كوڕی عومه‌ر(ڕه‌زای خوای لێ بێ)فه‌رموویه‌تی پێغه‌مبه‌ر ﷺ كاتێ كه‌به‌ڕۆژ ده‌گه‌ڕایه‌وه ماڵه‌وه ده‌ی فه‌رموو (الحمدالله الذی كفانی وآوانی الحمدلله الذی اطعمنی وسقانی ومن علی اسئلك ان تجیرنی من النار)رواه ان السنی واته: حه‌مدو ستایش بۆ ئه‌وزاته‌ی پێداویستی ژیانمانی داوه جێگه‌و ڕێگه‌ی بۆ كردمه‌وه حه‌مدو ستایش بۆ ئه‌و خودایه‌ی خواردنه‌وه‌ی پێ به‌خشیم، به‌ش و باری زۆری له‌نیعمه‌ت پێدام و منه‌تی خستمه سه‌رما ،خوایه گیان داوای ئه‌وه‌ت لێ ده‌كه‌م كه‌بم پارێزی له‌ئاگری جه‌هه‌نده‌ما.

٩- ڕێكخستنی كه‌ل و په‌لی ناوماڵ وه‌پاراستنیان و پاك و خاوێن ڕاگرتنیان، هه‌روه‌ها چاك كردنی ئه‌و شوێنانه‌ی كه‌پێویستیان به‌چاك كردن هه‌یه له‌ماڵه‌وه به‌قه‌ده‌ر توانا، وه‌ك چاكردنی باخچه‌و حه‌دیقه ئه‌گه‌ر هه‌بێ وه‌ك چاككردنه‌وه‌ی په‌نجه‌ره ئه‌گه‌ر شكابێ، حه‌نه‌فی و به‌لوعه‌و تاق و دیوار یاهه‌رشتێكی تری ماڵه‌وه بێ.

١٠- هه‌وڵدان بۆبه‌ڕێ بردن و ئه‌نجامدانی كاری ماڵه‌وه ویارمه‌تی دانیان،

له ئەسوەدى كورِى يەزيدەوە ووتى پرسيارم لەعائيشه كرد پێغەمبەرﷺ چى دەكرد لەماڵەوە؟ فەرمووى لەيارمەتى دانى كارى خێزانەكانى بوو و ئەگەر كاتى نوێژ بهاتبايه دەردەچوو بۆ نوێژ.

رواه البخارى عن الاسود بن يزد قال (سئلت عائشة (رضي الله عنها) ماكان النبى ﷺ يصنع فى بيته؟ قالت كان يكون في مهمة اهله يعنى خدمة اهله، فاذا حضرت الصلاة خرج الى الصلاة)رواه البخارى .

١١-پاراستنى نهێنى ماڵەوە و نەدركاندنى لاى هيچ كەسێ.

١٢-رِوخسەت وەرگرتن و سەلام كردن لەكاتى دەرچوون لەماڵەوە داوالێ كردنيان كەچيتان پێويست و گەرەكە و پێ رِاگەياندنيان كەوا دەچم بۆ فلان شوێن.

١٣-دووبارە كردنەوەى دوعاى دەرچوون لەماڵەوە عن ام سلمة(رضى الله عنها)ان النبى(صلى الله عليه وسلم)كان اذا خرج من بيته قال(بسم الله توكلت على الله اللهم انى اعوذبك ان اضل او اضل او اظلم او اظلم او اجهل او يجهل على بسم الله توكلت على، الله ولا حول ولاقوة الا بالله).

## ئادابى رۆڵە لەگەڵ دايك و باوكيدا

خواى گەورە پاش پەرستنى خۆى رێز لە هيچ شتێكى يا كەسانێكى وەك رێزى دايك و باوك دانەناوە ،خواى شكۆمەندو ئازيز دەفەرمووێ ﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا﴾ (النساء ٣٦) واتە: بەندايەتى خودا بكەن و بيپەرستن و هيچ هاوەڵ و شەريكى بۆ برِيار مەدەن وە لەگەڵ دايك و باوكتانا چاك و باش بن.

دەفەرمووێت (سبحانه وتعالى) (ان اشكر لى ولوالديك الى المصير)لقمان ١٤...واتە:سوپاس و ستايشى من بكەن پاشان ئى دايك و باوك، بزانن چارەنووس و سەرەنجامتان بۆلاى منە، پێغەمبەرﷺ فەرموويەتى (الكبائر الاشراك بالله وعقوق الوالدين وقتل النفس واليمين الغموس) رواه البخارى واتە: گوناهە گەورەكان ئەمانەن هاوەڵ برِياردان بۆ خوداى پاكى تاكى مەزن، ئازارو ئەشكەنجەدانى دايك و باوك، كوشتنى ئادەميزاد بەناهەق، سوێندو قەسەمى بەدرۆ.

## چەند داب و نەريتێ لەگەڵ دايك و باوكدا

١-خواى گەورە فەرمانى باش و چاك بوون و چاكە كردنى پێ كردوين لەگەل دايك و باوكدا، جا پێويستە زۆر چاك و باشيش لەگەليانا رەفتار بكەين ..ئەبو هورەيرە دەگێرێتەوە پياوێك هاتە لاى پێغەمبەر ﷺ ووتى ئەى پێغەمبەرى خودا كێ لەهەموو كەس لەپێشترو باشترە لەگەليدا باش و چاك

بم؟ فەرمووی دایكت و پاشان دایكت پاشان دایكت پاشان باوكت، پاشان لەوان خوارترو لەوان خوارتر عن ابی هریرە (جاء رجل الی رسول الله ﷺ فقال یارسول الله من احق الناس بحسن الصحبة :قال امك ثم امك، ثم امك اباك ثم ادناك ثم ادناك ..)متفق علیه .

٢-كاتی گەرانەوە مال و دەرچوونی سەلامیان لیّ بكەودەستیان ماچ بكە، بەروویكی خۆش لەگەلیان شیرین رەفتاربە.

٣- بەریزەوە سەیریان بكەو لەبەریان هەستەوە، كاتیّ كەدەگەریّتەوە مال یا كە دەردەچی.

٤- بەئەدەبەوە لەگەلیانا قسە بكەو وتارت نەرم و نیان بیّ، دەنگ بەسەریان بەرز نەكەیتەوە.

گویّ رایەلیان بكەولە ئەمرو فەرمانیان دەرمەچوو، ئەگەر داوای لەخوا یاخی بوونت لیّ بكەن بەقسەیان مەكە، چونكە خوای بالادەست دەفەرموویّت ﴿وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾﴾ (لقمان ١٥) واتە : ئەگەر زۆریان لیّ كردی كەشەریك و هاوەلم بۆ بریار بدەن، گویّ رایەلیان مەكەو لەژیاندا بەباشی هاوریّیەتیان بكەو مامەلەیان لەگەلدا ئەنجام بدە، شویّنی خواپەرستان بكەوە، شویّن پیّیان هەلگرە پاشان بۆ لای من دەگەریّنەوە، هەموو كردەوەكانی ئەنجام دراوتان پیّ رادەگەیەنمەوە بەو شیّوە مامەلەتان لەگەلا دەكەین.

٥- لەهەولی ئەوە دابە كەدلیان زۆر خۆش بكەیت و حالی یان بكەیت و

کەزۆرت خۆش دەوێن، لەرێگەی شیرین رەفتار و کۆمەك و دل رازی کردنیان و دیاری و بەخشش پێ بەخشینیان هەمیشە جێگەی چاو روونیان بێت .

٦- سەروەت و سامان و کەل و پەلیان بەبێ مۆلەت و ئیزن وەرگـرتن لێ یان دەست کاری مەکەو بۆیان بپارێزە هەمیشە بەتەنگی بەرژەوەندیانەوە بە .

٧- رێزو حورمەتیان رەچـاو بکـە، ناوبـانگی و شـورەتیان بپـارێزە ،بـا بەهۆی تۆوە قسەی نارێك و ناشیرینیان نەدرێتە پال تۆمەتیان و نەخرێتە سەرو بێ حورمەت نەکرێن .

لە (عبداللە)ی کوری ئیمامی عومەر (رەزای خـوای لێ بـێ) دەگێرنـەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: یەکێك لەگوناهە گەورەکان ئەوەیە کەسێك جنێو بەباوك و دایکی خۆی بدات، وتیان کێ هەیـە جنێـو بـەدایك و بـاوکی خـۆی بدات؟ فەرمووی جنێو بەباوکی خەلك دەدات ئەوانیش جنێو بـەباوکی دەدات، جنێو بەدایکی خـەلکی دەدەن ئـەوانیش جنێـو بـەدایکی دەدەن (دەقـی ئـەو فەرموودەیە کەموسلم و بوخاری ریوایەتیان کردووە) .

٨- لەکاتی نووستن و خەوتن پشوودانـدا، بێزاریان مەکەن بەبێ مۆلـەت، مەچۆرە ژووری خەوتن و نووستنیانەوە.

٩-قسـەیان پێ مەبرە و گالتەیان پێ مەکە، لەبەر دەمیـان بەشـێوەیەکی بێ ئەدەبی و ناشیرین قاقاو پێکەنین مەکە.

١٠- لەقسان پێشیان مەکەوە، مەگەر بەمۆلەت وەرگرتنیان بێ بۆکـاری زۆر پێویست و گرنگ .

١١- لەهاتنە ژوورەوەو رۆیشتن و دەرچوونا بە پێشیان مەکـەوە، لـەپێش ئەوانیش دا دامەنیشە، هەردەم ئاگات لەرێزو حورمەتیان بێ .

١٢- به‌شێوه‌یكی بێ ئه‌ده‌بانه لاق و پێ رامه‌كێشه له‌روویانه‌وه، هه‌روه‌ها پال مه‌ده‌وه .

١٣- له‌ئیش و كاروباره‌كانی ژیانتدا ته‌كبیرو راوێژیان پێ بكه‌و سوود له‌راو له‌زانین و ئامۆژگاره‌كانیان وه‌ربگره .

١٤- فه‌رامۆشیان نه‌كه‌ین له‌زۆر دوعای خێر، له‌خوای گه‌وره نزا بكه كه‌لێیان خۆش بێت و پاداشتی چاكه‌كانیان بداته‌وه، چاو پۆشی له‌هه‌له‌و تاوانه‌كانیان بكات .

١٥- ئه‌گه‌ر مرد بوون یا مال ئاواییان له‌دونیا كرد، سه‌ردانی گۆره‌كانیان بكه‌و ره‌حمه‌تیان بۆ بنێره‌و به چاكه و خێر باسیان بكه‌و یادیان بكه‌وه .

١٦- له‌پاش مردنیان وه‌سیه‌ته‌كانیان فه‌رامۆش مه‌كه‌و به‌جێ بگه‌ینه‌و هاتوو چۆی خزمه‌كانیان بكه‌و قه‌تعی ره‌حم له‌گه‌لیانا مه‌كه، مالیكی كوری ره‌بیعه ساعیدی (ره‌زای خوای لێ بێ) ده‌گێرێته‌وه ده‌فه‌رمووێ ئێمه لای پێغه‌مبه‌ر بووین ﷺ پیاوێك له‌خێلی سه‌لمه هات و ووتی ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خودا هیچ چاكه‌و خێرێك ماوه له‌پاش مردنیان بۆ دایك و باوكمی بكه‌م ؟فه‌رمووی به‌لێ زۆر بۆیان بپارێره‌وه و دوعایان بۆ بكه، په‌یمانه‌كانیان و عه‌هده‌كانیان به‌جێ بگه‌ینه‌و ،له‌پاش مردنیان سه‌ردانی كه‌س و كاره‌كانیان بكه‌و رێزی هاوه‌ل و دۆسته‌كانیان بگره) ئیمامی ئه‌بو داود گێراویه‌تیه‌وه .

١٧- خۆت دوور بگره له‌وه‌ی ئازاری به‌ده‌نیان بده‌یت راسته‌وخۆ، و یان ئازاری ده‌روونیان بده‌یت به‌ئاخ و ئۆف ،وه‌ك خودای گه‌وره ئامۆژگاریمان ﴿فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾﴾ (الاسراء ٢٣) واته: له‌روویانا به‌ناره‌زای دل نه‌لێ ی ئۆف یان ئاخ، له‌روویانا هه‌لمه‌گه‌رێوه، تێیان

هەلمەدە بەلكو بەرێزو بەنەرمی قسەیان لەگەل بكە شیرین رەفتار بە لەگـەلیانا ..ئیمامی عـەلی رەزای خوای لیّ بیّ دەفەرموویّت ئەگەر لەووشەی ئۆف كەمتر هەبوایە، لەئازار دانی دلی دایك و باوكا ئەوە خودای گەورە، ئەویـشی حـەرام دەكرد .

١٨- لەكاتی قسە لەگەل كردنیانا شەرمیان لیّ بكەولە ئاستیاندا دەنـگ بەرز مەكەوە، بیّ ریّزی و بیّ حورمەتی مەنویّنە .

## داب و نەریت لەگەل براو خوشكدا

براو خوشك لەخیّزانیّكدا بەرهەمی باوك و دایكن و نزیكترین كەسـانیّكن لەئاست یەكترەوە، وەك خوای گەورە و بالادەست دەفـەرمووێ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰ أَبْصَارَهُمْ ﴿٢٣﴾ (محمد ٢٢-٢٣) واتـە: سـەیرەو جیّگـەی سەرسورمانە :چاوەریّ ی ئەوە لەئیوە دەكریّ ئەگەر پشتیان لەئیسلام هـەلكرد دەس بكەن بەخراپەو پـشیّوی لـەوولاّت و ریـشەی خزمەتایـەتی بپـچرِن، جـا كۆمەلیّ وەها دوودلّ و دلّ پیس بن هەمیشە مەترسی ئەوەیان لیّ بكریّ كەلـە ئیسلام هەلّگەرِیّنەوەو دەست بكەن بەخراپە كردن ئەوانە خودا لەرِەحمەتی خۆی دووری خستونەتەوە گویّی كەرِ كردوون لەبیستنی حەق و چاوی كـویّر كـردوون لەتەماشاكردنی ئایەتەكانی خودا.

هەندیّ خالّ لەبارەی داب و نەریتی خوشك و برا وەچۆنیەتی رِەفتـاركردن لەگەلّیانا

١-ڕێزو ئیحترامی بــرا گــەورەکانت بگــرە و ســۆزو بــەزەییت بەرامبــەر بەبچوکەکان هەبێ و میهرەبان بە لەئاســتیانا، پێغەمبــەر ﷺ فەرموویــەتی (لیس منا من لم یرحم صغیرنا ویوقر کبیرنا) رواه الترمذی واتە: ئــەوەی ســۆزو ڕەحم و میهرەبانی نەبێت لەئاست بچوکەکانمان و ڕێــزو حورمــەتی بەتەمــەن و گەورەکانمان نەگرێت لەئێمە نیە.

لەبەرامبــەر خوشــك و براکانتــدا خورەوشــت جــوان بــی، لــووت بــەرزی مەنوێنەو خۆت بەکەم بزانە و لەکارو شتی باش پشت گوێیان مەخــەو بــەش و باری باشیان بۆ دابنێ ،لەگەڵیاندا نەرم و نیان بە.

٣-کاتێ کەپێیان دەگەیتەوە بەگەرمی سلاویان لێ بکە و دۆقەیان لەگەڵ بکە، ئەحواڵیان بپرسە بەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستیەوە ....ئەبو

زەڕی غەفاری خــوای لێ ڕازی بێــت دەگێڕێتــەوە کــە پێغەمبــەر ﷺ فەرموویەتی (لاتحقرن من المعروف شیئا ولـو ان تلقـی اخـاك بوجـه طلـق) رواه مــسلم، واتە: هیچ چاکەیەك بەکەم مەگرن تەنانەت ئەگــەر بــەڕوێکی خــۆش و گەشاوەش بەبراکەت بگەیت جا برای ئایینی بێ یابرای دایك و باوکی بێ .

٤-ڕەچــاوی هەســت و هۆشــیان بکــەن، ئەگــەر غــەمگین بــوون خۆشــی دەرمەبڕە، بەڵکو هەوڵی لابردنی غەمەکانیان بدە ، ئەگەر بەڕۆژوو بوون شت

مه‌خۆ له‌به‌ر چاویان ، وه‌ئه‌گه‌ر نوستــت بــوون ده‌نــگ مه‌كــه هه‌ســتیان دامه‌ڕوشێنه‌و ڕه‌چاوی مه‌صله‌حه‌تی ماددی و مه‌عنه‌ویان بكه‌.

٥-له‌قولاّیی دلّته‌وه خێرو چاكه‌ت بۆیان بــوێ، هه‌ولّبــده خــۆش حالّیــان بكه‌یت، پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رمووێت (لا یؤمن احدكم حتی یحب لاخیه مایحب لنفسه)متفق علیه واته: هیچ كه‌سێ له‌ئێوه ئیمانی ته‌واو نابێت، تاكو چی

بۆخۆی پێ خۆشه، ئه‌ویشی بۆ براكه‌ی پێ خۆش نه‌بێ .

٦-ئه‌گه‌ر چاكه‌یان له‌گه‌لّ كردی سفلّه مه‌به‌و پێزانینی خۆت بۆیان ده‌ربخه سوپاسیان بكه، هه‌ولّبده به‌شێوه‌یه‌كی چاكترو باشتر پاداشتیان بده‌یته‌وه.

٧-گرنگی به‌هیواو مه‌به‌سته‌كانیان بده و ژیان و گوزه‌رانیان به‌ســه‌ربكه‌وه و تاده‌توانی كۆمه‌ك و یارمه‌تیان بده، جا به‌پاره‌و پول بێ یا زانیــاری و علــوم بێ یا هه‌رپێویستیه‌كی تربێ .

٨-تا ده‌توانی ئامۆژگاری خێرو چــاكه‌یان بكــه و، به‌شــێوازێكی چــاك و باش بیریــان بخــه‌وه كه‌فه‌رمانــه‌كانی خــوای گــه‌وره بــه‌جێ بهێــنن و پــه‌یمان و هه‌ڕه‌شه‌كانی خودایان به بیربێننه‌وه، هه‌روه‌ك خــودای شــكۆمه‌ند ده‌فــه‌رمووێت وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصۡطَبِرۡ عَلَيۡهَا ﴿١٣٢﴾ (طه ١٣٢) واته: فه‌رمان به‌ئه‌هله‌كه‌ت بكه نوێژ بكه‌ن و صه‌بری له‌سه‌ر بگرن و خۆیان له‌سه‌ر ڕابێنن .

٩-ئه‌گه‌ر له‌سه‌ر ڕاستی و حــه‌ق بــوون یارمــه‌تیان بــده، ئه‌گــه‌ر له‌ســه‌ر

حەقیش نەبوون، بەشێوەیەكی جوان و نەرم و نیان حەقیان بۆڕوون بكەوەو ڕێـزو حورمەتیان بپارێزە.

١٠-لەكاتێكدا كەهەڵەیان لێ ڕوودەدات، گیانی چـاوو پۆشـینت هـەبێ لەئاستیانا و لێیان ببووره ئەگەر عوزرو بیانویان هێناوه لەئاسـت هەڵـەكانیان ...ئەگەرنا هەڵەكانیان بەنەرمی و بەمانای ڕەحمەوه بۆیان ڕوون بكەوه .

١١- ئەگەر لەگەڵ یەكا زویر بوون هەوڵی ئاشت بوونەوەیان بـده نەكـەی قسه لەنێوانیاندا بهێنـی و ببـەیت یـا لەپاشـا ملـه قـسەیان پـێ بڵێیـت یـا حەسودیان پێ ببەیت و بەرامبەریان بەد گومان بیت .

١٢-خۆت لەجیاوازی دەربڕین یا دەرخستن و دووبـەرەكی و زۆر گفتوگـۆ كردن دوور بگره و خۆت بپارێزه لەكارز باری بێ سوود لەگەڵیانا.

١٣-كەل و پەلەكانیان بەكار مەهێنـه بـەبێ مۆڵـەت وەرگـرتن لێیـان، ڕەچاوی مەصـلەحەتیان بكـەو و خـۆت لـەكاره تایبەتـەكانی خۆیانیـان هـەڵ مەقورتێنه.

١٤-لەقسه لەگەڵ كردنیانا بەشەرم و حورمـەت بـە، هـەروەها لـەجل و بەرگ لەبەر كردندا بەتایبەتی لەئاست خوشكەكاندا چاویان لێ بپارێزەو كـەم و كورتی هەڵەكانیان بەدەر مەخه بەڵكو بۆیان بپۆشه .

## داب و نه‌ریتی ڕێگاوبان :

ڕێگاوبان و بازاڕه‌كان جێگه‌و شوێنی گشتین و خه‌ڵكی جاروبار ناچاری تیا ڕۆیشتن و وه‌ستان ده‌بێ ئاده‌میزادی ئیماندار ده‌بێ مانای ئیمانی خۆی و كه‌سایه‌تی خۆی تێیدا بپارێزێ و هه‌ڵسوكه‌تی ئیماندارانه‌و ڕه‌وشتی به‌رزی جوان بنوێنی و خه‌ڵكانیش به‌كارو كرده‌وه ئاماژه بكات بۆ هه‌ڵسوكه‌وتانی چاك و باش و به‌پێز، و خودای شكۆمه‌ندو ئازیز له‌باره‌ی به‌نده‌كانیه‌وه ده‌فه‌رمووێ ﴿وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا ۝٦٣﴾ (سوره‌تی الفوقان ٦٣) واته: به‌نده ڕاست و دروسته‌كانی خودای میهره‌بان ئه‌وانه‌ن كه‌زۆر به‌هێمنی و هۆشیارانه به‌سه‌ر زه‌ویدا ده‌ڕۆن وه‌ئه‌گه‌ر كۆڵه‌واران و بێ ئاگایان و نه‌زانانیش له‌گه‌ڵیانا كه‌وتنه وتارو هه‌ڵس و كه‌وت ئه‌وه ئه‌وان به‌بانگه‌وازه شیرینه ئاشتی خوازه‌كه‌ی خۆیانا ڕه‌فتارو كردار ئه‌نجام ده‌ده‌ن له‌گه‌ڵیانا.

## ئه‌م خالانه‌ش هه‌ندێ له‌داب و نه‌ریته‌كانی ڕێگاوبانن

١- چاوو دیده‌كانت دوور بگره له‌حه‌رام و بیانپارێزه له‌كردارو هه‌ڵس و كه‌وت و له‌جل و به‌رگی خه‌ڵكانی تر سه‌رنج مه‌گره چ به‌وتار چ به‌كردار تێكه‌ڵی كارانێك مه‌به كه‌په‌یوه‌ندی به‌تۆوه نیه.

٢- له‌سه‌ر شه‌قام و كۆڵان و به‌ردوكان و جێگای هاتوو چۆكردنی خه‌ڵك و تێپه‌ڕبوونیان دامه‌نیشه، یا ڕامه‌وه‌سته به‌بێ ئیش و كار.

٣- ڕووت گه‌شاوه‌و خۆش بێ له‌ئاست خه‌ڵك و مه‌ردوومان به‌ڕێزه‌وه

سلاۆیان لیٚ بكه و وه‌ئه‌گه‌ر سلاۆیان لیٚ كردی به‌باشترین شیٚوه وه‌لاٚمیان بده‌ره‌وه.

ئه‌بو سه‌عید خوای لیٚ ڕازی بیٚ له پیٚغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ بۆمان ده‌گیٚڕیٚته‌وه كه‌فه‌رموویه‌تی له‌سه‌ر ڕیٚگاو بانه‌كانا ڕامه‌وه‌ستن و دامه‌نیشن و ئاگادارین .ووتیان چارمان نیه چونكه جاروایه لیٚی داده‌نیشین تیٚیدا ده‌كه‌وینه گفتوگۆ! ئه‌ویش فه‌رمووی (ئه‌گه‌ر هه‌ر ناچارو پیٚویست بوون ئه‌وا ماف و حه‌قی ڕیٚگه بپاریٚزن؟! ووتیان ماف و حه‌قی ڕیٚگه چیه؟فه‌رمووی سه‌یری حه‌ڕام نه‌كردنه چاو پاراستنه، وه‌ستانه‌كه‌تان مایه‌ی ئازاری كه‌سی تیا نه‌بیٚ یا ئازاری كه‌سی تیا نه‌ده‌ن، وه‌لاٚمی سه‌لام به‌چاكی بده‌نه‌وه فه‌رمان بكه‌ن به‌چاكه‌و قه‌ده‌غه و به‌رگری بكه‌ن له‌خراپه)ئه‌وه كوردیه‌كه‌ی ئه‌و فه‌رموده‌یه كه موسلم و بوخاری گیٚڕاویانه‌ته‌وه.

٤- پاك و خاویٚنی ڕیٚگاو بان بپاریٚزه ،پاشماوه‌و به‌رماوه‌ی خوارده‌مه‌نی له‌سه‌ر ڕیٚگه‌و شویٚنی خه‌لك و مه‌ردووم مه‌هاویٚژه و فریٚ مه‌ده.

٥- له‌سه‌ر ڕیٚگاو شه‌قامه‌كاندا خه‌لك و مه‌ردووم ئازار مه‌ده، شوشه‌ی شكاو و به‌ردو داری بیٚ سه‌رو به‌رو بزمارو قۆدی و ته‌نه‌كان فریٚ مه‌ده‌و بلاو مه‌كه‌ره‌وه نه‌وه‌ك كه‌سیٚك پیٚیوه بكه‌وته نارحه‌تیه‌وه، به‌هۆیه‌وه به‌ربیٚته‌وه یا ئازار ببینیٚ، پیٚغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی (الایمان بضع و سبعون شعبة افضلها قول لا اله الا الله وادناها اماطة الاذی عن الطریق والحیاء شعبة الایمان) متفق علیه واته :ئیمان حه‌فتاو ئه‌وه‌نده پۆله‌یه باشترینیان و گه‌وره‌ترینیان (لا اله الا الله) یه نزمترینیان یا بچوكترینیان لابردنی نارحه‌تی و ئه‌زیه‌تی سه‌ر ڕیٚگاو بانه، شه‌رم و حه‌یاش پۆلیٚكه له‌ئیمان .

٦- كۆمه‌كی یارمه‌تی غه‌ریبان و لیٚ قه‌ماوان بده‌و یارمه‌تی هه‌ژاران و نه‌دارو ده‌ست كورته‌كان بكه‌، ده‌ستی پیاوی كویٚر بگره‌و بیپه‌ریٚنه‌وه‌ تابۆت ده‌كریٚ له‌كاری ئیصلاحی و چاكردن دابه‌، به‌هانای بیٚ ده‌سه‌لات و بیٚ هیٚزه‌كانه‌وه‌ بچیت كه‌له‌ریٚگاو شه‌قامه‌كاندا لیٚ ی راست دیٚیت.

٧- خۆت بپاریٚزه‌و دوور بگره‌ له‌ ریٚگه‌ی قه‌ره‌بالغ و بازاره‌ چرو پره‌كان له‌ ئاده‌میزاد و كه‌ل و په‌ل، به‌تایبه‌تی ئه‌و شویٚنانه‌ی كه‌كاری نادروست وحه‌رامی تیادا روووده‌دات، عومه‌ری كوری خه‌تاب (ره‌زای خوای لیٚ بیٚ) ده‌گیٚریٚته‌وه‌ پیٚغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی ئه‌وه‌ی بچیٚته‌ بازار بلیٚ (لا اله الا الله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمد يحيى ويميت وهو حي لايموت بيده الخير وهو على كل شيء قدير) خودای بالاده‌ست هه‌زار چاكه‌ی بۆ ده‌نووسیٚ و هه‌زار گوناهیشی بۆ ره‌ش ده‌كاته‌وه‌ و هه‌زار هه‌زار پله‌ به‌رزی ده‌كاته‌وه‌ وه‌ كۆشكیٚكی له‌به‌هه‌شت بۆ دروست ده‌كات) رواه الحاكم .

ئه‌وه‌ی شایانی باس بیٚ بازار جیٚگه‌ی خیانه‌ت و قۆل برین و فرت و فیٚل و درۆو ته‌ماعی یه‌، هه‌ریه‌كیٚ له‌بازار خودای له‌یاد بیٚ، خه‌لكان له‌شه‌رو گیٚچه‌ل و ده‌ست و زمانی ئه‌مین و سه‌لامه‌ت ده‌بن، به‌لام ئه‌گه‌ر كه‌وته‌ غه‌فله‌ته‌وه‌ ئیدی ده‌بیٚته‌ دار ده‌ستی شه‌یتانه‌كان قورو چلپاوه‌كه‌ تیر تر ده‌كات .

٨- له‌رۆیشتندا تا بۆت ده‌كریٚ سه‌یری به‌ر پیٚ ی خۆت بكه‌و زۆر به‌م لاو ئه‌ولا مه‌روانه‌ به‌بیٚ ئیستفاده‌، با قاچه‌كانت به‌ر به‌رزایی و نزمایی دانه‌كه‌ویٚ تووشی زیان و ئازارو به‌ربوونه‌وه‌ ببیت یاقاچت له‌قاچی كه‌سانی تر كه‌ویٚ و خۆت و خه‌لكان تووشی ئازار كه‌یت .

٩- خۆپاراستن له‌په‌رینه‌وه‌ تا دلنیا نه‌بیت له‌چۆلیٚ ریٚگاو شه‌قامه‌كان له‌

ئۆتۆمبێـل و عاره‌بانــه و پایــسكل و نه‌په‌ریتــه‌وه تــا زه‌مانــه‌تی ســه‌لامه‌تی بكه‌یت، جارێكیان پایسكل له‌ئافره‌تێكی دا بوو، له‌كابرای پایسكل هاژوه‌ریان پرسی، ئه‌وه بۆچی لێتدا؟ وتی بابه كه‌س حیسابێك بۆئیمه ناكات له‌په‌رینــه‌وه و رێگــاو بانه‌كانــدا، بــه‌س عه‌قلیــه‌ت و زه‌ینــی ئێمــه لــه ئارادایــه ،كه‌چــی له‌سه‌یاره‌و ئۆتۆمبێلدا عه‌قلیه‌ت و زه‌ینی شوفێره‌كه و خــه‌لكان لــه‌ئارادان بــۆ سه‌لامه‌تیان .

١٠- له‌و جێگایانه‌دا بپه‌رێره‌وه كــه دیــارو نیــشان كــراون، تایبــه‌تن بــۆ په‌رینه‌وه، تاكو سه‌لامه‌تی و ساغی باشترو زیاتر دابین و مسۆگه‌ر بكه‌یت .

١١- له‌كاتی رۆیشتندا هێمن و ئارام به و به‌په‌له و خێرا مه‌به‌و هه‌روه‌ها خۆ بــه‌زل زانــین و لــوت بــه‌رزی به‌رۆیــشتنه‌كه‌ته‌وه دیــار نــه‌بێ ،وه‌ك خــودای شكۆمه‌ندو ئازیز ده‌فه‌رموێت ﴿وَٱقْصِدْ فِي مَشْيِكَ ....﴾ (لقمان ١٩)، له‌ســه‌ر زوبانی حه‌زره‌تی لوقمان به ئامۆژگاری بۆ رۆله‌كــه‌ی پــێ ی ده‌فــه‌رموێ (لــه رێگادا میانڕه‌وبه).

هه‌روه‌ها خودای گــه‌وره له‌ســوره‌تی دا ده‌فــه‌رموێ ﴿وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا﴾ (اسراء ٣٧) واتــــه: له‌سه‌ر زه‌ویدا به‌روح گه‌وره‌یی و ته‌كه‌ببوره‌وه مه‌رۆ؟! خــۆ تــۆ هــه‌رگیز زه‌ویــت خه‌رق نه‌كردووه وه‌له‌به‌رزی و بالاشدا هه‌رگیز ناگه‌یت به‌كێو و شاخه‌كان .

١٢- ئه‌گــه‌ر كاغــه‌زێك نــاوی خــودای لێ نووســرابوو له‌ســه‌ره رێگــاش كه‌وتبوو ئه‌وه هه‌لیگره‌وه، له‌شوێنێكی شیاوی خۆی دایبنــێ هــه‌روه‌ها ئه‌گــه‌ر پارچه نانێ كه‌وتبێت .

١٣- له‌رێگادا یا له‌سه‌ر شه‌قامه‌كاندا له‌به‌ر چاوی خه‌لك و مه‌ردوومان‌دا

چێشت مەخۆ، یانان مەخۆ یا هەر شتێكی تربێ .

١٤- دوور بكەوە لەیاری كردن و كات و وەخت بەفیرۆدان بەگالتەو گەپ و دەستە گەمەو سوعبەت یابلیاردو فیشەو دامەو دۆمینە .

١٥- لەكاتی مامەلەو كرین و فرۆشتن دا شیرین رەفتار بەو دەنگت زۆر بەرز نەكەیتەوە مامەلەو و كارو كردەوەی خەڵك شەپرێوی تێ نەخەیت، مامەلەت ساكارو نەرم و نیان بێ .

١٦- بەدەست هێنان و قۆستنەوەی ئەوكاتانەی كە بەرێگاوەیت بەوەی زیكرو یادی خودای تیا بكەیت و سەلاوات لێ بدەیت، ئایەتی دووبارە بخەیتەوە یادت لەوەی لەبەرت كردووە، یانیش بیر كردنەوە لەئایەت و نیشانەكانی بەرفراوان و بێ سنووری خودای بالادەست و شكۆمەند .

# داب و نەریتی خوێندن و خوێندنگا

لەئایینی پیرۆزی ئیسلامدا خوێندن و خوێندنەوە گەلێ پیرۆزو بایەخدارە ،دەرگای چوونە ژوورەوەی دونیای خودا ناسینە ،یەکەم ووشەی کەلەئاسماندا دابەزی بێ لەقورئانی پیرۆزدا (اقراء) بووە واتە بخوێنە، خوێندنێك بەناوی پەروەردگاری بەدیهینەرو خالیق و جوان کار ،خوێندنێك بەنیەتی شارەزابوون بێ لەخێرو بەهرەو بەر چەنگ هێنانیان بێ، خزمەت پێ کردنی کۆمەڵ و کرمەڵگابێ، پێغەمبەر هەربەم نیەتانەوە زۆر گرنگی داوە بەزانستو سوود لێ وەرگرتنیان، فێربوونی زانست و زانیاری بەفەرزو ئەرکی سەرشانی موسڵمانانی داناوە، بەفێربوونی زانیاری زانست و سوود لێ وەرگرتنیان هەر لەسەرەتای تەمەن دەست پێ دەکات تاماڵ ئاوایی کردن لەدونیا، چونکە ئادەمیزاد لەهەموو قۆناغەکانی ژیانیدا، بێ زانست و زانیاری ناتوانێ بەبەختەوەری بژیێ، زانست و زانیاری خۆراکی گیانین، گرنگترین شتێ کەمنداڵی لەسەر ڕابهێنرێت لەبەرکردنی قسەی خودایە کە قورئانی پیرۆزە، ئادەمیزاد ئەو کاتانەی کەلەدەرس و دیراسەدا بەسەر دەبات، پێویستی بەچەندین ڕەوشتی شیرین و بەرز هەیە، کەفێری ببێ و بیکات بەکالاو بالای خۆی، تا دڵی مامۆستاو دۆستان و نزیکانی خۆی ڕابگرێت و شادیان بکات، بەرامبەر ئەوەش خۆشی ببێ بەخاوەن ڕێزو قەدرێ لەناویاندا .

## هه‌ندێ خاڵ له‌ڕه‌وشتی جوانی قوتابی له خوێندگا

گرنگی دان به‌پاك و خاوێنی و كات له‌ده‌ست نه‌دان، به‌وه‌ی كه‌به‌پاك و خاوێنی و له‌پێش لێدانی زه‌نگ و وانه ده‌ست پێ كردندا ئاماده ببیت.

٢- سلاّوكردن له‌هاوڕێیان و مامۆستایان له‌كاتی پێگه‌یشتنیانا بلێی (السلام علیكم ورحمة الله).

٣- پاراستنی یاساو ڕه‌وشتی قوتابخانه‌و نه‌كردنی كاری نابه‌جێ و ناشیرین.

٤- هه‌موو پێداویستیه‌كانی ڕۆژ له‌كتێب و ده‌فته‌رو قه‌ڵه‌م و شتانی تریش ئاماده بكه‌و گرنگیان پێ بده، خۆت نه‌كه‌یته بار به‌سه‌ر كه‌سانی تر .

٥- له‌كاتی وانه ووتنه‌وه‌ی مامۆستادا هۆشیاربه‌و بیرو هۆشت له‌ولاو له‌م لا بهێنه‌وه، كه‌سانی ده‌وروبه‌رت بێداربكه‌وه ئه‌گه‌ر كه‌مته‌رخه‌م بوون .

٦- خۆت به‌هیچ شتێ خه‌ریك مه‌كه و قسه مه‌كه له‌كاتێكدا كه‌پێویستیت به‌گوێ گرتن هه‌یه .

٧- ئه‌رك و واجبه‌كانت جوان بنوسه‌وه‌و دیار بكه بۆئه‌وه‌ی دواتر ئه‌نجامیان بده‌یت .

٨- پشووه‌كان به‌هێمنی به‌سه‌ر به‌ره، ئاگات له‌وانه‌بێ كه‌له‌خۆت بچوكترن، له‌گه‌ڵ گه‌وره‌كانیشا ده‌سته گه‌مه‌و گاڵته‌و گه‌پ مه‌كه

٩- كاتی پشودان بقۆزه‌وه به‌وه‌ی پێویستیه‌كانی خۆتی تیادا جێ به‌جێ بكه‌یت تاكو زه‌نگی ده‌رسه‌كه‌ی تر لێ ده‌درێ زوو بچیته پۆله‌كه‌ته‌وه.

١٠- ئاگاداری ئه‌و خواردن و خواردنه‌وانه‌به كه‌ده‌یان كڕیت، له‌پێش و

پاشی خواردندا دەستت بشۆو بەپاكی بهێڵەوە ، وەخواردنێك بۆنی ناخۆشی لێ بێت خۆتی لێ دوور بگرە، باهاوەڵانت پێیەوە ئازار نەبینن، تابۆت دەكرێ رێك و پێك خاوێن بە، هەروەها گورج و گۆڵ و هۆشیارو بێداربە.

١١- ئاگاداری هەنگاو و شەقاوەكانت بە، باشتی پیرۆزو بەرێز نەكەوێتە ژێر پێتەوە، وەك پارچە نان یا دانەوێڵە یا پەڕێ وتاری پیرۆزی لێ نوسرابێ وەك ئایەت و فەرموودەكانی پێغەمبەرﷺ.

١٢-بەبێ پرس و مۆڵەت كەل و پەلی هاوڕێیەكانی پۆلەكەت یا قوتابخانەكەت بەكارمەهێنە وەئەگەر بەكارت هێنا پاش مۆڵەت لێ وەرگرتنیان ئەوا سوپاسی خاوەنەكەی بكە تابۆت دەكرێ كەل و پەلی پێویستی خۆت ئامادە بكە پێش چوونە قوتابخانەو مایەی بارگرانی نەبیت لەسەر هاوڕێكانت.

١٣-بەسووك سەیری قوتابیانی هاوەڵانت مەكە، بەڵكو رێزی هەرتاكەیان و گشتیان بگرە و قسەی نارێك و ناشیرینیان ئاراستە مەكە ناوو ناتۆرەیان بۆهەڵمەبەستەو بەغەیبەت و پاشە ملە ناویان بەخراپ نەهێنێ، چونكە ئەمانە مایەی ئازارو ئاشوب و شەڕو ئاژاوەن، هەروەها مایەی ناتەبایی و نارێكین لەگەڵ رێزو ویقاری ئیماندار ناگونجێ و لەخووڕەوشتی ئادەمیزادی چاكی پاك نییە.

١٤-هەردەم هاوڕێیەتی قوتابی زیرەك و خوڕەووشت بەرز چاك و باش بكە.

١٥-ئەرك و واجبی رۆژانەت ئەنجام بدەو پشت گوێیان نەخەی بەوەی كۆببێتەوە لەسەرت، لەسەرەنجامدا فریایان نەكەوی، بەپشت گوێ نەخستنیان ئاسودەو سەركەوت و دڵ خۆش دەبی.

١٦-لەكاتی تاقی كردنەوەكاندا ناوی خودا بهێنەو پشت بەخوا ببەستە و ئـەركی باشـت یـا هـەوڵی چـاكت بۆیـان دابـێ و چـاوت لەغـەش و قۆپیـەو سەیركردنی ئەولاو ئەم لا نەبێ .

١٧-بۆهەر كاری پێویست هۆشیاربەو خودات لـەیادبێ، داوای كۆمـەكی لێ بكە، بەلایەنی كەمەوە دوو سێ دوعا لەبەر بكەو بیانخوێنـە، وەك ئەمـە كەیەكێ لەم دوعایانە كەحەزرەتی موسی پێی لەخودا پاڕاوەتەوە، وەك خـودای گەورە دەفەرموێ : قَالَ رَبِّ ٱشْرَحْ لِي صَدْرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِيٓ أَمْرِي ﴿٢٦﴾ (طـه) لەئایەتی (٢٥-٢٦، واتە: خوایـەگیان سـینەو دڵ و دەروونم فـراوان بكـەیت و داواكاری و پێداویستیەكانم بۆ ئاسان بكەیت.

## هەروەها ئەو خالآنەی داب و نەریتن كەقوتابی پێویستە لەماڵەوە ڕەچاویان بكات ئەمانەن

١-هەر كەگەیشتیە ماڵەوە پاش سلاوكردن و نان خـواردن كاتـت بـەفیڕۆ نادەیت و ئەرك و واجبەكانت بەجێ دەگەینی، نەكەی كیتابەكانت فـرێ دەیتـە ماڵـەوە بـەبێ سـەروبەری و ئەركـەكانت پـشت گـوێ بخـەیت بلێـی دەی دەی بەیانیـەكی تـر ئـەنجامی دەدەم، بـۆ بـەیانی داهـاتووش بگـەڕێی بـەدوای كیتابەكانت و بلێی كوانێ كیتابەكانم، هەند بەبێ موبالاتی فڕێت دابن، نەزانی لەكوێت داناوە!

٢-بەخشتەو و وانەكانی ڕۆژانەتـدا بـچۆرەوە، خـۆت دڵنیـا كـە لـەوەی هیچت فەرامۆش و لەبیر نەكردووە، لەبەجێ گەیاندنی ئەرك و واجبەكانت.

٣-هەردەم لەهەوڵی ئەوەدابە خەت و نوسینەكانت خۆشترو جوانتر كەی و

كیتاب و په‌رتووكه‌كانت ڕێك و پێك بكه‌یت و به‌رگیانبكه‌یت و خاوێن ڕایان گریت و سوودیان لیَ ببینی، تاكو ته‌مه‌نیان درێژتربیَ خه‌ڵكانێكیش له‌پاش تۆ سودوو به‌هره‌یان لیَ وه‌ربگریَ و دوعای خێرت بۆبكه‌ن .

٤-هه‌وڵبده شوێنی چاك و باش و تایبه‌ت بۆ كیتاب و ده‌فته‌ره‌كانت له‌ماڵه‌وه ڕێك بخه‌یت، هه‌روه‌ها پارێزگاریان بكه‌یت له‌جاگانه‌و یا ناو جانتاو یا به‌هه‌رشێوه‌یه‌كی تربیَ واته نه‌كه‌ی كیتاب و ده‌فته‌ره‌كانت فڕیَ بده‌یته ئه‌م گۆڕو ئه‌وگۆڕ، ئه‌وسا منداڵی ماڵه‌وه‌تان یا هی میوانان ده‌ستی بكه‌نیَ و په‌ڕپوتی بكه‌ن.

٥-له‌هه‌وڵی ئه‌وه‌دابه كه‌له‌گشت ده‌رسه‌كانتدا پله‌یه‌كی باش به‌ده‌ست بهێنی به‌پله‌و ده‌ره‌جه‌ی كه‌م قه‌ناعه‌ت نه‌كه‌ی، بۆئه‌مه‌ش ڕۆژانه وانه‌كانت بخوێنه‌و ئاماده‌یان بكه، وه‌ئه‌گه‌ر له‌وانه‌یێ لێی حاڵی نه‌ده‌بووی یا سه‌رت لێی ده‌رنه‌ده‌چوو بڕۆ لای براده‌رانی له‌خۆت زیره‌كتر شه‌رمت پیَ نه‌بیَ، لێیانه‌وه فێری ده‌رسه‌كه‌ت ببه، چونكه خودای بالاَده‌ست حه‌زده‌كات هه‌ركه‌سێكتان كارێكی كرد به‌جوانی و ڕێكی و پێكی به‌جێی بگه‌یه‌نیَ ، وه‌له‌مانای ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌دا هاتووه‌و ڕوون و ئاشكرایه كه‌ئیمامی به‌یهه‌قی ڕیوایه‌تی كردووه كه‌پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رموویه‌تی (ان الله تعالی یحب اذا عملا احدكم عملا ان یتقنه).

## پێویستە قوتابی ڕەچاوی ئەم خاڵانە بكات لەكاتی تاقی كردنەوە

١- پاش خۆ ئامادە كردنێكی تەواو پشت بە خوا ببەستێ و زیكرو ویردی بەیانیان و ئێواران فەرامۆش نەكات.

٢- دەست نوێژ بشۆرێ و بەهیچ شێوەیێ تەنگەتاو نەبێ بۆ سەر دەستاو، خۆی سوك و ئاسوودە بكات.

٣- گێرو گرفتەكانی ژیانی، وەلآنێ و خۆی و مێشكی بەتەنها بێلێتەوە بۆ تاقی كردنەوەكانی.

٤- پۆشاكی تەسك و تریسك یاشڕو شەپڕپۆ نەبی كە كاری گەری بكات لەسەر جستەی یادەروونی.

٥- دڵ و دەروونی ئارام بكات و خۆی دوربگرێ لەشێوان و ترسان و بێ سیقەیی و متمانەیی، ورەو عەزم و جەزمی خۆی بەرزبكاتەوە.

٦- داوای یارمەتی و كۆمەكی لەخودای گەورەبكات، بەلایەنی كەم ئەم دوعایە بخوێنێ (اللهم لا سهل الا ما جعلته سهلاً وأنت تجعل الحزن ان شئت سهلاً) هەروەها داوا لەدۆست و ئازیزانی بكات كە دوعای خێری بۆ بكەن.

٧- هەول بدات لەكاتی تاقی كردنەوە خەوی نەیی یا برسی نەبێ یازۆری نەخواردبێ كە پێیانەوە نارحەت ببێ.

٨- ووریای كاتی تاقی كردنەوە بێ زووتر خۆی بۆ ئامادە كردبێ .

٩- پێداویستی تاقی كردنەوە فەرامۆش نەكرێ، بەچاكی و باشی ئامادە بكرێ، وەك پێنوس و قەڵەم تراش و ڕەشكەرەوە و ڕاستەو.. هتد.

١٠- حیسابێكی تەندروستی بكرێت، بۆ نموونە گەر سەری بێشێ حەبی

پاراستۆلی پێ بێ، ئەگەر ئەعصابی ماندی بوو هێور کەرەوەی پێ بێ، ئەگەر فشاری خوێنی (چغگ) هەبێ حەبی دابەزێنەری خوێنی هەبێ،...هتد.

١١- هەندێ نوقل و چکولات لەگیرفانی بێ، لەکاتی کەمی بێ هێزی بەرووخسەتی مامۆستاوە یەك دوو دانەی لێ بخوا.

١٢- لەسەرە تاوە سەلاو لەمامۆستایان و هاوەڵانی بکەو ڕوو خۆش و گەش بێ بێ و گوێڕایەلی تێبینی و ئامۆژگاریەکانی بەڕێوەبەری هۆلی تاقی کردنەوە بێ و سوودیان لێ وەرگرێ.

١٣- لەسەرەتاوە وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە کەلای ئاسانەو دەیان زانی و لێیان بێ گومانە، بەهیچ شێوەیێ چاوی لەغەش و قۆپیە و غەیری خۆی نەبێ، گەر وەڵامەکانی بۆ نەهات باهەندێ قورئان بخوێنێ بەنیەتی وەبیرهاتنەوەی، وەك سورەتی (الضحى).

١٤- کە کۆتایی بەوەڵامەکانی هێنا خێرا نێتە دەرەوە، بەڵك و چەند جارێ پێدا بچێتەوە، ئاخۆ چی لەبیر نەچووە، یا ئاخۆ وەڵامەکانی ڕاستە یا تا تەواو دڵنیا نەبێ دەرنەچێ، یابا ئادواکات بێنێتەوە.

١٥- لەپاش دەرچوون لەهۆڵی تاقی کردنەوە شوکرانەی خوای گەورەبکات، ڕازی بێ لەقولایی دڵەوە بەتەقدیراتی ئاکی پاکی میهرەبان، خۆ نازانێ لەچارەنووس خێرو سوود لەچی دایە..

# هەندێ لەداب و نەریتی کەسایەتی(الشخصیه)

ئادەمیزادی ئیماندار دەبێ لەگەڵ خەڵكیدا لەژیان و ژینگەدا کەسایەتی خۆی دەربخاو بەکردارو بەگوفتار ڕوونی بکاتەوە، کەدوا کەوتەی پێغەمبەری خۆشەویستە ﷺ کەدواکەوتەی (رحمة للعالمین)ە، بۆیە خۆشی ڕەحمەتە لە هەرشوێنێ بێ و بۆهەرشوێنێ بچێ جێگەی ئەمینی و دڵشادی خەڵك و مەردوومە، هەردەم شیرین ڕەفتارو کردار جوان و خوردەوشت بەرزو نەرم و نیان و بەزەییە لەئاست هەژارو داماوانا، چونکە دەزانێ پاکی و پیرۆزی و سەرکەوتن لەڕووکردنە خودایەو لەدەروون ساغی و پاکیدایە، هەرپاکیتی دەروونە ڕەنگ دەداتەوە لەکارو کردەوەی شیرین و جوانا، هەروەها دەردو بەلاو فیتنەو ژێرکەوتن لەئەنجامی دەروون پیسی و نەخۆشیە، وەك خوای گەورە ئەو ڕاستیەمان بۆ ڕۆن دەکاتەوەو دەفەرمووێ ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ۝١٠﴾ (الشمس ٩-١٠)دەروون نەخۆشەکان و پیسەکان لەکارو کردەوەی خراپ و بەدا ڕەنگ دەداتەوە کارو کردەوەی ناشیرین و خراپیان ڕەنگ دانەوەی دەروونی پیس و نەخۆشیانە.

هەروەها ئادەمیزادی خاوەن باوەڕ دەزانێ بەدواکەوتنی هەواو ئارەزوو و شەهەوات، مایەی دەروون پیس بوون و نەخۆش بوونە، مایەی ئەزیەت و ئازاری دەروون و گیانە، هەروەها مایەی تێك چوونی باری کۆمەلایەتی و ئابووری و سیاسیە و دژایەتی لەگەڵ نیزامی کەون و بوورنەوەرو فیترەو حەقە، وەپێچەوانەش واتە بەدواکەوتنی وەحی و بەرنامەی خوداو ژێر پێ خستنی خواستە ناهەموارەکانی نەفس و شەیتان، ڕزگار بوونە لەنەخۆشی و پیسی و

ئەزیەت و ئازاری دەروونی و مایەی کارچاکیە لەهەموو بوارەکاندا، سەرەنجامیش بەهەشت پێشوازی لێ دەکات، وەك ئەم مانایە لەم فەرمودەدا ڕەنگ دەداتەوە کەپێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ (حفت النار بالشهوات وحفت الجنة بالمكاره)رواه الترمذي.

بەبەدواکەوتنی هەواو ئارەزوو شەهوات جەهەنندەم دێتە ئاراوە، هەروەها بەژێر خستنی داواکاری ناهەموار، ئادەمیزاد شایستەی ساغی و خۆشی و بەهەشت دەبێ.

## جا پێویستە هەرئادەمیزادێکی ئیماندار ڕەچاوی ئەم خالآنە بکات لەداب و نەریتا

١- گرنگی دان بەپاك و خاوێنی لەش و دەروون هەموو هەفتە جارێ خۆی بەجوانی بشۆریت، ئەگەر ڕۆژی جومعە بێ باشترە لەڕۆژەکانی تری هەفتە، حەزرەتی عائیشە ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە، کەفەرموویەتی خۆتان پاکو خاوێن ڕاگرن پیس و پۆخڵی لەخۆتان دوورخەنەوە، چونکە ئیسلام پاك و خاوێنە، صیغەکەی بەعەرەبی ئەوەیە (تنظفوا فان الاسلام نظيف)رواه ابن حبان.

٢- هەرکاتێ دیتت نینۆکەکانت هاتووە بیانکە، بانەبنە جێگەی قرێژو پیسایی و مایەی نەخۆشیان، ئەگەر دانی ئێوارانی پێنج شەمە یابەیانیانی جومعان بێ باشترە.

٣- مۆڵەت مەدە خۆت کەقژی سەرت زۆر درێژ بێت هەمیشە بەخاوێنی

ڕابگره‌و جوان و ڕێك و پێكی دابهێنه.

٤- خۆت ڕابێنه له‌كاره‌كانا له‌ڕاسته‌دا جیێ به‌جێ بكه‌ی، به‌تایبه‌تی له‌ده‌ست نوێژو غوسل و سلاوكردن و دۆقه‌كردن و جل له‌به‌ر كردن و پێلاو له‌پێ كردن و شت وه‌رگرتن و خواردن و خواردنه‌وه‌، لای چه‌پیش بۆخۆپاكردنه‌وه‌ی سه‌ر ئاوده‌ست و جل داكه‌ناندن و پێلاوداكه‌ندن.

حه‌زره‌تی عائیشه (ڕه‌زای خوای لێبێت)ده‌گێڕێته‌وه پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌ستی ڕاستی بۆ ده‌ست نوێژو خواردن و خواردنه‌وه به‌كارده‌هێنا ده‌ستی چه‌پیشی بۆسه‌ر ئاوده‌ست و شتی له‌وبابه‌تانه به‌كار ده‌هێنا ،ئیمامی داود گێڕاویه‌تیه‌وه.

٥- به‌ڵغه‌م و چڵم ڕووه‌و قیبله ڕوومه‌كه‌، وه‌ك له‌ئاوده‌ستیشا پێش و پاش ڕووه‌و قیبله هه‌ڵمێخه‌، هه‌روه‌ها ده‌سته سڕی تایبه‌تی یا

كلینكس به‌كار بهێنه بۆ چرم و به‌ڵغه‌م سڕین، ئه‌ویش به‌شێوه‌یه‌كی وا مایه‌ی بێ زاری و ئازاری كه‌سی تیا نه‌بێ به‌وه‌ی له‌ڕوویانا ئه‌نجام بده‌یت و، به‌ڵكو له‌و كاتانه‌دا پشتیان تێ بكه‌یت وه‌له‌شوێنی شیاوی خۆیا فڕێی بده‌یت.

٦- له‌كاتی پژمیندا ڕووت له‌خه‌ڵك و مه‌ردووم و خواردن و خواردنه‌وه وه‌ربگێڕه‌، تاكو پرپشكی پشمینه‌كه ئازاری ده‌روونی كه‌س نه‌دات یا خواردن و خواردنه‌وه بێزه‌وه‌ر نه‌كات كه‌ئیشتهای تیا نامێنێ.

٧- پاش پژمین بڵێیت(الحمدالله) موسڵمانانی كه‌له‌گه‌ڵیان، پێی بڵێن (یرحمك الله)ئه‌ویش له‌وه‌لامیاندا بڵێت (یهدیكم الله ویصلح بالكم) واته‌: خودا هیدایه‌تتان بدات و حاڵت چاك بكات.

٨- له‌كاتی باوه‌ش هاتندا به‌پشتی ده‌ست ده‌مت بگره‌، یاپشتی ده‌ستت

بخەرە سەردەم، چونكە دیمەنێكی ناشیرینت بۆ دروست دەكات یا مەترسی شتێكیش دەكرێ بچێتە ناو دەمەوە.

٩- خۆت لەوخواردنانە بپارێزە كەدەبێتە مایەی ئەوەی ئادەمیزاد سكی پیێ دەوا دەكات و نارەحەتی دەكات یا كەمی لێ بخۆ.

١٠- كەسەیری‌ناوێنە یا ئەینۆك دەكەیت یادی خودای شكۆمەند بكە و شوكرانەی بكە وەك بڵێی (اللهم احسنت خلقی فاحسن خلقی) خوایەگیان جوانت خەلق كردووم خورەوشتیشم جوان بكە.

١١-بەتەلەفۆن خەڵك هەراسان مەكەو گاڵتەو قسەی زیادی پیێ مەكە، بەڵكو تەنها بۆكاری پێویست بەكاری بهێنە.

١٢- لەسەر بەندایەتی و عیبادەتی خودای گەورە خۆت ڕابێنە بەواجب و سوننەتەكانەوە، هەروەها لەسەر كردەوەی باش، خۆت دووربگرە لەكارو كرداری بێ سودو بێ‌ئیستفادە وەلەبیری ئەوەدا بە كات بەفیڕۆ نەدەیت و هەردەم زمانت تەڕو پاراو بێ بەزیكرو یادی خوا.

لەحەزرەتی عائیشە(خوا لیێ ڕازیبێت) دەگێڕێتەوە باشترین كردەوەی باش و چاك لەدین و ئاییندا لەلای پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ئەو كردەوەبوو كەخاوەنەكەی لەسەری بەردەوام بێت ئەگەر كەمیش بێ (خیر الاعمال ادومة وان قل).

١٣- لەو كارو كردەوەو گوفتارانەی كەپەیوەندیان بەتۆوە نیە خۆت لێیان دوور بخەرەوە، عن ابی هریرە قال رسول الله ﷺ (من حسن الاسلام المرء تركە مالا یعنیە)رواه الترمذی و ابوداود واتە: لەخورەوشتی جوانی ئادەمیزادی موسڵمان ئەوەیە كەواز بینێ لەشتانێ كەپەیوەندی بەوەوە نیە.

١٤- لەئامۆژگاری کردنــی خــەڵکان کەمتەرخــەمی مەکــەو لەبیــستنی ئامۆژگاریان گورج و گۆڵ بە، سوود وەربگرەو سوود ببەخشە.

١٥- نەکەیت تورەبی بەهیچ شێوەیێ لەهیچ ڕوویێکەوە ئەگەر لەسەر هەڵە بوویت دان بەهەڵەکەی خۆت دابنێ و پێشوازی لەڕاستیەکەی بکە، هەمیشە خەریکی پاك کردنەوەی دەروون و بەدەنت بە بەئیستغفارو تەوبەو پەشیمانی، فەرامۆش مەکە خۆت لەگەڵ ئەم کۆمەڵی بدە کەخودای گەورە لەئاستیانا دەفەرمووێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾﴾ البقرە (٢٢٢) واتە: بەڕاستی خودای گەورە تەوبەکارانی خۆش دەوێ لەگەڵ خۆپاککەرەوان.

١٦- هەردەم لەکاروبەرەکانتاو لەبەندایەتی و عیبادەتا ئیخلاصت ببــێ، بەئاواتی خوا لەخۆ ڕازی کردن ڕۆژانەی ژیان پێ بەســەر بــەرەو لــەپێش چــاوی بگرە لەهەموو کاتێ.

١٧- بەجێ گەیاندنی هەموو ئادابەکانی ئیسلام لەهەموو ڕوو لایەنێکی ژیانەوە لەقەدەر توانا.

# داب و نه‌ریتی نوستن و خه‌و

جێگه‌و باڵه‌خانه‌ی نوستن دوا شوێنێکه ئاده‌میزاد بۆی ده‌گه‌ڕێته‌وه پاش ڕه‌نج و ماندووبوونی ڕۆژگاری درێژ، نووستن ڕه‌حمه‌ت و به‌زه‌یی خودایه تاكو ئاده‌میزاد سه‌رله‌نوێ ووزه‌و تاقه‌تی خۆی بێنێته‌وه بۆرۆژێکی نوێ و تازه، وه‌ك زاتی شكۆمه‌ندو ئازیز ده‌فه‌رمووێ ﴿وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾﴾ (القصص ٧٣) واته : له‌به‌زه‌یی و نیعمه‌ت و به‌هره‌ی خودای گه‌وره ئه‌وه‌یه كه‌خوای گه‌وره شه‌وو ڕۆژی گێڕاوه بۆتان تاكو له‌شه‌وا پشوو بده‌ن و ئۆقره بگرن و هێزو تواناتان بێته‌وه به‌ر ، وه‌ڕۆژیشی گێڕاوه به‌مایه‌ی ژیوارو كارو كاسبی و هه‌وڵدان بۆ فه‌زل و كه‌ره‌می خودا، به‌ئومێدی ئه‌وه‌ی ڕه‌جاو تكاتان بێ خودای خۆتا بناسن و شوكرانه‌و سوپاسی بكه‌ن و ڕێگه‌و ڕێبازی ئه‌و بگرنه به‌رو یادی بكه‌ن

نوستن ئایات و نیشانانی خودایه له‌سه‌ر ده‌سه‌ڵاتی بێ پایانی گه‌وره‌ی ئه‌و تاك و پاك و مه‌زنه، هه‌روه‌ها نیشانه‌و به‌ڵگه‌شه له‌سه‌ر بێهێزی ئاده‌میزاد و تیابوونی كه‌م و كوڕی، بێ گومان له‌نوستنیشدا چه‌ند داب و نه‌ریتێكمان هه‌یه به‌پێی ئادابی ئیسلامێتی و سوننه‌ته‌كانی پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویست ﷺ ئه‌مه‌ش چه‌ند خاڵێكه له‌و داب و نه‌ریته:

١-ده‌ست نوێژ شۆرین له‌پێش نوستندا هه‌روه‌ها كردنی چه‌ند ره‌كه‌عات نوێژی دوو دووانه كه‌پێی ده‌وترێ (قیام اللیل) واته: شه‌و تیا وه‌ستان یا شه‌ونوێژی پێش نوستن وه‌له‌پاش نووستنیش هه‌ستانه‌وه هه‌یه بۆ شه‌ونوێژ كه‌پێی ده‌وترێ (تهجد)حه‌وت ڕه‌كه‌عاته تاكو یانزه.

عن ابی امامة قال سمعت رسول الله (صلی الله علیه وسلم)یقول (من اوی الی فراشه طاهرا وذکرالله عزوجل حتی یدرکه النعاس، لم یتقلب ساعة من اللیل یسأل الله عزوجل خیرا من خیر الدنیا ولآخرة الا اعطاه الله)رواه ابن السنی واتە: ئەوەی بچێتە سەرجێگاو ڕایەخی نوستنی بەدەست نوێژەوە وەزیكرو یادی خودای گەورە بكات تائەو كاتەی دەكەوێتە خەوا وەتێیدا لەخوای گەورە بپاڕێتەوە بۆخێری دونیاو قیامەت ئیللا خودای گەورە دوعاكانی قبول دەكاو پێی دەبەخشێ.

٢-لەپێش نووستندا بیر لەكردەوەی ئەو ڕۆژەی بكاتەوە ئەگەر هەڵەو گوناه و تاوانی ئەنجام دابوو ئەوە تەوبەبكاو پەشیمان بێتەوە هەولبدات جارێكی تر نەگەڕێتەوە سەریان ، لەئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێت) پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی هەركەسێ لە موسڵمانان كەپاڵ دەداتەوە لەسەر جێگاو ڕایەخی نوستنی ئەوكاتە بڵێ (استغفرالله الذی لا الە الا هو الحي القیوم واتوب الیه) واتە: داوای لێبوردن لەوخودایە دەكەم، كەخۆی تاكە پەرستراوەو هیچ پەرستراوێكی تر نیە و هەمیشە زیندوو ڕاگری كەون و كائینات و مەخلوقانە، وەدەگەڕێمەوە بۆلای ئەگەر هەندێ كەفی دەریاش بێ (واتە ئەگەر هەرچەندە زۆریش بێت ) ئەوە خودای گەورە لەگوناه و تاوانەكانی خۆش دەبێ.

٣-لەپێش نوستندا ئایەت كورسی كەئایەتی (٢٥٥)ی سورەتی ( البقرە)یە ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ

ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا ۚ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ سورەتی (الاخلاص) واته (قل هوالله احد) هەروەها (معوذتين) واته (قل اعوذ برب الفلق) و (قل اعوذ برب الناس) سێ جار سێ جار بیان خوێنێ پاشان فوو لەدەستی بکات و بەدەم و چاویا پاشان بەبەدەنیا دایبهێنێ ، لەعائیشەوە(ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ لەهەرشەوێکا کەدەچووە سەر جێگەو ڕایەخی نووستن دەستی دەکرد بەدوعا کردن و دەستەکانی تیا بەرز دەکردەوەو (قل هو الله احد( و (قل اعوذ برب الفلق) و (قل اعوذ برب الناس)ی دەخوێند پاشان فووی لەدەستەکانی دەکردوو بەدەم و چاوو سەرو لەش و بەدەنی دای دەهێناو ئەمەی سێ بارە دەکردەوە .....موسلم و بوخاری ڕیوایەتیان کردووە.

عن عائيشه(رضي الله عنها) ان النبى ﷺ كان اذا اوى الى فراشة كل ليلة جمع كفيه ثم نفث فيهما قرأ (قل هوالله احد) و (قل اعوذ برب الفلق) و (قل اعوذ برب الناس)ثم مسح بهما ما استطاع من جسده يبدأ بها على رأسه ووجهه وما اقبل من جسده يفعل ذلك ثلاث مرات متفق عليه.

٤-لەپێش پاڵکەوتن لەسەر جێگەو ڕایەخی خەو جێگەکە داوەشێنە، تاکو دڵنیا بیت هیچ زیندەوەرێکی زیان بەخش تیای نەچووە، پاشان لەسەر کەلەکەی ڕاستە لێی پاڵ کەوە خۆت لادە لەوەی پێ و قاچەکانت ڕووەو قیبلە هەڵ بکەون ، عن ابی هريرة (رضى الله عنه) قال قال الرسول (صلى الله عليه وسلم) اذا اوى احدكم الى فراشه فلينفض فراشه بداخله ازاره فأنه لايدري ماخلفه عليه، ثم يقول بسمك ربى وضعت جنبى وبك ارفعه ان امسكت نفسي فارحمها وان ارسلتها فا حفظها بما تحفظ به عبادك الصالحين) متفق عليه ئەبو

هوره‌یره (خوا لێی ڕازیبێت) ده‌گێڕێته‌وه كه پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویست ﷺ فه‌رموویه‌تی: ئه‌گه‌ر یه‌كێ له‌ئێوه چووه سه‌رجێڤای نووستن با ڕایه‌خه‌كانی داوه‌شێنێ، چونكه ئه‌و نازانێ له‌پاش ئه‌وا چی تیا چووه یا چی تیایه، پاشان بڵێ به‌ناوی تۆوه خوایه گیان كه‌له‌كه‌م له‌سه‌ر جێی نوستن ڕاكێشاوه به‌یارمه‌تی و كۆمه‌كی تۆوه به‌رزی ده‌كه‌مه‌وه، ئه‌گه‌ر گیانم ناده‌یته‌وه بۆلای خۆت گلی ده‌ده‌یته‌وه ڕه‌حمی پێ بكه، ئه‌گه‌ر ڕوح و گیانم پاش نوستن پێ ده‌به‌خشیه‌وه‌و ده‌ینێریه‌وه بیپارێزه وه‌ك چۆن پیاو چاك و به‌نده صالیحه‌كانت ده‌پارێزی .

٥-تاكو خه‌وت نه‌یێ نه‌چیته سه‌ر جێگه‌ی نوستن چونكه نوستن زیاد له‌پێویست بێ كات به‌فیڕۆ دانه‌و، كاتیش لای ئاده‌میزادی موسڵمان كێڵگه یا مه‌زره‌عه‌ی ژیانه بۆ دوارۆژێكی به‌خته‌وه‌ر، له‌فه‌رمووده‌یێ هاتووه پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویست ﷺ ده‌فه‌رمووێ: ئه‌ی فلان زۆر مه‌خه‌وه، چونكه زۆر خه‌وتن هه‌ژارییه له‌ڕۆژی قیامه‌تدا، جا پێویسته به‌پێی پێویست بخه‌وین و زیاده ڕه‌وی نه‌كه‌ین كه‌نزیكه‌ی ده‌وروبه‌ری حه‌وت هه‌شت سه‌عاتێ ده‌كات، به‌پێی ته‌مه‌ن و شوێن و جۆرێتی كار.

٦-هه‌وڵبده‌ین خۆمان واڕابێنین كه‌زوو بخه‌وین و زوو هه‌ستین، تاكو نوێژی به‌یانی به‌هۆش و گۆشه‌وه ئه‌نجام بده‌ین و خۆمان باشتر ئاماده‌كه‌ین بۆ ده‌رچوون بۆ كارو فه‌رمان .

عن عائشة(رضی الله عنها)قالت كان رسول الله (صلی الله علیه وسلم)ینام في اول اللیل و یقوم اخره فیصلی)رواه ابن ماجه. واته: عائیشه(ڕه‌زای خوای لێ بێ ) فه‌رمووی پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌سه‌ره‌تای شه‌و ده‌خه‌وت و له‌كۆتایی شه‌ودا هه‌ڵده‌ستاو شه‌و نوێژی ده‌كرد.

٧-پێویسته جلی خەوی تایبەتیمان بێت، پۆشاکی نەرم و فراوان و بەرین، خۆ بپارێزین لەوەی کەلەکاتی خەوا ڕووت بینەوە یا عەورەتمان دەرکەوێ.

٨-جێگاو ڕێگای نوستنی کچان لەگەڵ کوڕان لێك جیا بکەینەوە لەماڵەوە، هەوڵدەین ژووری برایان لەگەڵ خوشکان لێك جیابن بەتایبەتی پاش تەمەنی (١٠)ساڵی.

٩-خۆلادەین لەوەی لەسەر زگ بنوین یان پاڵ دەینەوە .

عن يعش بن طحفه قال : قال ابى بينما انا مضطجع في المسجد على بطني اذا رجل يحركني برجله فقال (ان هذه ضجعة يبغضها الله قال فنظرت فاذا هو رسول الله(صلى الله عليه وسلم) )رواه ابوداود.

یەحیشی کوڕی تەحفه دەڵێت، باوکم ووتی من لەمزگەوتا لەسەر زگ لێی ڕاکێشابووم، کابرایەك بەقاچی جولاندمی ووتی (ئەم پاڵ دانەوەیە خوا ڕقی لێیەتی، ووتی کەسەیرم کرد ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو .

١٠-زیکرو یادی خواکردن لەوکاتانەی کەلەناو خەوای و بەئاگادێیت یا لەدوای خەوا عن عائشه(رضي الله عنها) قالت كان رسول الله (صلى الله عليه وسلم)اذا تعار من الليل قال لا اله الا الله الواحد القهار، رب السموات والارض وما بينهما العزيز الغفار) رواه النسائي واته:لەعائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێ )دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کەلەخەو هەڵدەستا بەشەو دەی فەرموو( لا اله الا الله الواحد القهاررب السموات والارض وما بينهما العزيز الغفار) واتە: هیچ پەرستراوێ نیە بەغەیری (الله)نەبێ خۆی تاکی پاکی زاڵەو پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و نێوانیانە، شکۆمەندی و لێبووردەی

غەففارە.

١١-لەپێش نووستندا دەرگاو پەنجەرە داخەین و ئاگری سۆبەو تەباخ یا هەرشتێکی تربێ بکوژێنینەوە و قاپ و مەنجەڵ و هاو وێنەیان داپۆشین.

جابر خوالێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرﷺ کەفەرموویەتی (اطفئوا المصابيح بالليل اذا رقدتم و اغلقوا الابواب اوكئوا الاسقية وخمروا الطعام و الشراب)متفق عليه) واتە: کاتێ کەدەخەون چرایەکان بکوژێننەوەو دەرگاکان داخەن و مەنجەڵ و قاپەکانی بپارێزن و سەریان داپۆشن .

١٢-ئەگەر خەوێکی باشمان دیت، شوکرانەی خوای لەسەر بکەین لای خۆشەویستانی دەروون پاك بیگێڕینەوە، ئەگەر خەوێکی ناخۆشمان دیت هەڵسین نوێژ بکەین و دوعای خێر بکەین و لای هیچ کەسێ نەیگێڕینەوە ، عن ابی هريرة مرفوعا( اذا رأى احدكم رؤيا يكرهما فلا يحديث بها احدا وليقم فليصلي)رواه الترمذي.

یەکێ لەدوعایەکانی خەونی ناخۆش ئەوەیە بڵێی (اللهم اجعله خيرا لنا وشرا لاعدائنا) .

١٣-کاتێ لەخەو هەڵدەستی ئەم زیکرە بخوێنە (الحمدالله الذی احیانی بعدما أماتنی والیه النشور) واتە: حەمدو ستایش بۆ ئەو زاتەی کەزیندووی کردمەوە پاش ئەوەی مراندبوومی وەبۆلای ئەو دەگەڕێینەوە زیندوو دەکرێینەوە.

تەواو الحمدلله ١٩٩٥/١٢/٢٥

الحمدالله الذی هدانا لهذا وماكنا لنهتدي لو لا ان هدانا الله

وصلى الله تعالى على نبي الامی وعلى اله وصحبه وسلم

# ئادابی بەكار هێنانی مۆبایل

گومان لەوە دانیە لەوڕۆژەی كە خودای گەورە ئەم ئاسمانانەو زەویەی بەدیهێناوە لەگەڵ بەدیهێنراوەكانی تر، هەر گشتیانی ڕام و موسەخەر كردووە بۆ ئادەمیزادەكان، وەك خۆی دەفەرموێ ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾﴾ الجاثیة/١٣. (الجاپیە/١٣) .

بەڵام ئادەمیزاد توانیویەتی بەقەد تواناو زانین و بیری خۆیەك لەوڕۆژو زەمان و شوێنی خۆی لێی بەهرەمەندبێ، تا بڕەوی دابێ بەزانست و زانیاری و كۆششی كردبێ بۆ پشكنین و دەرخستنی نهێنیەكانی ئەم كەون و بوونەوەرە، ئەوە زیاتر مانای ڕام و موسەخخەر بوونی ئەم بوونەوەرەی بۆ دەركەوتووە و پێی وە زیاتر بەهرەمەند بووە.

دیارە سوننەتی خوای گەورەش پێشكەوتن و دەرخستنی هەندی لەنیعمەتەكانی بەستۆتەوە، بەهەول تەقەلای ئادەمیزادەكانەوە، كەوەك شاراوە لەم بونەوەرەدا دایناوە، دەیكاتە بەهرەو دیاری ئەوكەسانەی كە كۆششی بۆ دەكەن و هەنگاو لەپێناویا داوێن.

دیارە ژیرو بیرو زانستی ئادەمیزاد لەڕوانگەی پشكنین و دەرخستنی نهێنیەكانی ئەم كەون و بوونەوەرە، ڕۆژ لەدوای رۆژ لەگەشە كردن دایە، بەجۆرێكی وا ئەگەر وەك و گریمان بەنموونە بهێنینەوە، ئادە میزادێكی سەد ساڵ پێش ئێستا زیندوو بكەیتەوە، ئەم هەموو پێش كەوتنە پیشەسازی و

ئەلكترۆنیە ببینێ، ئەو هەموو جۆری فرۆكە و ئۆتۆمبیل و تەلەفزیۆن و كۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت و مۆبایل ..هتد ببینێ ئەو هەموو ئاوەدانی و بیناسازی و كارگەو شەریكاتانە ببینێ، یەكسەر تووشی سەرسورمانی و حەیرانی دەبێ ناتوانێ، بیان خوێنێتەوەو مێشكی هەلی ناگرێ و قەبوولی ناكات، ئا بەم شێوەیەش بیر لە سەد سالّی داهاتوو بكەوە.. باشە ئەدی ئەگەر یەكێ هەزار سالّ پێش ئێستا مردووبێ ئەوسا زیندوو ببێتەوە، دەبێ هەلوێستی چی بێ لە دیتنی ئەو هەموو شتە دزۆراوانەی ئەم كەون و بوونەوەرەكە مایەی پێش كەوتن و خۆشیانی ژیان و جوانی ژینگەن.. دیارە سوێند دەخوا كە ئەو دونیایەی ئەوی تیا بووە غەیری ئەم دونیاییە، دیارە هەرگیز بیرو مێشك و ژیری ئەوە قەبوول ناكات، لەوانەیە لەدیتنی سەیارە یا فرۆكە تووشی نەخۆشی ببێ و بترسێ بەتایبەتی ئەگەر بەتەنیا بێ و كەسی لەدیار نەبێ..

خوای گەورە ئاماژە بەو پێش كەوتنانە دەكات لە كیتابە پیرۆزەكەی وەك لەسورەتی (النحل) لەبارەی نیعمەتەكانی خۆی باسی دەكا، كە بۆ ئێمەی خەلق كردووەو بەدیهێناوە، لەئە سپ و بارگین و هێسترو كەرو گوێ درێژ، كەمایەی جوانی و سوار بوون و گواستنەوەی كەل و پەلمانن، هەروەها لەگەلیا دەفەرموێ شتی واشتان بۆ خەلق دەكاو بەدیدەهێنی بەبەردەوامی كە ئێوە نایزانن و ئێستا زانیاریتان پێوە نییە، وەك دەفەرموێ ﴿وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨﴾﴾ (النحل/٨)، هەروەها لەفەرموودەی قودسیدا هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ، كە خودای گەورە فەرموویەتی : وعن ابن هريرة رضي الله عنه قال، قال رسول الله ﷺ قال الله تعالى (اعددت لعبادي الصالحين في الجنة ما لاعين

رأت ولا أُذن سمعت ولا خضر على قلب بَشَر إقْرَؤا إن شئتم فلا تعلم نفس ما أخفي لهم من قرة أعين) متفق عليه.

واته : خوای گه‌وره ده‌فه‌رمویّ ئاماده‌م كردووه له‌به‌هه‌شتدا بۆ به‌نده چاك و خواپه‌رسته‌كان، نیعمه‌تانیّكی وا نه‌چاو دیویه‌تی نه‌هیچ گویّچكه‌یێ بیستوویه‌تی نه‌به‌خه‌یاڵ و دڵی هچ كه‌سیّكیش داهاتووه، به‌ڵێ ئه‌مه‌ش مانای له‌نه‌وپه‌ڕی پیّش كه‌وتن ده‌دا له‌به‌هه‌شتدا، به‌ڵێ ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌هه‌زار ساڵ، پیّش ئیّستا مردووه گریمان گه‌ر زیندوو ببیّته‌وه، ئه‌وه‌ی له‌م ڕۆژگاره‌و واقیعه ده‌بینیّ هه‌ر ئه‌و شتانه‌ن كه‌نه‌به‌چاو بینیوه‌یه‌تی نه‌به‌گویّ بیستوویه‌تی نه‌به‌خه‌یاڵ و دڵیشی داهاتووه.

سه‌یركه‌ن له‌م ئایات و فه‌رموودانه‌ی پیّغه‌مبه‌ر ﷺ كه‌چه‌ندان ڕاست و له‌جیّن كه‌چۆن موعجیزاتیّكی بۆ هه‌موو كات و زه‌مان و شویّن ده‌شیّن، هه‌رگیز به‌رگی كۆن له‌به‌ر ناكه‌ن.

ئه‌گه‌ر زاده‌و بیری ئاده‌میزاد بایه هه‌ر به‌ڕۆیشتنی چه‌ند ده‌سالیّك به‌رگی كۆنیان له‌به‌ر ده‌كرد، به‌كه‌ڵكی زه‌مانی نویّ نه‌ده‌هاتن، له‌ئاسۆی ئان و زه‌مان و مه‌كان و فه‌رهه‌نگ و كه‌لتووری چه‌رخی خۆی به‌ده‌ر نیه.. جا ئاگات له‌خۆی بیّ له‌گۆمی نه‌فامی و كۆ له‌واری وبیّ باوه‌ڕی نه‌چه‌قین، فریای خۆت بكه‌وه له‌گه‌ڵ خوای خۆت باشترو چاكتر ئاشت به‌وه‌و باوه‌ش بكه به ئایین و به‌رنامه‌كه‌ی خۆتی پیّ ئازیزو پیرۆزو به‌رزبكه، خۆتی پیّ كامه‌ران و شادومان و به‌خته‌وه‌ر بكه، خۆتی پیّ جوان و خاویّن و قه‌شه‌نگ بكه، پیّش ئه‌وه‌ی كار له‌كار بیّزاری پیّش ئه‌وه‌ی ئه‌جه‌ل داوات بكاو بتخوازیّ، ئه‌و كاته ڕاستیه‌كان په‌رده‌یان له‌سه‌ر لا ئه‌كه‌ویّ و په‌شیمانی یانه‌مزانی هیچی به‌رناكه‌ویّ، خۆ

دۆڕاندن و حەق لەدەسەت چوون ڕیسوا بوونی هەتا هەتایی، عەزاب و ئەشکەنجەی هەتا هەتایی، هیچ پشتیوان و دۆست و خۆشەویستانێکت بۆ نایێلێ!!

بەڵێ ئامێری مۆبایل لەو نیعمەتانەی خوای گەورەیە کە بەخشیویەتی بەئادەمیزادانی ئەمڕۆی ڕۆژگار بەکۆشش و تەقەلای یەکێ لەبەندەکانی، کەخۆی لەخۆیدا دەرخستنی ئایاتی خوای گەورەیە، ڕوون کردنەوەو پشکنینی حەقە، دیار دەی گەورەیی خوایە لەم ژیان و ژینگەیەدا کەچۆن نیعمەتانی بێ ژماری شاراوەی بۆ خزمەتی ئادەمیزاد لەم بوونەوەرەدا داناوەو وورده وورده پێش کەشیان دەکات، بەپێی ئاست و زەمان و شوێن و باری گوزەران بیرو ئەندێشەو زانست و زانیارییان.

کە ئەمڕۆ بۆتە پێداویستیەکی زروری ژیان و خۆشیەکانی، جا بۆ ئەوەی بتوانین سوودی تەواوی لێ وەربگرین و ئیجابیاتەکانی باشترو چاکتر بقۆزینەوە ئەمە لەلایێ، لەلایێ تر دور بین لە خالە سەلبیەکانی و گیرو گرفتەکانی و خەراپ بکار هێنانی پێویستە ڕەچاوی ئەم خالانە بکەین.

# هه‌ندێ له‌ ئادابه‌كانی به‌كار هێنانی مۆبایل

١- ئه‌و ڕاستیه‌ له‌به‌ر چاو بگرین كه‌ ئه‌م موبایله‌ نیعمه‌ت و ڕه‌حمه‌تی خودایه‌، بۆمانی ڕام و موسه‌خخه‌ر كردووه‌، له‌به‌رامبه‌ر یه‌وه‌ شوكرانه‌ی خوای گه‌وره‌ بكه‌ین، وه‌ به‌ شوكرانه‌ نیعمه‌ت زیاد ده‌بێ وه‌ك خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌رموێ (ابراهيم /٧) .

٢- هه‌ولده‌ین زیاده‌ خۆشه‌ویستی خوای گه‌وره‌ له‌به‌رامبه‌ر ئه‌و نیعمه‌ته‌ له‌دڵمان زیا بكه‌ین و ئاگامان له‌ ئامێره‌كه‌ بێ پیس نه‌بێ و لێمان نه‌كه‌وێ، خه‌راپ نه‌بێ، به‌قه‌ده‌ر توانا گرنگی پێ بده‌ین و بیپارێزین.

٣- له‌كاتی نوێژه‌كانا بیكوژێنینه‌وه‌، به‌تایبه‌تی گه‌ر نوێژه‌كه‌مان له‌مزگه‌وت و به‌جه‌ماعه‌ت بوو، بێدار بین تا نیوكات ژمێر پاش نوێژ ته‌له‌فۆن له‌گه‌ڵ دۆستان و براده‌ران نه‌كه‌ین، نه‌بادا له‌ناو نوێژ بن و خۆی و نوێژ خوێنان پێیوه‌ ناره‌حه‌ت و ئیزعاج بن[٥].

٤- ئه‌گه‌ر له‌ناو نوێژا له‌بیرمان كرد بوو بیكوژێنینه‌وه‌، ته‌له‌فۆنان بۆهات به‌خێرایی ده‌ستێكی بگه‌یه‌نێ و ده‌نگی ببڕین، پێش

[٥] حه‌مدو سه‌نا بۆ زاتی خودا ئێمه‌ وه‌ك ئیمام له‌مزگه‌وته‌كان پاش ئاگادار كردنه‌وه‌ی مه‌ئمومه‌كان به‌بیر هێنانه‌وه‌یان و به‌هه‌لواسینی تێبینی و ئاگاداری جۆراو جۆر بۆ كوژاندنه‌وه‌و بێ ده‌نگ كردنی ئامێری مۆبایل، توانیومانه‌ زاڵ ببین به‌سه‌ر ئه‌م گیرو گرفته‌، ته‌نها جارو بارێك نه‌بێ ده‌نگی مۆبایل نوێژه‌كانمان لێ ئاڵۆزده‌كات، ئه‌ویش یا مۆبایلی یه‌كێكی كۆڵه‌واره‌ نازانێ بكوژێنێته‌وه‌ یانیش ئی (مه‌ئمومی مه‌سبوقه‌) نوێژكاری دوا كه‌ووتی جه‌ماعه‌ته‌ له‌بیری چووه‌.

ئەوەی دەنگەكەی نوێژكارانی هەراسان بكا و نوێژیان لێ ئالۆز بكات.

٥- ئاوازو سروودێكی ئایینی بخەینە سەرو هەوڵ بدەین پێی وە بەرگی غەفلەتمان باشتر بدرێنێ و لای بەرێ، گەر لەناو ئاو دەستا لێی دا زۆر زوو بیكوژێنینەوە[٦] ، ئەگەر لەگەڵ خۆشمان نەیبەین ئەوە باشتریشە,

٦- گومانی باشمان هەبێ بۆ ئەو كەسەی تەلەفۆنمان بۆ دەكات، بەردەوام گەش بین بین نەك ڕەش بین بین، تاك و لەگەڵ لێدانی دەنگی مۆبایل دڵمان دانەخورپێ، تەفائول و ئومێدی باشمان بێ بەداهاتوو قەدەر

.

٧- بەوتەی جوان و شیرین و شیاو وەڵامی ئەو كەسانە بدەینەوە كە تەلەفۆنمان لەگەڵ دەكەن، كە گونجاو بێ لەگەڵ ئاستی تەلەفۆن و كارەكە.

٨- ئەگەر ئافرەتێ تەلەفۆنی بەهەڵە لەگەڵ كردین، یەكسەر بڵێین فەرموو دایە، بەڵێ خوشكی گەورەم، بەلێ كچی خۆم، پاشان زوو دایخەین، درێژە بەقسە كردن نەدەین، هەروەها بەنیسبەت ئافرەت باوەڵام بداتەوە برای گەورەم خاڵی بەڕێزم، ڕێ لەشەیتان بگیرێ لەگومانی خەراپ و ووتەی خەراپ بەهەموو شێوەیێ.

٩- ئامێری مۆبایلەكەمان نەخەینە بەردەستی منداڵان وهەرزەكاران تەلەفۆنی خەراپی پێ بكەن یا خەراپ و تێكی بدەن، سەرمان بهێشینن.

---

[٦] قسە كردن لەئاو دەست حەرامە، وەك لەئادابی دەست بە ئاو گەیاندن ڕوونمان كردووتەوە .

١٠- ژمارەی تەلەفۆنی خۆمان نەدەین بەهەموو کەسێ، بەتایبەتی ئەو کەسانەی کە پێویست ناکا، هەروەها ئامێرەکە نەدەینە دەست کەسانێ کە لێیان ئەمین و دڵنیا نین.

١١- هەوڵدەین لەکاتی پشووی دوای نیوەڕۆ یا درەنگی شەو تەلەفۆن نەکەین و خەڵکی هەراسان نەکەین، مەگەر بۆکاری زۆر پێویست نەبێ.

١٢- ئەگەر ژمارەی تەلەفۆنێ لەسەر مۆبایلی خێزانەکەمان یاکچەکانمان هەبوو، ژمارەکە نەناسراو بوو، نابێ یەکسەر گومانی خراپ ببەین و بەپێی گومانە خراپەکە ڕەفتار بکەین.

١٣- ئەو ڕاستیە هەردەم لەبیرمان بێ کە خوای گەورە بیسەری دەنگمانەو بینەری کارمانە چاودێری گیانمانە نووسەرو ئیستینساخی کارو کردەوەو وتارو نیەتمانە .

١٤- ژمارەی تەلەفۆنە پێویستەکانت لەلابێ، وەك و نەخۆشخانەو لیژنەی فتواو ئاسایش و بنکەی پۆلیس و ئاگر کوژێنەوەو قوتابخانەی منداڵەکانت و ...هتد، بۆ ئەوەی لەکاتی پێویست بتوانی پەیوەندیان پێوەبکەی.

١٥- ژمارەی مۆبایلەکانی دۆست و خۆشەویستان و پێویستیەکان لەدەفتەرێ تۆمار بکە، بۆ ئەوەی کاتێ ئامێرەکەت تێك چوو، یا فایرۆز لێی داو فۆرماتت کردەوە یا بزر بوو بەجۆرێ لەجۆرەکان، باماتل نەمێنیتەوە بۆ ژمارەی مۆبایلەکان.

١٦- هەو ڵبدەین شتی چاك لەمۆبایلەکە تۆمار بکەین، وەك

قورئان و وتاری چاك و وێنەی باش و شتی بەسوود نەك پێچەوانەیان .

١٧- ئاگادار بین قسەی زۆر و زیاد بەئامێری مۆبایل نەكەین، چونكە دەبێتە مایەی ئیسراف، خوای گەورە ئادەمیزادی موسریفی خۆش ناوێ، بەڵكو بەقەد پێویست قسەی پێ بكەین و بەس.

١٨- هەولدەین كە بەئامێری موبایل قسە دەكەین لەناو كۆڕو كۆمەڵ و ئاوەدانی و ناو مزگەوت دەنگ بەرز نەكەینەوەو خەڵكان هەراسان نەكەین بۆ بەرژەوەندی تاكی خۆمان، بەڵكو بەقەد پێویست دور كەوینەوە لەخەلكان و مەجلیس ئەوسا ئازادانە تر دەتوانین قسە بكەین.

١٩- ئاگادارین لەكاتی لێخوڕینی ئۆتۆمبیل بەمۆبایل قسەنەكەین، بەتایبەتی لەقەلەبالغی و لەخەتی خێرادا.

٢٠- گومانمان باش بێ ئەگەر مۆبایلەكەیان هەڵنەگرت و لەسەریان كوژاندینەوە، جابا یەكسەر بۆی نەكەینەوە لای كەمی چارەكێ كات ژمێر بوەستین، ئەوسا پاشان بۆی لێبدەینەوە، بەتایبەتی ئەگەر كارەكە پێویست بوو، چونكە لەوانەیە ئەوەی تەلەفۆنی بۆ دەكرێ لەكات و وەزعێكی نائاسایی بێ.

٢١- كاتێ كە كارێمان لەدائیرەی میری هەبوو، مۆبایلەكەمان لەپرسگا دابنێین، باكەرمەندانی دائیرەكان ئیزعاج نەكەین، ئەگەرنا لایەنی كەم بیكوژێنینەوە تاكو دێینە دەرەوە، هەروەها لەتازیە و كۆڕو كۆبوونەوەكان وا دەخوازێ.

٢٢- ئەگەر بسوڕێ و دەربینێ مۆبایل بۆ ماڵەوەش بكڕەو لەكاتی پێویست ئاگاداریان كەیەوە بەكارەكانت و گومانی باشیان پێ ببەو دڵیان

بەهیچ شێوەیێ لێ ئالۆز نەکەی!! بەردەوام کراوەو بەوەفا و بەڕەحم و بەزەیی بە، چیت بۆ خۆت پێ خۆشە، ئاواشت بۆ وان پێ خۆش بێ.

٢٣- هەوڵبدە خۆت و موبایلەکەت لەخزمەت دینی خوابن، ڕەحمەت بن بۆ عیبادو بیلاد، بەمانای ئەحوال پرسینی دۆست و خۆشەویستان و بەجێ گەیاندنی سیلەی ڕەحم و ناردنی نامەی جوان و ئامۆژگاری کورتی پڕ سوود و پرسینی ئەحوالی نەخۆشان و دل دانەوەیان بەتایبەتی خزم و دۆستانی غەریبی و دوورە وولات، کە بەڕاستی زۆریان کەیف پێ دێ و خێرێکی گەورەیە بەتایبەتی تریش گەر خواو مردن و ڕاستی و پیرۆزیان بیر خەیتەوە، تا دەکرێ لەم خێرانە ڕەزیلی و کەم تەرخەمی مەکە.

ئومێدەوارین ئەم خاڵانە یاد خەرەوەی ئەو خاڵانەش بێ، کە ئێمە بیرمان بۆی نەچووە، یا ڕۆژگارو داهاتوو پێویست یان دەکات، ئەوەی لای ئێمە گرینگ بێ، فراوان کردنی ئاسۆی بیری خوێنەرەو بیر خستنەوەی ڕاستیەکان و پێدایستیەکانیەتی.

## په‌راوێزی زنجیره‌ی یه‌كه‌م

١-جگه‌ره‌ش مایه‌ی بۆن ناخۆشی و خه‌ڵك ئه‌زیه‌ت دانه،چونكه بۆنه‌كه‌ی له‌بۆنی پیازو سیرو توور زیاتر بێ كه‌متر نیه به‌تایبه‌تی بۆ ئه‌وانه‌ی كه‌جگه‌ره ناكێشن، كه‌نووسیومانه فه‌رموویه‌تی ماناو واته زاراوه‌عه‌ره‌بییه‌كه‌مان كردووه به‌كوردی.

٢-ئیمانی نابێ:مامۆستایان ووتویانه واته ئیمانی ته‌واو نابێ (ریاض الصالحین ص١٢٨).

٣-فتح الباریو ج١٠ ص٣٦٣.

٤-ئاگاداری:بۆ ئه‌و مامۆستایانه‌ی ئه‌م نووسراوه‌یه، ده‌كه‌ن به‌پرۆگرام و به‌رنامه‌ی مزگه‌وتیان و ده‌رسی تازه به‌لاوان و منداڵان ده‌ڵێنه‌وه، جا ئامۆژگاریان بكه‌ن به‌شێوازێكی (زیاد له‌م نوسراوه‌یه) وا له‌گه‌ڵ ڕاده‌ی ژیری و باری ژیانی ڕۆژانه‌یان بگونجێ بۆ نمونه نابێ ئێمه له‌گه‌ڵ منداڵانی دراوسێ به‌شه‌ڕ بێین و جنێویان پێ بده‌ین یابه‌ردو شت بهاوێین بۆ ماڵیان، به دارلاستیك بێ یا به‌ده‌ست چونكه ده‌بێته مایه‌ی ناڕه‌حه‌تیان، له‌وانه‌یه به په‌نجه‌ره‌كانیان بكه‌وێ جا چی لێ دێ ؟ نابێ نابێ ...هتد . به‌ڵكو به‌پێچه‌وانه‌وه ده‌بێ خۆشمان بوێن و ڕێزیان لێ بگرین و چاودێری كه‌ل و په‌ل و ماڵیان بكه‌ین ده‌بێ ..ده‌بێ ...ده‌بێ ...هتد.

٥-احیاء ج٢ ص ١٩٤ فتح الباری ٣٦٦/١٠ تفسیر القرطبی١٨٨/٣.

٦-ئه‌وه‌ی ده‌یه‌وێ ئاگاداربێ له‌ماف و حقوقی جیران و دراوسێدا ئه‌م

كتێبانه بخوێنێته‌وه:-

١- احیاءعلوم الدین ج٢ ص١٩٣.

٢- التاج جامع للاصول ج٥ ص١٤-١٦.

٣- ریاض الصالحین ص ١٢٨-١٢٩.

٤- فتح الباری ج١٠ ص١٨٨.

٥- مسند الامام احمد ج٦ص٨.

٦- تفسیر القرطبی ج٣ ص١٨٨.

*شكوربۆ خوا له‌كوردستانی خۆمان له‌زۆر لاوه جیران له‌یه‌كا رازین و خاوه‌ن خاڵی زۆری ئیجابین له‌سایه‌ی ره‌حمی خودا به‌رنامه به‌پێزو پیرۆزه‌كه‌ی، ئێستا فه‌رهه‌نگ و كه‌لتوری رۆژ ئاوا هێرشی بۆ هێناوه ده‌یه‌وێ تێكی بدات!!

٧-له‌هه‌موو ئه‌و شوێنانه‌ی كه‌نوسیومانه پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی، مه‌به‌ستمان ماناو واتای زاراوه عه‌ره‌بیه‌كه‌یه، بۆیه عه‌ره‌بیه‌كه‌مان له‌زۆر شوێنا نه‌نوسیوه له‌به‌ر ئه‌وه‌ی نووسراوه‌كه زۆر گه‌وره ده‌بوو.

٨-متفق علیه:بزانه سه‌ره باسه‌كان له‌فه‌رمووده‌دا هاتووه ،كورته پێناسه‌كه‌ش من كردومه ریاض الصالحین ٢٨٥.

٩-زۆربه‌ی ئه‌م فه‌رموودانه‌م وه‌رگرتووه له ریاض الصالحین ل٢٨٥-٢٩٣ التاج جامع للاصول ل٢٤٤-٢٥١، جائه‌وه‌ی زاراوه‌كانی به‌زمانی عه‌ره‌بی ده‌وێ با سه‌یر بكات.

١٠- له‌ته‌فسیری ئایه‌تی ٤١ی المائده ده‌رم هێناوه .

١١- انشاء الله به‌درێژی له‌شوێنی خۆیا باسیان ده‌كه‌ین.

١٢- احیاء علوم الدین.

١٣- كەدەڵێن پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی مەبەستمان ماناكەی نوسیوە.

١٤- ریاض الصالحین ص٢٨٢/ وە كتێبی سبحانك اللهم.

١٥- التاج٥ص٢٥٣.

١٦- موسڵمان دەبێ زاناو هۆشیار بێ، هەموو كات بێداربێ، چونكە موسڵمان بوون بەكۆلەواریەتی و غەریب حاڵێتی ناكرێ ئەگەر زانیست یەكێ بەهەڵسانەوەی تۆ لەبەریا تووشی ڕووح گەورەیی و ڕیایی دێ ئەوكاتە نابێ لەبەری هەڵبستیەوە.

١٧-فەرمودەكانم هەمووی لە ریاض الصالحین و تاج ج٥ احیاء علوم الدین وەرگرتووە.

١٨-كۆلەواران لەپژمیندا دەڵێن صەبری هێنا، دەی ئەوە بووە دوو بووە سێ كەواتە ئەوكارەی مەكە زیانی تیایەو صەبرت بێ، جا لەڕاستیدا پژمین پەیوەندی بەم جۆرەكارانەوە نییە، بەڵكو پشوویێكی دڵە بۆ هاتنەوە سەر كاری نوێی بەو پژمینەوە خوای گەورە ئادەمیزادی نەجات دەداو شیفای دێنێ، بۆیە پێویستە سوپاس و حەمدی خوای لەسەر بكات كەبەسەلامەتی ڕزگار بووە هی واهەبووە لەگەڵ پژمین چاوی كوێرە بووە یا ملی ڕەق بووە بۆ ماوەیێ ..هتد.

١٩-باوەشك لەشەیتانەوەیە، بۆیە خوای گەورە خۆشی ناوێ، چونكە مایەی لەش گرانی و زۆر خواردنە و مەیل دەكا بەلای تەمبەڵی و خەوەوە، زیاد لەوەش شەیتانی مەلعون بەدەن و لەش خەزن دەكاتەوە، بەفیشەكەكانی شەهواتیەوە ، بۆیەش دەبێ موسڵمان خۆی لێ بپارێزێ بەهۆی ئەوەوە ئادەمیزاد لەشی لێ گران دەبێ لەعیبادەت و تاعەت، جاواباشە هەموو جار

وورگـــی لێ پـــڕ نـــەکات و زۆر خـــۆی بـــۆ باوەشـــی خـــەو نـــاوێ (ریـــاض الصالحین)ص٢٩٢.

٢٠-لەژمارە پژمیندا هاتووە پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ، دوعـای خێـر بۆئەوکەسەی دەپژمێ سێ جارگەربتـەوێ و ئەگـەر پـاش سـێ کـەڕەت پـژمێ ئەگـەر خواسـتت لەسـەر بـوو وازی لێبێنـە رواه ابـوداود و الترمـذی تـاج٥ ص٢٦٩(وە پیاوێ لەکاتی پێغەمبەرﷺ پژمی پێی ووت (یرحمك الله)پاشـان دیسان پژمی جا پێی ووت پیاوێکە هەلاّمەت و پەسـیوی لێیـە )رواه الخمـسە تاج٥ص٢٦٨.

٢١-بەڵێ درۆ لەچەند کات و شوێنێکدا دروستە، بەمەرجێ بۆخوا بـێ و بۆ ئیصلاحی ناو موسڵمانان بێ لەمانە:-

أ-بۆ سەرۆك و غەم خۆرانی ڕێگەی خودا، لەمەیـدانی سـەربازی و پـلان داناندا لەگەڵ دوژمنـان و هـەڵنان و تەشـجیع کردنیـان و پیـا هـەلگوتنیان، هەروەها لەمەجالی ڕامیـاری بەشـەرتی بەرژەوەنـدی و عیززەتـی موسـڵمانان تەواو بێ درۆ نەکردنی ببێتە هۆی زەرەرو زیان بۆ کۆمەڵگای موسڵمانان.

ب- هەروەها درۆ درووستە بۆیەکێ ئیصلاحی نێوان دووکـەس یادووگـەل یا دوو خێزان یا دوو تیرە و قەبیلـە دەکـات ، بەشـێوەیێکی ئـاوا کەئاشـتیان بکاتەوەو گیروگرفت لەنێوانیاندا نەهێڵێ، ئەمـە لێهـاتووی توانایـەکی باشـی دەوێ بیرفراوانی و دووربینەکی باشی دەوێ، نەبادا سەرەنجام خراپ تـر لـەپاش تربێ.

ج- هەروەها درۆ دروستە بۆ پیاو لەگەڵ خێزانەکەی بکات، بەمەبەسـتی زیـادە خۆشەویـستی لـەنێوانیان و چەسـپاندنی خێـزان داریـان، نـەك خـۆبێ

حورمەت كردن و كەوتنە ناو درۆو نوكتە بازیەكی بیٚ سنوور، هەروەها ئافرەت لەگــەلٚ میٚردەكــەیا بەهــەمان مەبەســت و نیــاز بــۆی دروســتە، درۆ لەگــەلٚ میٚردەكەیا بكات .

هەروەها ئیمــامی غــەزالی فــەتوای داوە بــۆ درۆكــردن لەگــەلٚ منــدالٚ، لەریٚگەی فیٚركردن و خویٚندنیا تا باشترو چاكتر بخــویٚنیٚ و رۆلٚەیــەكی هۆشــیارو زانای لیٚ دروست بیٚ، بەلاٚم لەبوارەكانی تــر دروســت نیــە درۆ لەگــەلٚ منــدالٚ بكەی، چونكە فیٚرە درۆ دەبیٚ و سیقەو باوەری نامیٚنیٚ ولەلای خــوای گــەورە بەدرۆت لەسەر دەنوسریٚ.

٢٢-پیٚغەمبــەر ﷺ لــە خــەونیٚكا چارەنووســی درۆزنــی دیبــوو لەجەهەننــدەما كەلــەلیٚویان دەبریــوە تــاملی، هــەرجاریٚ لیٚــی دەبــراوە بــۆی دەهاتەوە هەرئەوهای لیٚ دەكراوە، لەبەر ئــەوەی جــاری واهــەبوو ئــەو درۆزنــە لەبەیانییەوە لەمالٚەوە درۆی وای كردووە گەیشتۆتە ئافاق و ئاسۆیەكان (ریاض الصالحین) ل٤٤١.

٢٣-بۆئاگاداری غەیبەت لەچەند شویٚنیٚ دروســتە بەنیــەتی بەرژەوەنــدی موسلٚمانان و ئیصلاح و چاكەكاری ئەم شویٚنانە شەش شویٚنن:-

أ- لەزولٚم كردنا : ئەگەر یەكیٚ زولٚمی لیٚ بكریٚ و وەبچیٚتە لای قازی یــا سولٚتان یا هەردەسەلاٚت داریٚكی خواپەرست بۆ سكالاٚكردن لەدەستی زالٚم وەكو بلٚیٚ فلاٚن كەس زولٚم، و ستەمیٚكی ئاوای لیٚ كردم .

ب- یارمەتی وەرگرتن بۆ لابردنی ناشەرعی و خراپەكاری و بۆ گیٚرانەوەی ئادەمیزادی فاسق و نادەر بۆ ژیٚرصەواب و رەحمەتی خــودا، وەك یــەكیٚ بلٚیٚتــە ئەو كەسەی كەرەجاو ئومیٚدی لیٚ دەكریٚ بۆ لابردنی بیٚ دینی فلاٚن كــەس ئــاوا

دەكا جائاگاداری بكە، قەصدو مەبەستی خزمەت كردنی دینی خوابێ و لابردنی بێ شەرعی و مونكەر بێ ئەگەر قەصدو نیەتی ئەوە نەبێ ئەوا حەرامە بەنیەتێكی تر باسی بكات، وەك ڕقی لێبێتەوە یا كەیفی پێ نەیێت یا قەصدی تری هەبێ ....هتد.

ج- هەروەها فتوا وەرگرتن، وەكو بڵێتە مامۆستایێ باوكم یابرام فلاَن كەسم ستەم و زوڵمی لێ كردم بەو شێوەیە، جا ڕێگاو چارەیەكم

پێ نیشان بدە بگەم بەحەق و مافی خۆم و ستەمەكەی لەسەرم لابەرم، ئابەم شێوەیێ بێ غەیبەت دروستە، بۆ پێداویستیەكی حەق و بەجێ، وەئەگەر نەفەرەكان ناویان دیار نەكرێ باشترە، وەك بڵێ ئەگەر زوڵم و ستەمێكی واهەبوو، دەبێ چاری چی بێ وەئەگەر دیاریش بكەی بەمەبەستی چارەڕێگەیێ هەر دروستە.

د-ئاگادار كردنەوەی موسڵمانان، ئەگەر یەكێ شەڕو زیانی موسڵمانانی هەبێ، پێویستە موسڵمانانی لێ ئاگادار بكەیتەوە و خەڵكی ئامۆژگاری بكەیت لەو ڕووەی كەزیان و زەرەری هەیە و بەس، نەك سنوور بەزێنی، بەڵكو ئەم جۆرە غەیبەتە واجبە باشتر وایە مشاوەرەبكات (ڕاوێژ بكات) بۆ چارەسەرێكی بەجێ و ڕاست و دروست جا ئەو زیان لەڕێگەی بیروباوەڕو بیدعەتەوەبێ یا لەڕووی فاحیشەو مونكەرەوە یا لەڕووی دەست درێژی خیانەتەوەبێ ...هتد. وەهەروەها ئەگەر ڕووەو خۆی هەوڵبدرێ و چاك بكرێ باشترە، ئەگەر ئیمكان ببێ.

ه- كابرای غەیبەت كراو كابرایەكی وابێ بەئاشكرا گوناه و فسوقی هەبێ، یا بیدعەو خورافیاتی بەئاشكراهەبێ، وەك یەكێ بەئاشكرا عارەق خۆر

بیّ یا ریبا خۆر بیّ وه‌خه‌ڵكان به‌ئاشكرا بزانن یا زوڵم و سته‌م بكات، یا بـه‌لای بیرو باوه‌ڕانی پوچه‌ڵ دابكه‌ویّ، جا پیّویسته باسـی بكـریّ بـه‌وه‌ی كـه لیّیـه‌وه ئاشكرایه حه‌رامه باسی عه‌یب و عاری تری بكریّ مه‌گه‌ر هۆیه‌كی وای هـه‌بیّ كه‌دروست بیّ باس كردنی، وه‌ك ئه‌و هۆیانه‌ی باس كراون.

و-پیّناسه‌و تـه‌عریفی كه‌سیّ مه‌شـهووره پیّیـه‌وه وه‌كـو له‌قـه‌بیّكی یـا نازناویّكی لیّ هاتبیّ، وه‌ك بلّیّین: عه‌لی بـۆر، حه‌سـه‌نه شـل، فه‌ریـده كـه‌ڕ ، موشیره كۆر، هـه‌روه‌ها... ئه‌گـه‌ر ئـه‌وناوه‌ی كـه‌وا بلاّوبۆتـه‌وه نـه‌وتریٖ پیّـی ناناسریّ ئه‌وه دروسته بووتریّ بۆ پیّناسه‌و ناسینی نه‌ك بۆ ئیهانه‌و ڕیسواكردنی ئه‌گه‌ر ده‌تواندریّ به‌جۆریّكی تر پیّناسـه بكـریّن ئـه‌وه باشـتره، بـه‌لاّم ئه‌گـه‌ر ئیمكان نه‌ئه‌بوو ئه‌وه دروسته

جا ئه‌م شه‌ش خاڵه زانایان ڕوونیان كردۆته‌وه وه‌له‌سه‌ریه‌وه كۆكن و ئه‌وه‌ی ده‌لیلی له‌سه‌ر ئه‌م شه‌ش خالاّنه ده‌ویّ ته‌ماشای (ریـاض الـصالحین) بكـات لـه ص٤٣٤-٤٣٦.

٢٤-ئه‌وه‌شمان له‌بیر نه‌چیّ غه‌یبه‌تی مردوو گوناه و تاوانه‌كه‌ی گـه‌وره‌تره له‌غه‌یبه‌تی زیندوو ،چونكه ئیحتمالی هه‌یه بچیّته‌وه لای زیندووه‌كه گـه‌ردنی خۆتی پیّ ئازاد بكه‌ی، به‌لاّم چی له‌گه‌ڵ مردووه‌كـه ده‌كـه‌یت ئـه‌وا له‌عالـه‌می به‌رزه‌خ خوا خوایه‌تی یه‌كیّ قه‌رداری ببیّ و باری خۆی پیّ ڕاست بكاته‌وه .

٢٥-ئه‌گه‌ر بیّت و هه‌ركه‌سه‌ی یا هه‌رتاكه‌ی كۆمه‌ڵ كات و وه‌ختی خـۆی به‌فیڕۆ نه‌چوویّنیّ بـه‌ڵكو بـه‌كارو ئیشیّكی وای خـه‌ریك بكـاو به‌سـه‌ر بـه‌ریّ كه‌سوودی خۆی و كۆمه‌ڵه‌كه‌ی هه‌بیّ و به‌گویّره‌ی تواناو جا ئه‌و كۆمه‌ڵه ده‌بـیّ چه‌ند زوو پیّش بكه‌ویّ و ده‌بیّ چه‌ند كامه‌ران بیّ؟!

٢٦-ئەگەر گریانەکەی بەناشوکری و ناڕەزایی دەربڕین بێ، بەلاّم ئەگەر لەبەر ڕەحم و بەزەیی بێ ئەوا چی تیا نیە.

٢٧-ئەگەر بەنیەتی بەخۆ موعجیب بوون و شانازی بەخۆکردنەوە ووتوویێتی و بەسووك تەماشاکردنی خەڵکەوە درکاندبێتی، بەلاّم ئەگەر بەناڕەحەتی دڵ و موتەئەسیرو ووتوویێتی چی تیانیە، وەك لەکیتابی تاج باسی دەکا.

٢٨-غەیبەتی مردوو خراپترو گوناه ترە لەغەیبەتی زیندووە لەبەر ئەوەی ئێشی پێ دەگا وەك زیندوو ، وە وەك زیندووش نیە بچیت گەردنی خۆتی پێ ئازاد بکەی هەروەها کەسی خۆشەویستی زیندووی ناڕەحەت دەبن پێی، وەك لە ترمذی ڕیوایەت کراوە :جنیو بەمردووان مەدەن زیندووان ئێشیان پێ دەگا.تاج٥ص٣٦.

٢٩-حەسوودی بریتیە لەتەمەنناکردن لەبەین چوونی ماڵ و سەروەت، یان نیعمەتێك کەخوا بەیەکێی داوە خۆزگەی بۆ بخوازێ، بەلاّم ئەگەر حەسودییەکەی بۆ خوابێت بەوەی، ئەگەر حەزبکەیت بۆ خوا چۆن بەوی داوە ئاواش بەتۆ بدات بێ ئەوەی حەز بکەیت نیعمەتەکانی ئەو لەبەین بچێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ (حەسودی دروست نیە لەدووشتدا نەبێت، یەکێك خوای گەورە زانیاریەکی باشی پێ دابێت قورئانی پێ بخوێنێت بەشەوو ڕۆژ زانیاریەکەی بیبەخشێتەوە بۆ خوا و پیاوێك خوای گەورە ماڵێکی باشی دابیتێ ئەویش ببەخشێتەوە بەشەوو بەڕۆژ لەپێناو خوا)متفق علیه. جا ئەگەر ئادەمیزاد حەزی کرد ئەویش زانیاریەکی باشی بێ یا ماڵێکی باشی بێ لە پێناو خودا بیبەخشێ، ڕازی بوونی خودای گەورە بۆ خۆی پێ بەدەست بێنێت،

# پێڕست


| لاپەڕە | بابەت |
|---|---|
| ٥ | زنجیرەی یەکەم |
| ٨ | ئادابی مزگەوت |
| ٢٢ | ئادابی دراوسێ و جیران |
| ٣٦ | ئادابی سەلام کردن |
| ٥١ | ئادابی مەجلیس |
| ٨٧ | برایەتی |
| ٩٣ | زنجیرەی دووەم |
| ٩٥ | خۆشەویستی |
| ١٠٩ | دۆستایەتی و برادەرایەتی |
| ١٢٥ | گوێ ڕایەڵی |
| ١٣٧ | لەگەڵ گیانی ئاییندا |
| ١٤٤ | حەرام |
| ١٥٧ | خۆشەویستی دونیا بەسەر قیامەت سەرچاوەی خوو ڕەووشتە ناشیرینەکان ونەخۆشیە دەروونیەکانە |
| ١٥٧ | بەشی یەکەم |
| ١٦٣ | بەشی دووەم |
| ١٦٨ | بەشی سێیەم |

| | |
|---|---|
| بەشی چوارەم | ١٧٣ |
| زەنجیرەی سێیەم | ١٨١ |
| بێداربوونەوەو لەخەو هەلسان | ١٨٣ |
| ئادابی دەست نوێژ | ١٩٣ |
| ئادابی نوێژ | ١٩٩ |
| ئادابی نان خواردن | ٢١١ |
| ئادابی ئاو خواردنەوە | ٢١٨ |
| ئادابی جل و بەرگ و پۆشاك | ٢٢٢ |
| ئادابی قسەکردن(الکلام) | ٢٣٠ |
| ئادابی ناوماڵ | ٢٤٠ |
| ئادابی ڕۆڵە لەگەڵ دایك و باوکیدا | ٢٤٤ |
| داب و نەریت لەگەل براو خوشکدا | ٢٤٨ |
| داب و نەریتی ڕێگاوبان : | ٢٥٢ |
| داب و نەریتی خوێندن و خوێندنگا | ٢٥٣ |
| هەندیٚ لەداب و نەریتی کەسایەتی(الشخصیە) | ٢٦٤ |
| داب و نەریتی نوستن و خەو | ٢٦٩ |
| ئادابی بەکار هێنانی مۆبایل | ٢٧٥ |
| پەڕاوێزەکان | ٢٨٤ |
| سەرچاوەکان | ٢٩٣ |
| پێرست | ٢٩٤ |